# توركیا

# نەبەرد لەپێناوی مانەوەدا




فەرۆز ئەحمەد
مستەفا ئیبراهیم
عەباس خۆشناو
ئارام عەلی عەزیز
ئەیوب ئەمیر کەواسمی
جەنگیز چاندار
د. ئەحمەد نوری نعێمی
یاسەمین دۆبرامانچۆ
سەلامی سەزگین
د. خەلیل عەلی مراد
ئیدریس بووانو

سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان

# تورکیا
# نەبەرد لەپێناوی مانەوەدا


فەرڕز ئەحمەد
مستەفا ئیبراهیم
عەباس خۆشناو
ئارام عەلی عەزیز
ئەیوب ئەمیڕ کەواسمی
جەنگیز چاندار
د. ئەحمەد نوری نعێمی
یاسەمین دژبرامانچۆ
سەلامی سەزگین
د. خەلیل عەلی مراد
ئیدریس بووانو



سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان
سلێمانی ۲۰۰٦

## سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان

دەزگایەکی کەلتورییە لەساڵی ١٩٩٢دا دامەزراوە، ئامانجەکەی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی زانستییە لەبوارەکانی ئاسایشی نەتەوەییو سیاسەتی نێو دەوڵەتانو ئابوریو مەسەلە ستراتیجییەکانو مەبەستی بەدەست هێنانی قازانجی ماددی نیە.

هەمو ئەو لێکۆڵینەوانەی کەسەنتەر دەریاندەکا، گوزارشت لەڕاو بۆچونی خاوەنەکانیان دەکەنو بەپێی پێویست گوزارشت لەڕاو بۆچونی سەنتەر ناکەن.

وەرگێڕەکان

خەلیل بەکر مەحمود — کەمال ڕەشید شەریف

ئەبو بەکر خۆشناو — نەجدەت عەبدولکەریم

فەیسەل محەمەد عەزیز — شوان پێنجوێنی

ئازاد میرخان


- فەرۆز ئەحمەدو چەند نوسەرێکی تر.
- تورکیا نەبەرد لەپێناوی مانەوەدا.
- بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان.
- سلێمانی ٢٠٠٦.
- ژمارەی سپاردن (٢١)ی ساڵی ٢٠٠٦.
- ژمارەی سپاردن بەکتێبخانەی سەنتەر: ٥/٣٨/٦.

# پێشەکی

هەموو ئەو لێکۆڵینەوانەی لەدوتوێی ئەم کتێبەدا کۆکراونەتـــەوە، جگە لەوەی کە لەکاروبارو مەسەلەکانی تایبەت بەتورکیا دەدوێن، دو خەسڵەتی تریان هەیە. یەکەمیان ئەوەیە کەهەر هەمویان لەکاتی جیا جیادا لەگۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی‌دا بڵاو کراونەتـــەوەو دووەمیشیان ئەوەیە کەئەم لێکۆڵینەوانـە بەشـێکیان لـەزمانی تـرەوە وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی کوردی‌و بەشێکیان لەلایەن لێکۆڵیـــارانی کوردەوە نوسراون. لەریزبەندیی لێکۆڵینـــەوەکاندا هـەوڵ دراوە بـەپێی دابەشبونیان بەسەر بەشەکاندا بڵاو بکرێنەوە.

ئەم کتێبـــە لەزۆربـەی ئـەو کێشـە خۆماڵییانـە دەکۆڵێتـەوە کـە بەرۆکی تورکیایان گرتوە. ئەرکی ئەم کتێبە یارمەتیدانی خوێنەرە بـۆ سەردەرکردن لەو کێشانەو تێگەیشتنی بارودۆخی ناوخۆی تورکیا.

لەم پێشـــەکی‌یە کورتـــەدا، بـۆ پـەردە هـەڵماڵین لـەڕوی هۆکـانی گرنگیدان بەتورکیا، بەپێویستی دەزانین بڕگەیەك لەسەروتاری ژمارەی ١ی گۆڤاری ((دۆسیێی تورکیا)) بخەینە بـەرچاو کەگۆڤارێکـە یەکـەم ژمارەی لەمایسی ساڵی ٢٠٠٥دا دەرچووە. بڕگەکە دەڵێ:

((لەجەنگی یەکەمی جیهاندا هاوپەیمانی‌ی کوردو عوسمانییـــەکان لەدژی روســیای قەیســەری‌و بریتانیـا بەشکســت گەیشــت. شکســتی عوسمانییـەکان لەجـەنگی یەکـەمی جیـهاندا ئاسـەواری کاریگـەری لەسەر کورد بەجێ هێشـــت لەوانـە لکـاندنی بەشـێکی کوردسـتانی عوسمانی بەدەوڵەتی تازە پێکهێنراوی عیراقەوە.

بەم پێیە، کێشەی ویلایەتی موسڵ یەکێکە لەپاشماوەکانی دەوڵەتی عوسمـانی. هـەروەها کێشـەی تورکمـان کەعوسمانییـەکان لەســـەدەی شانزەهەمدا لەسەردەمی سوڵتان یـاوز سـەلیم‌و سـولەیمانی قـانونی‌دا

لەهەندێ ناوچەی کوردستاندا نیشتەجێیان کردن، تا ئەمڕۆ ئاسەواری لەسەر دۆزی کوردی عیراق ماوە.

لەساڵی ١٩٢٣وە کاتێك تورکیا پەیمانی لۆزانی مۆرکرد تا ساڵی ١٩٩١ کاتێك بڕیاری لابردنی قەدەغەی بەکارهێنانی زمانی کوردی دەرچوو، پەیوەندیی نێوان کوردو تورکیا روخسارێکی گرژی پێوە دیارە. بەڵام لە ١٩٩١ بەدواوە قۆناغێکی تازە لەبەردەم پەیوەندیی نێوان کوردو تورکیا بەڕەنجی تورگوت ئۆزال لەتورکیاو جەلال تاڵەبانی لەکوردستانی عیراق دەستی پێکرد.

تورکیا نزیکەی ١٠-١٥ ملیۆن کوردی لێ دەژی. ئەمەش کارێکی وا دەکا ئەم وڵاتە هەمیشە جێی سەرنجی کوردی عیراق بێ. هەر ئاڵوگۆڕێکی سیاسی کەپەیوەندیی بەکوردی عیراقەوە هەیە، کاریگەری لەسەر کوردی تورکیا بەجێ دێڵێ‌و لەبەرامبەریشدا هەر ئاڵوگۆڕێکی سیاسی کەپەیوەندیی بەکوردی تورکیاوە هەیە، کاریگەریی لەسەر کوردی عیراق هەیە. ئەمەش بەو مانایە دێ کەکوردی عیراق ناتوانن خۆیان لەئاڵوگۆڕەکانی کوردستانی تورکیا دابڕن.

تورکیا لەناوچەکەدا دەوڵەتێکی گرنگەو هەموو ئەو ئاڵوگۆڕانەی لەتورکیا رو دەدەن کار دەکەنە سەر جوڵانەوەی سیاسیی کوردی عیراق. سەرکەوتنی کوردی عیراق لەبەدەستهێنانی شەریکایەتییەکی سیاسیی تەواو لەگەڵ عەرەبەکاندا، کورد دەخاتە نێو هاوکێشە سیاسییەکانی ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوەو ئەمەش پێویستییەکی زۆری بەوە دەبێ کەهەرێمی کوردستانی عیراق پەیوەندییەکانی خۆی لەهەموو رویەکەوە لەگەڵ دراوسێ گرنگەکاندا، لەوانە تورکیا، پتەوتر بکات)).

لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا هەوڵ دراوە تیشك بخرێتە سەر ئایدیۆلۆژیای کەمالیزم کەرۆڵێکی زۆر گەورەی لەدروست کردنی تورکیای پاش یەکەم جەنگی جیهان دیوە. لەبەشی دوەمدا

مەسەلەکانی دیموکراسیو سستەمی حزبایەتیو هەڵبژاردن تاوتویێ کراونو لەبەشی سێیەم لەیەکێ لەمەسەلە هەرە ئاڵۆزەکانی تورکیا کۆڵراوەتەوە کەرۆڵی سوپایە لەسیاسەتدا. بەشی سێیەمو چوارەمیش بۆ دو مەسەلەی هەستیاری ناوخۆی تورکیا تەرخان کراون، کەیەکێکیان مەسەلە دێرینەکەی کوردە کەهەر لەسەرەتای سەرهەڵدانی تورکیای تازەوە بەبێ چارەسەر ماوەتەوەو ئاسەواری زۆری لەسەر سیاسەتە ناوخۆییو دەرەکییەکانی تورکیا بەجێ هێشتوەو ئەوی تریان مەسەلەی چۆنێتیی ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان دینو دەوڵەتە لەدەوڵەتێکدا کەعیلمانیەتێکی توندڕەو باڵی بەسەردا کێشاوەو کاریگەریی خستۆتە سەر پەیوەندییە ناوخۆییو دەرەکییەکانی دەوڵەت.

جگە لەم پێنج بەشە، لەکۆتاییدا پاشکۆیەك بۆ زیاتر ڕونکردنەوەی هەندێ مەسەلە ئامادە کراوە.

بەهیوای سود لێ وەرگرتن.

سەنتەر

# ئابوریی سیاسیی کەمالیزم

فەرۆز ئەحمەد*

ساڵی ١٩٣١ بۆ یەکەم جار لەکۆنگرەی پارتی گەلی کۆماری تورکیا پەردە لەڕوی ئایدیۆلۆژیای کەمالیزم هەڵدرایەوەو بەپێی شەش پرنسیپەکەی نەتەوایەتی، کۆمارخوازی، گەل پەرستی، عیلمانیەت، دەستپێخستنی دەوڵەتو شۆڕشگێڕی، ئادگارەکانی دیاری کرا. ئەم شەش پرنسیپە لەوساوە قەدەری نەتەوەی تورك دادەڕێژنەوە.

سەرەتا ئەم پرنسیپانە کرانە بەشێکی پرۆگرامی حیزب، دواتر لەساڵی ١٩٣٧دا خرانە ناو دەستوری دەوڵەتەوەو لەئەنجامدا بونە پرنسیپی رەسمی. ئەگەرچی تەنها لەساڵی ١٩٣١دا کەمالیزم ئاشکرا کرا، بەڵام خودی کەمالیزم بەدرێژاییی دە ساڵی رابردوو و لەراستیشدا لەسەرەتای دەسپێکی خەباتی نیشتمانییەوە لە ١٩١٩دا، لەنەشونمادا بووەو بەردەوامیش خۆی لەگەڵ بەسەرهاتو دۆخەکاندا گونجاندووە. بەڵام ئەگەر لەم بوارەدا رەهەندەکانی ((عوسمانیزم)) و ((پان ئیسلامیزم)) و ((پان تورکیزم)) لەبەرچاو بگرین، دەبینین گەڕان بەشوێن ئایدیۆلۆژیادا زۆر لەمە کۆنترە. تێنو تاوی ئەو رەهەندانە چێوەدار بوو چونکە ئامانجەکانیان لەدۆزینەوەی ناسنامەیەك بۆ کۆمەڵی تورکی-ئیسلامی تێنەدەپەڕی، بۆیە مەبەستیان ئەوە نەبوە روخسارێکی ئایدیۆلۆژی بۆ گەشەکردنی دەوڵەتو تێکڕای کۆمەڵ بدۆزنەوە. بەڵام کەمالیزم، لەلایەکی دییەوە بەوە دانەکەوت کەناسنامەیەك

---

* ئوستادی مێژو لەزانکۆی ماساشۆستس لەبۆستن (USA)

بەپێی چەمکی شۆڕشگێڕانەی نەتەوە گەلاڵە بکات بەڵکو پێنج پرنسیپەکەی تری کردە بەردی بناغەی ئەو رژێمو کۆمەڵە تازەیەی کە خەریکی پێکهێنانیان بوو.

سەرەڕای مۆرکە رەسەنەکەی کەمالیزم، بیرو بنچینە کۆمەڵایەتی‌یەکانی، پێشینەی خۆیان هەبوە، چونکە ئەگەر دان بەوەدا نەنێین کەسەردەمی ((لاوانی تورك)) ((١٩٠٨-١٩١٨)) دەستی لەگەڵاڵەکردنی ئەو ئایدیۆلۆژیایەدا هەبوە، کارێکی نامێژویی دەکەین. ئەوەش بەڵگەیە کە لەو سەردەمەدا هەندێ لەبیرو بۆچونەکانی مستەفا کەمال بۆ یەکەمین جار خرانە بەرچاوو گفتوگۆشیان لەسەر کرا. دەبێ ئەوەش لەیادی خۆمان نەبەینەوە کە لەماوەی ئەو دە ساڵەدا کەئیمپراتۆریەتی عوسمانی تێیدا گۆڕانێکی خێراو فرە ریشەیی‌ی بەخۆوە بینی، کەمال پاشا نەخشێکی چالاکی هەبوە، ئەو لەمشتومڕەکانی ئەو ماوەیەدا بەشدار بوو. بێ‌لەوە، هەندێ لەدیارترین روناکبیرانو تیۆرسینە ئایدیۆلۆژیەکان-کەگرنگترین دوو کەسیان زیا جوکالبو یوسف ئاکسورا بوو-دواتر چونە ریزی جوڵانەوەی کەمالیستی‌و بەشداری‌یان لەپەرەپێدانی ئایدیۆلۆژیاکەیدا کرد[١].

رەنگە پرۆسەی وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی لەسەردەمی لاوانی توركدا لەبۆچونەکان گرنگتر بوبێ. مەسەلەکە تەنها لەوەدا نەبو کە چینی دەسەڵاتداری کۆنی سەرایو بابی عالی بەشێکی زۆری دەسەڵاتەکەی لەدەست داوە، بەڵکو لەوەدا بو کەلایەنگرانی لاوانی تورك کەوتبونە خۆ بۆ داهێنانی ژێرخانێکی کۆمەڵایەتی‌ی نوێ بۆ رژێمی سیاسی تورك. ئیتر مۆدێرنیزەو بەرۆژئاواکردن لەوە تێپەڕین کەتەنها جێ‌بەجێ‌کردنی هەندێ ریفۆرم بن لەدامودەزگاکانداو کەوتنە خۆ بۆ دامەزراندنی سەرمایەداری بەهەمو

---

[١] بەپێی، Yabuk Kadri Karaosmanoglu: Ataturk, Istanbul 64 کەمالیزم بەتەواوی شتێکی رەستەن بوەو پێی وا نیە ئەو دو موفەککیرەی ناویان دێنێ کاریگەری‌یان لەسەر ئەتاتورك بەجێ هێشتبێ.

نادگارو سیماکانی کۆمەڵی سەرمایەداریەوە. ئەمەش بەو مانایـــە دەهـات کەدەبێ چینێـــك-واتـە چینـی بـورژوازی-بـۆ پایـەدارکردنی سـەرمایەداری بخولقێنرێ چونکە بەبێ خولقاندنی ئەو چینە دەردی یوسف ئاکسوار گوتەنی، ((کۆمەڵی جوتیارانو کارمەندانی تورك هەلێکی کزو خەفەی بۆ ژیـــان بـۆ هەڵدەکەوێ))[٢]. لەکۆتایی‌ی جەنگدا، ئـەم جـۆرە چینـە سـاوایەو توێژێکـی تازەی بچوکی کشـتیارانی سـەرمایەدار سـەریان دەرهێنـا. ئـەم دوو گروپـە سەروەتو سامانێکی زۆریان لەکاتی جەنگدا پێکەوە نـابوو. ئەمـەش زادەی هاندانو دەست لەپشت دانی حکومەتی لاوانی تورك بوو. لەسۆنگەی ئەمەوە ئەم دوو گروپە لەوە دڵنیا بـوون کـەدەتوانن لەمـەودوا نەخشـێکی سیاسـی بگێڕن. لەئەنجامدا، کاتێك خەباتی نەتەوەیی لەساڵی ١٩١٩دا کەوتە گــەڕ، کۆمەڵی تورك لەوەدا نەبو کەتەنها لەجوتیارو کارمەند پێك بێ، ئەگـەرچی ئەم دوو گروپە تا ئەو کاتە بەژمارە گەورەترین گروپی کۆمەڵ بوون. تەنانەت رۆژنامەوان فالح رفقی ئاتای کەیەکێ بوو لەوانەی بەناوی کەمالیسـتەکانەوە دەدوا، لەساڵی ١٩٢٢دا هەقی بوو بپرسێ ((بورژوازی؟ من دەپرسم: کوا ئەم چینە لەتورکیا؟))[٣].

بەڵام لێکۆڵینەوە لەمەسـەلەی ئـابوری‌ی سیاسـی‌ی تـورك نـابێ تەنـها ژمـارەو ئامـار بگرێتـەوە. ئـەوە راسـتە کـەچینی بازرگـان یـا پیشەسـازی نـاوخۆیی‌ی شایسـتەی ئامـاژە- چ سـەرمایەدار بـێ چ کارگـەر-بەئاسـتەم لەگۆڕێدا بوو. بەپێی راپۆرتـی پیشەسـازی‌ی سـاڵی ١٩١٥، لەسەرانسـەری تورکیا تەنها ٢٨٤ وەرشە هەبوە کەزیاتر لەپێنج هەزار کرێکار کاریان تێـدا

---

[٢] بڕوانە:
Turk Yurdu, no. 14 12Aug. 1333 1917, quoted in Niyazi Berkes, The Development of Secularism in Turkey, Montreal, Mc Gill University press, 1964, 426.

[3] F. R. Atay: Eski Saat, Istanbul, 1933, quoted by Taner Timur: Turk Devrimi ve Sonrasi 1919-1946, Ankara, 1971, 21.

کردوه، لەوانە ١٤٨ وەرشــە لەئەســتەمبولّ، ٦٢ لــەئیزمیرو ٧٤ لــەرۆژئاوای ئەناتۆلیا. خاوەنی لەسەدا ٨٥ی دەسمایەی ئــەو پرۆژانــە یــا یۆنــانی بــون یــا ئەرمــەن یــا بێگانــە[٤]. لەســالّانی ١٩١٥-١٩١٨دا ئــەم بــارە بــەرەو باشــی هەنگاوی نا بەلاّم نەك بەو ئەندازەیەی کەوەرچــەرخانێکی ریشــەیی بەدەســت بێنیّ یا هــەنگاوی گــەورە بــەرەو بــەدی هێنــانی کۆمــەلّێکی پیشەســازیی بورژوازی هەلّێنیّ. لەگەلّ ئەوەشدا، لەڕوی سایکۆلۆژییەوە بارودۆخ لــەکاتی جەنگدا گۆڕانی بەسەرداهات[٥]. کاربەدەستانی دەســەلاّتداری تورکیــا پــەییان بەو راستییە برد کەبەبیّ رێکخستنەوەی ژیانی کۆمەلاّیەتیو ئابوری، ژیــانی سیاســیو کــەلتوریی ئــەناتۆلیا تــازە ناکرێتــەوەو رەزامــەندیی ئــەوروپاش بەدەست ناهێنریّ. یەکەم هەنگاوی ئەم رەهەندە نەهێشتنی ئیمتیازاتی بیانی بوو لەئەیلولی ١٩١٤دا. ئەم کارە، لەرەوتی شتەکانی تردا، دەرفەتی بۆ تورك پێکهێنا تاریفەی گومرگــیی ســەر کــالاّی هــاوردە زیــاد بکــەن، بــەجۆرێك کەهەلێك بۆ پاراستنو پەرەپێدانی بازرگانیو پیشەسازیی نــاوخۆ پێــك بــیّ. بازرگانیی ئازاد نەك هەر تەگــەرەی لەگەشــەکردنی پیشەســازیی نــاوخۆیی دەدا بەلّکو کارێکی واشی دەکــرد بەشــێکی بچوکــی کۆمــەلّی بازرگانــان، کەزۆربــەی هــەرە زۆریــان ناموســلّمان بــون، زیــاتر لەرێگــەی بازرگــانیی هەندەرانەوە قازانج بکەن نــەك لەرێگــەی پــەرەپێدانی بــازاڕو پیشەســازیی ناوخۆییەوە. کەمالیســـتەکان کــەجیّی رژێمــی لاوانــی تورکیــان گرتــەوە،

---

[٤] بڕوانە: Timur

[٥] بڕوانە:

Feroz Ahmed, ((Vanguard of a Nascent Bourgeoisie, the Social and Economic Policy of the Yung Turks 1908-1918)), in Osman Okyar and Halil Inalcik (eds): Social and Economic History of Turky (1071-1920), Ankara, 1980.

لەم سەروبەندەدا:

Yildiz Sertel, Turkiye, de ilerici akimlar, Istanbul, 1969, 17.

هەندیّ ژمارە دەربارەی هێزی کاری سالّی ١٩٢١ دەخاتــە بــەرچاو کــە لــەژمارەی ســالّی ١٩١٥ بەرەو ژورترن.

ڕەهەندە گەرمو گوڕەکانیان خێراتر کردو کارێکی وایان ئەنجامدا کەدەکرێ ناو بنرێ شۆڕشێکی بورژوازیی لەسەرەوە ڕا، یاخود بەواتایەکی‌تر، شۆڕشێکی بورژوازیی بەوەکالەت. زۆربەی جاریش ئەم کارە بەپێچەوانەی ویستو ئارەزوی چینە ساواکەوە بەڕێوە چووە، چونکە پێ‌دەچو چینە ساواکە ڕێگا ئاسانەکەی بەدڵ بوبێ. واتە هاوکاری کردن لەگەڵ بێگانەدا، نەك سیاسەتە نیشتمانی‌یەکەی کەمالیستەکان کەدەیانویست خۆبژێوی بۆ وڵات دابین بکەن. بەڵام ئەو چینە هێشتا ئەو هێزە پێویستەی نەبو کەبتوانێ کار بکاتە سەر سیاسەتی دەوڵەت کەبەپێی بەرژەوەندی‌یە سەربەخۆیە پایەدارەکان ئاراستە دەکرا.

ئەمە بەو مانایە نیە کە کەمالیستەکان هۆشیارانە کەوتبوونە خۆ بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش چونکە ئەم پرۆسەیە بەکردەوە لەسەر دەستی بزوتنەوەی لاوانی تورك دەستی پێ کردبوو. شالاوو کەفو کوڵی ئەم مەسەلەیەش کەمالیستەکانی لەگەڵ خۆیدا ڕامالی. ئەوە بەڵگەیە کەڕوخانی ئیمپراتۆریەتو داگیرکرانی زۆربەی بەشە گرنگەکانی ئەناتۆلیا لەلایەن بێگانەوە پرسیاری دەربارەی بونو نەبونی نەتەوەی تورکو دەوڵەتی تورك وروژاند. بەمجۆرە، لەهاوینی ١٩١٩دا بیر بۆ ئەوە دەچو کەرەنگە ئەناتۆلیاش بەهەمان چارەنوسی سوریای گەورە بگاتو بەسەر چەند دەوڵەتێکی بچوکدا دابەش بکرێ، بەو مەبەستەی کەرۆژئاوا بەئاسانی دەستیان بەسەردا بگرێ. لەناوخۆی وڵاتدا چەندین گروپی گەورە پیاوان هەبو کەبۆ دابین‌کردنی بەرژەوەندی‌یەکانیان خۆیان ڕێکخستبوو و پێ‌دەچو ئامادەش بوو بن، لەکاتی پێویستدا، سەودا لەگەڵ دەوڵەتێك یا چەند دەوڵەتێکی زلهێز بکەن، سەریان بۆ دانەوێننو ئەگەر پێویستیشی بکردایە ئامادەبون دەست لەهەندێ پارچەی دیکەی ئەناتۆلیا هەڵگرن. بۆ ئەوانە، بیری تێکۆشانی نەتەوەیی بایەخێکی ئەوتۆی نەبو، لەوانە ((کۆمەڵەکانی بەرگری لەماف)) کە لەتراکیاو ئزمیرو دواتر لەبەشەکانی تری ئەناتۆلیا دەسبەکار

بون[6]. لەپایتەختدا، سولّتانو دەوروبەرەکەی-کەدەیانتوانی کوانوی بەرگریی نیشتمانی پێك بێنن-خۆیان دایە دەست مەرحەمەتی هێزی هاوپەیمانان بەتایبەتی بەریتانیەی مەزنو بەنا بەدڵی بەهەمو شتێك رازی بون بەمەرجێك رێیان بدرێ لەسەر حوکم بمێنن. ئەوان هیچ فیکرەیەکیان دەربارەی نەتەوەو دەسبالاّیی‌ی نەتەوەیی‌و ئابوری‌ی نەتەوەیی نەبو. بەپێچەوانەوە، فیکرەی دەسبالاّیی‌ی نەتەوەیان بەفیکرەیەکی تێکدەرانە لەقەڵەم دەدا چونکە لەگەڵ بناغەی خودی دەسەلاّتەکەیان کەپشت ئەستور بوو بەنەریتی کۆنو بێزراو، نەدەگونجا. لەبەر ئەوە ئەستەمبوڵ بەشێوەیەکی نەگریسو دەمارگرژانە بەرهەڵستی‌ی جولاّنەوەی نەتەوەیی‌ی ئەناتۆلیای کرد. بەلاّم بەداگیرکرانی پایتەخت لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە لە ١٦ی مارتی ١٩٢٠دا، پوکانەوەی راستەقینەی دەوڵەتی عوسمانی دەستی پیّ‌کردو بەکردەوە کۆتایی بەمافی سولّتان ((وەك شوانی مێگەل))[7] هێنرا.

جێی خۆیەتی لەو گروپە کۆمەلاّیەتی‌یانە بکۆڵینەوە کەزۆر گەرمو گوڕ پشتیوانی‌یان لەسولّتان کرد یاخود خۆیان دورە پەرێز راگرتو چاوەڕێی داهاتوویان کردو دەیانویست بزانن ئاخۆ سولّتان دەسەلاّتی بەسەر بارە ناسکەکەدا دەشکێتەوە یان نا. وەك چاوەڕێ دەکرێ. ئەوانەی لەپشتیوانی کردنی سولّتاندا زۆر گەرمو گوڕ بون خەڵکانی نزیکی دەربارەی سولّتانو گەورە بیروکراتەکانی بابی عالی بون کە لەسەردەمی حوکمڕانی‌ی لاوانی تورکدا پشتگیری‌یان لەلیبرالەکانی پشتیوانی بریتانیا دەکرد. ئەگەر سولّتان

---

[6] دەربارەی ئەو کۆمەلاّنە بڕوانە:
T.Z. Tunyara: Turkiye, de Siyasi Partiler 1859-1952, Istanbul, 1952, 481.

[7] دەربارەی دەوری حکومەتەکانی ئەستەنبول لەو ماوەیەدا بڕوانە:
Sina Aksin, Istanbul Hukumetlri ve Milli Mucadele, Istanbul, 1976, 226.

دەربارەی خۆ بەشوان زانی‌ی سولّتانیش بڕوانە:
Sevket Sureyya Aydemir: Tek Adem, Mustafa Kemal (1919-1922), vol. 2. Istanbul, 1966, 226.

رێی بەبڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی نەتەوەیی دەربارەی سەرداریو نەخشی گەل بدایە، زۆرشتی لەبەردەستدا بوو کەدەکرا بیاندۆزێنی. پیاوانی بابی عالی وەك تەوفیق پاشاو عەلی کەمال بۆ هێشتنەوەی رژێمە کلاسیکی‌یەکە کەپاشایەکی بەدەستور کۆنترۆڵکراو حوکمی دەکاو دەسەڵاتی راستەقینەش بەدەست بیروکراتە گەورەکانەوە دەبێ، دەستیان لەگەڵ بریتانیە تێکەڵاو کردبوو. ئەم چەشنە فۆرمە بەمانای مل کەچکردنی سیاسیو ئابوری بۆ بریتانیە دەهات. ئەوانە، رێك وەك بورژوازای‌یەکان کەپێیان خۆش بوو لەسستمە ئابوری‌یەکەدا جێی کەمینە مەسیحی‌یەکان بگرنەوە، ئامادەبون ئەم فۆرمە قبوڵ بکەن. ئەم گروپە تورکانە بەباڵە لبرالەکانی ئەو کاتەی پارتی کۆنگرێسی هند دەشوبهێنرێ کەمانەوەی لەئیمپراتۆریەتی بریتانیە لەسەربەخۆیی‌ی تەواو پێباشتر بوو. ئەم گروپانە ئامادە بون ماندێتی بریتانیە پەسەند بکەن ئەگەر هاتنە کایەی دەوڵەتێکی تورکی-عوسمانی‌ی شیاوی ژیان مسۆگەر بکرێ. هەندێ گروپی تر پێیان وابوو ماندێتی ئەمریکا زیاتر بەکەڵکی تورکیا دێ. هەموو گروپەکانی سەر بەئیستانبول لەو بڕوایەدا بون کەپێش ئەوەی بتوانن هەستنەوە سەر پێ، تورکیا بۆ ماوەیەك پێویستی بەویسایەتی بیانی دەبێ.

تەنانەت کاتێك مستەفا کەمال پاشا دەستی بەپێکهێنانی بزتنەوەیەکی نەتەوەیی کرد، لەکۆنفرەنسی ئەیلولی ١٩١٩ی سیواس هەندێ لەلایەنگرەکانی بۆچۆنی وایان دەربڕی کەبۆنی پەسەندکردنی فیکرەی ماندێتی بیانیی لێ دەهات. لەلایەکەوە، ئەمە یەکێ لەنیشانەکانی ورە بەردان بوو، ورە بەردانێك کەزادەی نوشستی‌یەکانی ئیمپراتۆریەت بوو لەوەتەی ئەوروپا ئەو ئیمپراتۆریەتەی ناونابو ((پیاوە نەخۆشەکە))و مەسەلەی مردنی بوو بووە مەسەلەی کات. بێلەوە ئەم بۆچونە بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کەبورژوازی‌یەکانو خاوەندارەکانی کامپی نەتەوەیی وا تێگەیشتبوون کەئەگەر ئیمتیازاتی ئابوری بۆ هاوپەیمانەکان بسەلمێنرێ،

ڕەنگە ڕێ بدەن دەوڵەتێکی نەتەوەیی لەتورکیا دابمەزرێ. لەبەر ئەوە بەکیر سامی بەگی وەزیری هەندەرانی کەمالیست لەکۆنفرەنسی ساڵی ١٩٢١ی لەندەن تەنازولاتێکی ئابوریی زۆری بۆ دەوڵەتانی ئەوروپا سەلماند کەتێیدا ((ئەفزەلیەتی ئەنجامدانی پرۆژەکانی پەرەپێدانی ئابوری لەو ناوچانەی کەفەرەنسا لێیان کشاوەتەوەو لەهەرێمەکانی مامورتولازیر، دیاربەکرو سیواس بۆ فەرەنسی‌یەکان دەسەلمێنرێ، بێ لەسەلماندنی ئیمتیازەکانی کانزا سازیی ئەرجانی‌و هی‌تر ...)) [8].

لەم بارەیەوە ئیتالیا بەو مەرجەی کەناسیونالیستەکان مافی سود وەرگرتن لەناوچەکانی ئەنتالیا، یوردور، موگلا، ئەسپارتس، چەند بەشێکی ئەفیونکار، ئەهیسار، کوتاهیا، ئایدن‌و قۆنیەی بۆ بسەلمێنن، بەڵێنی‌دا کە لەکۆنفرەنسەکەدا پشتیوانی لەتورك بکا، ئەگەر داوای سەندنەوەی تراکیاو ئیزمیریان کرد. بەکیر سامی ئەوەندە جڵەوی شل کرد کەهەمو ئەو پرۆژانەی بۆ سەرمایەدارانی ئیتالیا هێشتەوە کەحکومەتی تورك یا سەرمایەی تورك لەخۆی ڕانەدەبینی بەئەنجامیان بگەیەنێ، بێ لەسپاردنی کانگاکانی خەڵوزی ئەرێجلی بەکۆمپانیایەکی تورکی-ئیتالی [9]. بەکیر سامی بڕوای تەواوی بەوە هەبو کەڕێککەوتننامەکانی کەئیمزای کردون لەگەڵ باڵاترین بەرژەوەندیی نەتەوەدا دەگونجێن، لەم بارەیەشەوە داوای لەئەنجومەنی نیشتمانی کرد پشتیوانی‌ی لی‌بکاو وتی ((لەکاتێکدا هێشتا دەرفەت هەیە، ڕەنگە سیاسەتێکی زیرەکانە وڵات لەو چاڵەی تێی کەوتوە بێنێتە دەرێ. ئەگەر ئەمە نەهاتە دی، کەس ناتوانێ خۆی لەلێپرسراوەتی‌ی نەتەوەو مێژوو بدزێتەوە ...)). ئەو وتی گوایە بەردەوامبونی خەباتی نەتەوەیی

---

[8] ((وتارێکی مستەفا کەمال ئەتاتورك-١٩٢٧))، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ئیستانبول، ١٩٦٣. ئەم چاپە پشتی بەو دەقە ئینگلیزی‌یە بەستوە کەساڵی ١٩٢٩ لەلایبزگ بڵاوکراوەتەوەو ئاسانتریش لەوەی پێشو لەبەر دەستدایە.

[9] هەمان.

((بەئەندازەیەك ولاتەكەمان ویرانو خاپور دەكا كەبونی خودی ولاتو خودی نەتەوەش دەخاتە مەترسییەوە)). ناوبراو ئامۆژگاریی كەمال پاشای كرد ئەم هەلە بقۆزیتەوەو ئاشتییەك بەو مەرجانەی ئەو وتوویژی لەسەر كردون، پیك بینیٚ چونكە ئەو بڕوایەكی وای پەیدا كردبوو كەهاوپەیمانەكان مەرجی لەمە باشتریان لەدەست نایە[10].

مستەفا كەمال بەكیر سامیی وەزیری هەندەرانی ئاوا وەسف كرد كە كابرایەكە ((لەلایەنگرانی ئاشتییە بەهەر نرخیك بیٚ)) چونكە ئەو مەرجانەی داوای كردبوو ئەنجومەنی نیشتمانی پەسەندیان بكات هەر ئەو مەرجانە بون ((كەهیزە ئەوروپاییەكان بەناوی ریككەوتنی سیٚ قۆڵییەوە گەیشتبونیٚو بەهۆیەوە ئەناتۆلیایان بەسەر سیٚ ناوچەی نفوزدا دابەش كردبوو)). كەمالیستەكان ئاوا دەیانڕوانییە ئەو مەرجانە كە بەهیچ جۆریٚ شیاوی پەسەندكردن نین چونكە لەگەڵ گەوهەری بیروباوەڕی بزوتنەوەی نەتەوەییدا ریكنەدەكەوتن. سەرەنجام، وەزیری هەندەران بەناچارییەوە دەستی لەكار كیشایەوە[11].

ئەوی راستی بیٚ چەندان توێژی گرنگی بورژوازیو زەویداران هەمان بیروبۆچونی بەكیر سامییان هەبو. لەدیدی ئەو توێژانەوە، خەباتی نەتەوەیی لەبنەڕەتدا خەباتە بۆ سەروەریی سیاسییو كۆنترۆڵ كردنی دەوڵەت. بەو پیودانگە سەروەریی ئابوری بایەخیكی ئەوتۆی نەبو چونكە ئەو توێژانە پییان وابو ملكەچكردنی ئابوری بۆ ئەوروپا قازانجیكی زۆریان بۆ مسۆگەر دەكا. ئومید بەوە دەهۆنرایەوە كەسەرمایە گوزاریی ئەوروپا پەرە بەژیرخانی بنچینەییی توركیا بداو كارگەكانیشی كالاّ بۆ بازاڕی توركیا دابین بكەن. بەرامبەر بەمە، توركیاش كالاّی كشتوكاڵیو كەرەستەی خاو بۆ دەرەوە دەنیریٚ. بەلاّم كەمالیستەكان سەروەریی سیاسییو سەروەریی ئابورییان لیك

---

[10] هەمان، ٥٠٠-٥٠١.
[11] هەمان، ٤٩٨.

جودا نەکردەوەو لەو بڕوایەدا بون کەهیچ کامێکیان بــەبێ ئــەوی تــر نــابێ. وەزیری ئابوری مەحمود عیززەت لەبەردەمی کۆنفرەنسی ئابوریی تورکیا ئاوا گوزارشتی لەم مەسەلەیە کرد کە وتــی: ((مــن وا لەســەروەریی نەتــەوەیی گەیشتوم کەســەروەرییەکی ئــابوریی نەتەوەییــە. ئەگــەر نــا، ســەروەریی نەتەوەیی لەتراویلکە بەولاوە هیچی دی نیە))[١٢].

لەسالآنی هەوەڵی بزوتنەوەی نەتەوایەتیدا، ســەرکردایەتیی کەمالیســت هەمو بەری خۆی دابوە مەسەلەی گۆڕینو وردتر گۆڕینی شۆڕشــگێرانە. زۆر بەچاکی هەست بەوە دەکرا کەتورك خەریکن ســەرەتایەکی نــوێ دەســت پــێ دەکەنو واز لەرابردوە عوسمانییە گەنیوەکە دێنن. ئەم رەهەندە لەگــەڵ دەورو تەئسیری نەریتی شۆڕشی فەرەنسا لەسەر ئەندێشــەی رادیکــالیزمی تورکیــا وێك دەهاتەوە. بــەمجۆرە، داگــیرکرانی ئیســتانبول لەلایــەن هاوپەیمانەکانــەوە لەمارتی ١٩٢٠، نەك هەر بەکۆتاییی راستەقینەی دەوڵەتی عوسمانی دانــرا بەڵکو وەك سەرەتای دەسپێکی چەرخێکی ئەویش ئاماژەی بۆ کــراو مســتەفا کەمال ئاوا گوزارشتی لێ کرد کە ((یەکەم ســاڵی نەتەوەییــە))[١٣]. ئەوســا پێشبینیی ئەوە دەکرا ئەم سەرەتا نوێیە ببێتە هەوێنی هاتنەکایەی دەوڵەتو کۆمەڵێکی نوێ. بۆ بەدی هێنانی ئەو وەرچەرخانــە، کەمالیســتەکان پــەییان بەوە برد کەپێویســـتە ((چەشــنێکی تــری مرۆڤــی تــورك، بەتــەواوی جیــا لەچەشنی ((عوسمانی))، پێــك بێنــن))[١٤]. ســەرەڕای ئــەم داشــکانە بــەلای

---

[12] A. Gunduz Okcun (comp. And ed.) Turkiye Iktisat Kongresi 1923-Izmir, Ankara. 1968, 259.

[١٣] مستەفا پاشا لەوتاری دەست پێکردنی خولی تازەی ئەنجومــەنی نیشــتمانیی مــەزندا لانی کەم سێجار ئەم گوزارەیەی بەکارهێناوە. بڕوانە:

Buyuk Milli Meclisini Acis Nutuklari, Istanbul, 1969, 105, 108, 113.

دیارە لێکچوانێك هەیە لەگەڵ روخانی پاشایەتی لەفەرەنسا لەساڵی ١٧٩٢دا.

[١٤] بڕوانە:

Vedat Nedim Tor: Kemalizmim Drami. Istanbul, 1980, 20.

گۆڕینی شۆڕشگێڕانەدا، یەکەم شت کەدەبوایە لەبەرچاوان بزر بێ، ئـابووریی سیاسیی رژێمی پێشوو بوو. ئـەم مەسـەلەیە زۆر بـەجوانی لەخوێندنـەوەی نوسینە نەتەوەیی‌یە هاوچەرخەکاندا دەردەکەوێ.

لەوتارێکدا کە کـەمال پاشا لـەمارتی ١٩٢٠دا لەبـەردەم ئەنجومـەنی نیشتمانیی گەورەدا خوێندی‌یەوە، ئاماژە بەوە کرا کەئابووریی تورك لەوەتەی بـەپێی سستمی ((تـەنزیمات)) (١٨٣٩-١٨٧٦) ئـازادیی بازرگـانیی سەلماندوە، نـەیتوانیوە خـۆی لەبـەردەم پێشـبڕکێی ئـەورووپا راگـرێ. ئـەوەی بارەکەی ناهەموارتر کردبو ئەوە بوو کە ((ریزە ئیمتیـازە ئابووری‌یـەکان))[١٥] زیانەکانی پێشبڕکێیان کاریگەرتر کردبوو. پـاش ئـەم قۆناغـە، سـەرمایەی بیـانی شـوێنێکی نائاسـاییی لەئیمپراتۆریـەتدا داگـیرکرد، بـەجۆرێك کەدەوڵەت و حکومەتی عوسمانیی کردە ((پاسـەوانی سـەرمایەی بیـانی)) و لێرە بەدواوە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ((کۆلۆنی‌یەکی بێگانـان)) هیچـی تر نەبو. کەمال پاشا پێی وابو تورکیا، وەك هەر نەتەوەیەکی نـوێ، نـاتوانێ بەدرێژەکێشانی ئەم بارە رازی بێ[١٦]. راستە تورکیا لەسەردەمێکی تردا دەژیـا بەڵام بارودۆخەکە لەچەند لایەنەوە بێ گۆڕان مایەوە. مستەفا کەمال پەنجەی بۆ ئەوە درێژکرد کە لەبریتانیە ملیۆنەها بێکار هـەن کـەکار دەکەنـە سـەر سیاسەتی بریتانیە بەرامبەر بەتورکیا. لەبەر ئەوە بریتانیـە بـۆ چـارەکردنی گـیروگرفتی بێکـاری کـەزادەی تـەنگژەی ئـابووریی گشـتیی سەرانسـەری ئەورووپای پاش بڕانەوەی جەنگ بوو[١٧]، هەوڵدەدا پشتیوانی لەبازاڕە کراوەکـان بکا. بۆیە پێویست بوو لەسەر تورکیا وریاو چاوکراوە بێ و پێ لەسەر مـافی سەپاندنی تاریفەی گومرگی داگرێ چونکە بەبێ تاریفـەی گومرگـی، هیـچ

---

[١٥] وتاری کەمال پاشا لەئەنجومەن لەیەکی مارتی ١٩٢٢دا. بڕوانە: Ozturk. 86

[١٦] وتاری کەمال پاشا لەکردنەوەی کۆنفرەنسی ئابووریی تورك لە ١٧ی شـوباتی ١٩٢٣دا. بڕوانە Okcun ٢٤٨و ٢٥٣.

[١٧] Ozturk هەمان ١٠٣.

پیشەسازی‌یەك پێكنایە. كەمالیستەكان بەوە لەلایەنگرە بورژوازی‌یەكانیان جیا دەكرانەوە كەبۆچونێكی دوربینیان بۆ توركیای تازە هەبوو، توركیایەك كەپیشەسازی یەكێ لەكۆڵەكە سەرەكی‌یەكانی پێكدێنێ. بورژوازی تەنگبینانە دەیڕوانی‌یە بارودۆخەكەو بەو قازانجە رازی بوو كەدەڵلاڵێتی‌ی بازرگانی‌ی ئابوری‌ی بن دەستی ئەوروپا بۆی دابین دەكرد.

بەجۆرە، كەمالیستەكان لەجەنگی سەربەخۆییدا دژی ئیمپریالیزم بون، نەك هەر لەبەر ئەوەی ویستویانە رێ لەپارچە پارچەكردنی ئەناتۆلیا بگرن بەڵكو لەبەر ئەوەش كەنەیانویستوە توركیای تازە وەك كۆلۆنی‌یەكی ئابوری‌ی رۆژئاوا بمێنێتەوە. هەندێ جار ئەم لایەنەی ململانێ رون نایەتە بەرچاو چونكە هەندێ لەرەخنەگرەكان لەهەڵوێستی ئانتی ئیمپریالیستی‌ی كەمالیزم بەگومانن‌و دەڵێن گوایە كەمالیستەكان لەكاتێكدا بەقسەو دروشم هێرشیان دەكردە سەر ئیمپریالیزم، بەكردەوە هەمو ئیمتیازێكیان بۆ سەرمایەی بیانی دەسەلماند. ئەم جۆرە رەخنەگرانە چاوپۆشی لەخاڵێكی گرنگی ئابوری‌ی سیاسی‌ی كەمالیزم دەكەن، ئەویش ئەوەیە كەئەو ئابوری‌یە ئابوری‌یەكی سەرمایەدار بوە بەڵام لەهەمان كاتدا دژی ئیمپریالزمیش بوە. ئەگەرچی بەرهەمی ئەو سیاسەتە یەكجار دژوار بوو، بەڵام خودی سیاسەتەكە هیچ سەرلێشێوانێكی تێدا نەبوە. ئەم سیاسەتە لەقۆناغی پاش داگیركردندا بوو بەسیاسەتی راگەیەنراوی نزیكەی هەمو دەوڵەتە نەتەوەیی‌یە تازەكان، چونكە سەرمایەی بیانی مادام مەرجی سیاسی‌و ئابوری‌ی لی‌نەكەوتۆتەوە، بەردەوام پێشوازی‌ی لێ كراوە. ئەوسا بیر بۆ ئەوە دەچو كەتوركیای پاش جەنگ‌و بێ دەسمایە، ئەگەر بیەوێ ژێرخانی ئابوری‌یەكی مۆدێرن دامەزرێنێ، هەر دەبێ پشت بەسەرمایە گوزاری‌ی بیانی ببەستێ. لەمارتی ١٩٢٢دا مستەفا كەمال ئەم مەسەلەیەی ئاوا بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی باسكرد: ((ئەگەر دەمانەوێ لەماوەیەكی كورتدا بەختیاری‌و خۆشگوزەرانی بۆ گەلەكەمان دابین بكەین دەبێ بەزوترین كات سەرمایەی

بیانیمان دەست کەوێو تا ئەوپــەڕی، ســود لەهــەر شــارەزاییی‌ەکی بیــانیی پێویست، بۆ بەدیهێنانی خۆشیو گەشانەوەی وڵاتەکــەمانو خۆشــگوزەرانیی گەلەکەمان وەرگرین چونکە باری دارایی ئێستامان بەکەڵکی دامەزراندنو بەگەڕخستنی دامودەزگا گشتیی‌ەکان نایەت))[18]. زۆریشی پیّنەچو بە بــیری نوێنەرانی گەلی هێنایەوە. کە ((هەر دەبێ بیر لەوە بکەینەوە کەچۆن ئامانجی نەتەوەییمان بەدەست بێنین چونکە ئــەو ئامــانجی نەتەوەیییــە پێــش هــەمو شــتێك ژیــانو ئازادیمانــە ئامــانجی ئــەم هەڵمەتــە پــیرۆزەی ئێســـتامان سەربەخۆبونی تەواوە. سەربەخۆبونی تەواویش مەگەر تەنها بەســـەربەخۆییی دارایی بێتە دی))[19].

ڕەنگە هیچ شتێك بەقەدەر کۆنفرەنسی شوباتی ١٩٢٣ی ئیزمیری ئابوریی تورك ئاواتەکانی ئابوریی سیاسیی کەمالیزم ئاشکرا نەکات. ئەوسا جەنگی سەربەخۆیی دواییی هاتبوو، وتووێژی ئاشــتیش لــە لــۆزان لــەگۆڕێدا بــوو. سنوری دەوڵەت کە لەپەیمانی نیشــتمانیی ســاڵی ١٩١٩دا دیــاری کرابــوو، بەکردەوە لەشەڕگەدا کێشرابوو بەڵام خەبات بۆ ســـەروەریی ئــابوری هێشــتا وتووێژی لەسەر دەکرا. یەکێ لەئامانجەکانی کۆنفرەنسی ئابوری ئەوە بوو کــە بۆ جیهانی دەرخا کەسەرکردایەتیی سیاسیو گروپە ئابورییــە جیاجیاکــان، لەوانە گروپی بازرگانی، کە لــەزەمانی ئیمپراتۆریــەتدا ئــامرازی دزەکردنــی بێگانانو لەهەستی نەتەوەییدا جێی گومان بوو، خــاوەنی یــەك دیــدو یــەك ئامانجن. کەچی ئەو گروپە کە ((یەکێتیی بازرگانیی نەتــەوەییی تــورك)) نوێنەری بوو، لەم کۆنفرەنسەدا پرۆگرامێکــی نەتــەوەییی تۆکمــەی داهێنــا. لەئــەنجامدا داوای مــافی ســەپاندنی تاریفــەی گومرگــیی بەســەر شمەکـــە بیانیی‌ەکاندا کرد، دژایەتیی سەلماندنی زێدەمافو مــافی پاوانکارانــەی بــۆ سەرمایەی بیانی کرد، پێشــنیاری کــرد کــەنار دەریاکــانی تورکیــا بکرێنــە

---

[18] هەمان، ٨٨.
[19] هەمان، ٨٩.

ناوچەی چالاکی بێ پاوان، بانگەشەی بۆ دامەزراندنی بانقێکی نەتەوەیی کردو داوای کرد تەنها بەو تاکە مەرجە رێ بەهاتنی سەرمایەی بیانی بدرێ کە کەڵکی بۆ ئابوری گەل هەبێ[20]. تارادەیەک هەرچی لە کۆنفرەنس پێشنیار کران، یەک ئامانجی بنچینەیی‌یان هەبو: ئەویش پایەدارکردنی ئابوری نەتەوەیی‌و باسك ئەستورکردنی ئەو هێزە ئابوری‌یانەی وڵات بوو کەلێیان رادەبینرا لەماوەیەکی کورتدا بنەمای کۆمەڵایەتی-ئابوری کۆمارە ساواکە دامەزرێنن.

دەوڵەتە تازەکەی ١٩٢٣و دو چینە ئابوری‌یە سەرەکی‌یەکەی بورژوازی ساواو زەویداران هاو ئامانج بوون. نابێ ئەمە ئەو راستی‌یە بشلەژێنێ کەدەوڵەتی کەمالیست لەگەوهەردا ((لەخودی خۆیدا سەربەخۆ بووە))و ملکەچی هەوەس‌و ئارەزوی هیچ یەکێ لەم دو چینە نەبوە. ئەمەش شتێکی چاوەڕوانکراوە، لەهەلومەرجێکدا کەهێشتا کۆمەڵ تێیدا لەروی گەوهەری‌یەوە لەقۆناغی پێش سەرمایەداری‌دا دەژی، قۆناغێك کەچینە مۆدێرنەکانی وەك بورژوازی‌و کشتیارانی سەرمایەدارو کرێکاران تێیدا نەخەملیون‌و بەشێوەی ساوایی لەکایەدان‌و تارادەیەکی زۆر لەهەرەتی نەشونمادا بوون. ئەو چینانە لەوە دورتر بوون کەبتوانن رێنمایی دەوڵەت بکەن‌و هەر دەبوایە دەوڵەت مشوریان بخواو پێیان بگەیەنێ.

ئەوەی دەستی بەسەر دەوڵەتە تازەکەدا گرتبوو ئینتلجنسیای بەپێکهات مەدەنی‌و سوپایی بوو، کە کرۆکی جوڵانەوەی کەمالیستی پێکدەهێنا. لێرەدا دەکرێ بچینە سەر تێڕوانینەکەی ئارسەر کاستلەر بۆ ئینتلجنسیاو نەخشە مێژویی‌یەکەی چونکە زۆر لەهینی ئینتلجنسیای تورکەوە نزیکە.

---

[20] Okcun، ٤٠٦، هەروا:

Dogan Avciogl nin Duzeni, Ankara, 1969, 229-33.

بەهاتنی ساڵی ١٩٢٦ ، کەمال پاشا لەخۆی رادەبینی بەشانازی‌یەوە ئەنجومەن لەوە ئاگادار بکاتەوە کەئاڵای تورك لەسەر کەشتی‌یەکاندا هەڵکراوە.

ناوبراو وتویه ((ئینتلجنسیا بەواتا مۆدێرنەکەی بۆ یەکەمین جار وەك ئەو بەشەی نەتەوە سەری دەرهێنا کەبەپێی باری کۆمەلایەتیی، ئەوەندەی هاندراوە ئەندێشەیەکی سەربەخۆ بۆ خۆی گەلاڵە بکات، بەقەدەر ئەوە بەتەنگ گەلاڵەکردنی ئەو ئەندێشەیەوە نەبوە، ئەندێشەیەك کە جۆرە رەفتارێکی بەکۆمەڵی لێ دەکەوێتەوەو بەهۆی ئەو رەفتارەوە ساختەچێتیی پێکهاتەی لەئازادبووی (ئینتلجنسیا لێ دورخراوەی) بەهاکان ریسوا دەبێ‌و لەهەمان کاتیشدا بەهای نوێ‌و تایبەت دەچنە شوێنیان. ئەم مەیلە بنیاتنەرەی ئینتلجنسیا دوەم روخساری بنەڕەتیی پێکدێنێ. تێکشکێنەرە راستەقینەکانی داب‌و نەریت هەمیشە سیمایەکی پێشبینیکەرانەیان پێوە دیارەو هەرچی ریسواکەری درۆو دەلەسەو ساختەچێتییە هەمیشە سیمایەکی فێرکەرانی شەرمنی لەبەرچاوان ونی هەیە))[21].

ساڵی ١٩٢٣ ئینتلجنسیای کەمالیست بەکردەوە دەسەلاتی بەدەستەوە بوو و بەنیازیش بوو ((هەیکەلی بەهاکان)) بگۆڕێ‌و ولات دورتر لەوەی بورژوازیی‌و سەرەنجام دورتر لەوەی زەویداران‌و سەرخێڵەکانی دەیانخواست بۆ پێشەوە بەرێ. ئەو چینە کۆنانە زیاتر کەیفیان بەڕژێمێکی شاهانەی دەستوریی خاوەنی ئایدیۆلۆژیایەکی دینیی کلاسیکی دەهات. بەلام کەمالیستەکان لەبری ئەوە، کۆماریان دامەزراند. ئەو کۆمارەش زۆری پێ نەچو بەرگێکی عیلمانیی لەخۆوە پێچا، لەکاتێکدا خەڵکانێکی زۆر (لەوانە هەندێ لەدیارترین سەرانی بزوتنەوەی نەتەوەیی) بەرهەڵستیی ئەم لایەنەیان دەکرد. ئەمە سەرەنجامی مەنتیقیی ئەو خەباتە بوو کەبانگەشەی بۆ نەتەوایەتیی‌و سەروەریی نەتەوە دەکردو شێت‌و شەیدای شارستانێتیی رۆژئاوا بوو بوو. بەلام چینە کۆنەکان لەو بڕوایەدا بوون کەئەستەمە رژێمە تازەکە پەسەند بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا، ریفۆرمەکان-ئەگەر سەروگوێلاکی

[21] Arthur Koestler: The Yogi and the Commissar, Danube Edition, New York, 1967, 73.

قسە بەناوبانگەکەی کەمالیستەکان بشکێنن-((بەتۆبزی، لەپێناوی بۆرژوازیدا)) ئەنجام دران. ئەوەش بەڵگەیە کەهەرچیی ریفۆرمەکانی ساڵانی بیستو سییە جێی رەزامەندیی ئەو چینانە بووە چونکە بوونە هۆی رامالێنی کۆسپو تەگەرەیەکی زۆری دامودەزگاکانو ئاستەنگە قانونییەکانی رژێمی کلاسیکیی پێش سەرمایەداری کەبەرپەرچی پێکهاتە مۆدێرنە تازەکەیان دەدایەوە بەلاّم هەر ئەو ریفۆرمانەش بوون کەپەیوەندییەکانی خاوەنێتییان وەکو خۆی هێشتەوە[٢٢].

لەچارەکە سەدەی دواتردا، ئابوری لەسایەی دەوڵەتدا بەردەوام لەگەشەکردندا بوو. لەمارتی ١٩٢٢وەوە کەمال پاشا کەبەقەدەر ئەوەی سەری لەلاوازیی پرۆسە گشتییەکان دەرکردبوو، ئەوەندەش پەی بەلاوازیی کەرتی تایبەت بردبوو، بەکۆمەڵەی گشتیی دەوت ((یەکێ لەگرنگترین ئامانجەکانی ئابوریی سیاسیمان ئەوەیە کەئەوەندەی توانای داراییو تەکنیکیمان دەرفەت دەدا، هەموو ئەو دامودەزگاو پرۆژە ئابورییانەی راستەوخۆ خێریان بۆ هەموان لێ هەڵدەوەرێ بخەینە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتەوە))[٢٣]. ئەم ئامانجە وەك شتێکی گەوهەریی فەلسەفەی ئابوریی کەمالیزم مایەوەو لەسییەکانیشدا دەبێتە یەکێ لەخاڵە سەرەکییەکانی سیاسەتی دەستێخستنی دەوڵەت.

هۆی ئەوەی کەلەم سەروبەندەدا بایەخمان بەپەیوەندیی نێوان رژێمە تازەکەو چینە شارستانە سەرەکییەکەی بورژوازی داوە ئەوەیە کە کەمالیستەکان تەواو بڕوایان بەوە هەبوو کەئابووری شار دینەمۆی بزوێنەری پەرەپێدانەو کەرتی لادێش سوتەمەنییەکەیەتی. لادێش بەکەموکوڕییەوە

---

[٢٢] بۆ زانیاری پەیداکردن لەسەر بەیاننامەکەی ریفۆرمەکان، بڕوانە:
Bernard Lewis: The Emergence of Modern Turkey, London, 1968 (2 nd Edition), 261-274.

[٢٣] Ozturk- هەمان، ٨٦-٨٧.

وەرنەدەگیراو هەست بەگرنگی‌ی بۆ ئایندەی نەتەوە کرابوو. کەمال پاشا بەکۆمەڵەی گشتی‌ی وت ((بەڕێزان، ئێمە وڵاتێکی کشتوکاڵین. گەورەو خاوەندارو بەرهەمهێنەری راستەقینەی تورکیا، جوتیارە ... کاکڵەی ئابوری‌ی سیاسیمان بەگەڕخستنەوەی سەرەنجام‌و بەری کاری جوتیارە بۆ بەدی هێنانی زۆرترین قازانج بۆی))[24].

نابێ ئەم قسانە وەلابنێین گوایە بێ لەڕەوانبێژی‌و قسەی رازاوە هیچی دی نین چونکە ئینتلجنسیای تورک بەڕاستی بەپێزانینەوە دەیڕوانی‌یە نەخشی جوتیاران لەئابوریدا-لەسوپاشدا وەك سوتەمەنی‌و بەزەیی‌ی بەنەهامەتی‌و کولەمەرگی‌یاندا دەهات. ئەنتلجنسیا شوێن پێی نارۆدینکە روسەکانی هەڵگرت‌و مۆرکێکی ئایدیالی بەسەر جوتیاراندا دادا. لەژێر کاریگەری‌ی ئەم چەشنە رەهەندانەدا، بزوتنەوەی ((زۆن تورك)) (لاوانی تورك) دەیویست بارودۆخی لادێ بڕمێنێ‌و جوتیار لەژێر چەپۆکی زەویدارە دەرەبەگەکان‌و ئاغا خێڵەکی‌یەکان‌و گەورە پیاوان دەربێنێ. بەڵام سەرەڕای نیاز پاکی‌ی بزوتنەوەکە، هیچ کردارێك بۆ چاککردنی گوزەرانی مەینەتباری جوتیار سەری نەگرت. بەپێچەوانەوە، لەماوەی دە ساڵە شێواوەکەی تا ساڵی ١٩١٨ ژیانی جوتیار نالەبارتر بوو[25]. لەسایەی کۆماردا باری جوتیاران تا رادەیەك چاکتر بوو-هیچ نەبێ لەو رووەوە کەباجی دەیەکی لەکۆڵ کرایەوە، بەڵام

---

[24] وتەکان لەوتارە ناوبراوەکەی یەکی مارتی ١٩٢٢ وەرگیراون، ٨٤-٨٥.

[25] بڕوانە:

Feroz Ahmed: The Agrarian Policy of the Young Turks 1908-1918.

ئەم لێکۆڵینەوەیە لەبڵاوکراوەکانی دووەم کۆنفرەنسی نێونەتەوەیی‌ی مێژوی کۆمەڵایەتی‌و ئابوری تورکیایە کەزانکۆی ستراسبۆرگ لەماوەی نێوان ١-٥ی تەموزی ١٩٨٠ سازی کردوە. دواتر لێکۆڵینەوەکە لەلایەن ئیرین میلیکۆف‌و جین-لویس گرامۆنتەوە بۆ بڵاوکردنەوە ئامادە کرا.

گۆڕانکاری‌یەکی بنەڕەتیش لەلادێدا روی نـــەداو وردتــر، هیــچ ریفۆرمێکــی کشتوکاڵی نەهاتە ئاراوە، لێرە پێویستە بپرسین بۆ؟[26].

پێش هەموو شتێك گیروگرفتی کشتوکاڵ بەو جۆرەی کەزۆر دەوڵەتی تازە سەربەخۆی دنیای سێ پێوەی دەتلێنــەوەو زادەی زۆری‌ی ژمــارەی دانیشــتوان‌و کەمــی‌ی زەوی‌وزارە، لەکۆمـاری تورکیا لەئارادا نەبوو. لــەتورکیا نرخــی زەوی لەسەرەتای سەدەوە بەرز بۆوەو بوە مایەی زیادبونی خواست لەسەر زەوی. ئــەم پەرەســەندنی خواســتەش هــەندێ گــرژی‌ی ناوچــەیی لێ کەوتــەوە، بــەڵام بەشێوەیەکی گشتی، چەند داوا لەسەر زەوی هـــەبو، ئــەوەندەش زەوی هــەبو. بەجۆرە، تورکیـــا هــەندێ شــوێنی ئــەناتۆلیای لێ بـترازێ کــەخاوەندارێتی‌ی گەورەی زەوی‌و زاری لێ بوو، وەك وڵاتی زەویدارانی بچوك مایەوە.

ئەوەندەی تورکیا کشتوکاڵی بەدەم کەمـی‌ی هێزی کارەوە دەتلایەوە ئەوەندە بەدەم کەمـی‌ی زەوی‌و زارەوە نەدەتلایەوە. ئەوەی گــیروگرفتی کــەمـی‌ی هــێزی کاریشی دژوارتر کرد، جەنگی بەردەوام‌و فەوتانی خەڵکی بوو لەکاتی یەکـەم جەنگی جیهاندا کەمـی‌ی هێزی کشتوکاڵی‌ی کار گێچەڵی نایەوە، لەئەنجامدا حکومـەت ناچار بوو بــۆ دەستخســتنی هــێزی هــەرزانی کــارو هێشــتنەوەی بەرهەمـی ژیانی‌ی کشتوکاڵ پەنا بەرێتە بەر سســتمی بێگــار. ســاڵی ١٩٢٣ ژمارەی دانیشتوانی دەوڵەتە تازەکە-بــەوزە بەرهەمهێنەرەکــەی وڵاتیشــەوە- بەرێژەی لەسەدا بیست دابەزی بوو[27]. سەرەنجام، ســەرلەبەر بەشــینەوەی زەوی لەو کاتەدا ئەوەی لێ چاوەڕوان دەکرا کەببێتە مایــەی شــکاندنەوەی کتوپــڕی قەوارەی هێزی کاری کشتوکاڵ چونکە زەویدارەکـــان ئەگــەرچی کــرێی کــرێی زەوی دابەزینی بەخۆوە دیبوو، ناچار دەبون کرێیــەکی زۆرتــر بدەنــە کرێگرتــەکان. لەسۆنگەی ئەم دو هۆیەوە، گەورە زەویدارەکان بەرهەڵستی‌ی ریفۆرمی زەوی‌و

---

[26] بڕوانە: Avcioglu، ٢٣٣.

[27] Vedat Eldem: Osmanli imratorlugunun iktisadi Sartlari Hakinda bir tetkik, Istanbul, 1970, 63.

هەر گۆڕانێکی بنەڕەتی‌یان لەلادێدا کـرد بـەڵام کـەمی‌و بـەرزیی تێچونـی هێزی کار هی ئەوە بوو کە گەورە زەویـداران ناچارکـا رووبکەنـە ڕێوشـوێنە مۆدێرنەکانی کشتوکاڵ، لەوانە بەکارهێنانی مەکینە، بەجۆرێك کەدواتر ئەو سەرەنجامەی لی‌کەوتەوە کەکشـتوکاڵی تـورك ئـەوەندەی پشـتی بەسـەرمایە بەست ئەوەندە پشـتی بـەهێزی کـار نەبەسـت. ئەمـە ئـەو ڕێوشـوێنە بـوو کەبزوتنەوەی ((زۆن تورك))و دواتر کەمالیستەکان پێیان وابوو گـیروگرفتی کەمی‌ی دانیشتوانی پێ چارەسەر دەکـرێ، کـەمال پاشـا پەنجـەی بـۆ ئـەوە درێژکرد کە ((سەرەڕای کەمـی‌ی ژمارەی دانیشتوانمان لەچاو قەوارەی وڵاتمان، لەدەوڵـەتانی دی زیـاتر پێویسـتمان بـە بـەکارهێنانی مەکینـەو ئـامرازی زانستی‌یە لەکشـتوکاڵدا))[٢٨]. حکومـەت بەلەبـەرچاو گرتنـی کارامـەیی‌و کارایی‌ی کشتوکاڵی زانستی لەهەندێ کێڵگەی نمونەیی‌دا، دەیویست سەرنجی کشتیاران بۆ ئەم مەسەلەیە ڕاکێشێ. ئەم مەسەلەیە سەری نـەگرت‌و تەنـها پاش هاوردنی مەکینەی کشتوکاڵی، بـەهۆی پرۆژەکـەی مارشـاڵەوە، ئنجـا کشتوکاڵی میکانیزەکراو پەرەی سەند.

مەسەلەی کشتوکاڵ لەتورکیا لەبنەڕەتدا سروشـتێکی سیاسـی‌ی هـەبو نەك ئابوری. چارەسەرکردنیشی پـەیوەندی‌ی بـەوەوە هـەبو کـەجوتیاران یـان زەویدارە گەورەکان پشـتیوانی‌ی بزوتنـەوەی نەتەوایـەتی دەکـەن. وەك پاشـتر دەرکەوت، ئەوەی پشتیوانی‌یەکی ساردو سـڕی لەبزوتنەوەکـە کـرد زەویـدارە گەورەکان بوو، جوتیارەکـانیش بەشـێوەیەکی گشـتی باکیـان بەبزوتنەوەکـە نەبوو. ئایا هۆی ئەمە چیە؟

ڕەنگە جوتیارەکان لەسـەر دەسـتی زەویدارانـی لادێ چەوسـێنرابێتنەوەو خـراپ هەڵسـوکەوتیان لەگـەڵدا کرابـێ، بـەڵام ئـەوان لێپرسـراوەتی‌ی چەوساندنەوەیان دەخستە ئەسـتۆی دەوڵەتـەوەو چـاوەڕوانیش بـوون دەوڵـەت فریایان بکەوێ‌و ڕزگاریان بکا. جوتیاران ئومێدیـان هـەبو شۆڕشـی ١٩٠٨

---

[٢٨] وتارەکەی یەکی مارتی ١٩٢٣، بەپێی Ozturk.

گۆڕانکاری لەلادێ بەدەست بێنێ بەڵام دواتر لــەم بارەیــەوە ئومێدبــڕ بــوون. کەرب و کینی پەنگ خواردوی دڵی جوتیارانی ئەناتۆلیا بۆ کەمالیستــەکان مایەوە. خوێندنەوەی راپۆرتەکانی ساڵی ۱۹۰۹ی رۆژنامەوان ئەحمەد شەریف دەرفەتێك دەرەخسێنن کـەپیاو حـەزو ئـاوات و بـێ ئومێـدی و بـێ بڕوایـی ی جوتیارانی ئـەناتۆلیا تـێ بگـا. یـەکێ لـەو راپۆرتانـە بەتایبـەت سـکاڵای جوتیارێکی پیری پەککەوتەی یاداشت کردەوە بەتێروتەسـەلی بەشـێکی زۆری قسەکانی نوسیوەتەوە. جوتیارەکــە لەمــەڕ بـارودۆخێك دەدوێ کـە لەسـاڵی ۱۹۰۹دا مەترسـیدارو تۆقێنـەر بـوو، بـارودۆخێك کـە دە سـاڵ دواتـر بـوو بەمایـەی بـێ ئومێـدی، کـاتێك کەمالیستـەکان بـۆ دەسـت پێکردنـی کێشمەکێش و ململانێ ی مان و نەمان کەوتنە خۆ:

((ئازادی، وشەیەکە تازە بەر گوێمان دەکەوێ. لەوەی بیستومانەو بـەپێی هەندێ چالاکی و جموجـۆڵ، تێگەیشـتوین کەئـەو ئازادی یـە شایسـتەی خـۆ شـەکەت کردنـە.. بـەڵام ئێمـە وا تێگەیشـتبوین کەهـەمو شـتێك راسـت دەکرێتەوە، باج و پیتاك بەرێکوپێکی و بەشێوەیەکی نازاڵمانـە کۆدەکرێتـەوە، تاوانباران و دزو جەردەو چەتەکانی لادێ چارەسەر دەکرێن، منالاَنمان کەدەچنـە خزمـەتی سەربازی لەمەودوا برسـی و رووت و رەجـاڵ نامێنێننـەوەو لـەکاتی خۆیدا دەسئاوەلاَ دەکرێن، لێپرسراوەکان بەکەیفی خۆیان هەڵسوکەوت ناکەن و هەمو شتێکیش دەگۆڕێ. تا ئەمڕۆ هیچ نەبوە. بگرە جاران هەندێ شت باشتر بەڕێوە دەچو. ئەمڕۆ، پاشـاگەردانی یە. بچـۆرە نـاو فەرمانگـەی حکومـەت، نـازانێت کـێ لێپرسـراوە.. هێشـتا حکومـەت لایـەك لەگیروگرفتـەکانمان ناکاتەوە. زۆر کەس بەڵگەی مولکایەتی ی کێڵگەی هەیە. کەچی ئێمـە لـەوە دڵنیا نین کەئەو زەوی یەی دەیکێڵین هی خۆمانە یان نا. لەسـۆنگەی ئەمـەوە هـەمو رۆژ شـەڕ دەقـەومێ و ناوبـەناو خـەڵکیش دەکـوژرێ. روو دەکەینـە فەرمانگەکانی دەوڵەت و دادگاکان بـەڵام نـاتوانین باسـی گیروگرفتەکـەمان بکەین. کارمەندان بێجگە لەباج وەرگرتن بیر لەهیچ شـتێ ناکەنـەوە.. ئێمـە

بەدرێژایی‌ی ساڵ ماندوو مردوو کار دەکەین‌و هەمو ساڵێش باج دەدەین.
ئەگەر نەشیدەین، بەزۆر لێمان دەسەنن، ڕەنگە قاپ‌و قاچاغ‌و بزگوڕو لێفەو دۆشەگیشمان بفرۆشن. بۆیە، هەمیشە قەرزو قوڵە پڕوکاندونی، چەند ساڵێك لەمەوپێش گوند زۆر جوتیاری لێ بوو، تۆویان نەبوو بیڕوێنن. چونکە هیچ لایەنێکیش یارمەتیمان نادات، دەبوایە تۆو لەئاغا بکڕین، ١٠٠ تا ١٢٥ قرشمان بەڕبەیەك تۆو دەدا یا بەنیاز بووین لەبری هەر ربەیەك تۆو سێ ربە بەروبومی بدەینێ. ئەو ئاغایانە بونەتە هۆی ئازارو تەنگ پێ‌هەڵچنین، چونکە دەتوانن سەرو پۆتەلاکی جوتیار بشکێنن‌و چەقۆوەشێن‌و دەسوپێوەندەکانی خۆیانی تێ بەردەن. بیخەنە زیندانەوە یا بەشکات لێ کردن لەلای دەوڵەتدا بیتۆقێنن‌و زراو بردوی بکەن. بەمجۆرە، قەرز لەقەرزارە بێ دەرامەتەکان دەسەننەوە. ڕاستە بانقی کشتوکاڵ قەرز دەدا بەڵام ئەمەش هیچی لێ هەڵناوەرێ چونکە پارەکە بەر لەوەی بگاتە گوند نامێنێ))[٢٩].

ئەم لیستە دوورودرێژەی شکات‌و سکالانامە دەری دەخەن کەجوتیارەکان ئەوەندەی بەرامبەر بەدەوڵەت خۆیان بەنامۆو بێگانە زانیوە، ئەوەندە بەرامبەر بەگەورە پیاوانی گوند خۆیان بەنامۆو بێگانە نەزانیوە. ئەم خۆ بەبێگانە زانی‌یە لەکاتی جەنگی جیهانیدا زۆر پەرەی سەند، جوتیاران خەباتی نەتەوایەتی‌یان بەدرێژەپێدانی جەنگ دایە قەڵەم. وەك چۆن لەجەنگدا ڕایانکرد، لەخەباتی نەتەوایەتیش ڕایانکرد. ناسیونالیستەکان

[٢٩] Ahmet Serif: Anadolu da Tanin, Istanbul ، 1977 ، 128 چاپە ڕەسەنەکەش لەساڵی ١٩١٠ بلاوکرایەوە. پێش ئەمە، کاتێك ئەحمەد شەریف لەتەمەنی بیست‌و پێنج ساڵیدا بوو، نوسی بووی: ((شتێك کەجوتیار سەری لێ دەرناکا ئەوەیە کەسەرەڕای ئەو هەمو گفت‌و بەڵێنەی ساڵی پار بیستی، کەچی تائێستا تاقە گفت‌و بەڵێنێکی نەدیوە جێ‌بەجێ بێ، بەو گفت‌و بەڵێنانەشەوە کەئاسان جێ‌بەجێ دەکرێن. جوتیار دەیەوێ کارمەندە گەندەڵەکان دور بخرێنەوە، دەیەوێ لەوە ئارخەیان بێ کەچیدی پێویست ناکا لەبەردەم ئەو پۆلیسانەدا کەخۆی دەرخواردیان دەدا، بلەرزێ. دەیەوێ هەمو ئەو شتانە بگۆڕێن کەڕەنگە بۆ ئێمە هیچ بایەخێکیان نەبێ‌و بۆ ئەو بایەخێکی زۆریان هەبێ)).

لەبەسەرباز گرتنی جوتیاراندا دوچاری دژواری‌یەکی زۆر بوون. جوتیاران زیاتر لەگەڵ پڕوپاگەندەکەی حکومەتی سوڵتاندا هاوئاهەنگتر بوون، کاتێك حکومەتی سوڵتان بڵاوی کردەوە کەپێویست ناکا لەڕیزی نەتەوەخوازەکاندا خزمەت بکەن. لەپشێوی‌ی ئەو ساڵانەدا هیچ بزوتنەوەیەکی جوتیاری بۆ کۆنترۆڵکردنی زەوی لەئارادا نەبو. زۆربەیان بێباكو ساردو سڕ مانەوە، ئەگەرچی هەندێکیان چونە ریزی ئەو هێزە پێشمەرگەیی‌یە ناوچەیی‌یانەوە کەچەتەو رێگرانێکی بەکردەوە لەدەوڵەت یاخی سەرکردایەتی‌یان دەکردن. ئەستەمە مەسەلەیەك بدۆزنەوە کەبەکەڵك بێ جوتیارانی ئەناتۆلیای لەدەوری کۆ بکەینەوەو سەرەنجام هەڵەیەکی مێژویی‌یە وابزانین کەمالیستەکان بەرپرسیارن لەڕێکنەخستنیان[30]. ئەگەر بارودۆخی ئەناتۆلیاو بارودۆخی هندستان بەراوردی یەکتری بکەین، دەردەکەوێ کەجوتیارانی هندستان لەدژی حوکمی بریتانیە لەجۆش‌و خرۆشدا بوون، تەنانەت گەیشتبوونە ئەو رادەیەی کەخۆبەخۆ کار بکەن‌و تەنانەت داواشیان دەکرد رێکیان بخەن. پارتی کۆنگرێسی هند گەیشتبووە رادەیەك دەیویست بەهۆی مەهاتما گاندی‌و فەلسەفەی گاندی‌یەوە جڵەوی جوتیارەکان بگرێ‌و جمین‌و چالاکی‌یەکانیان بەرەو رەهەندێکی ناشۆڕشگێڕ بەرێ. کەمالیستەکان دوچاری گیروگرفتی ئاوا نەبونەوە.

[30] باوترین رەخنە کە لەڕژێمی کەمالیست دەگیرێ ئەوەیە کەئەو رژێمە لەترسی توڕەبونی گەورە زەویداران نەیوێراوە جوتیارەکان یەکخاو بیانخاتە جۆش‌و خرۆشەوە. ئەگەرچی رەنگە ئەمە وابێ، بەڵام رەخنەگرەکان بەهیچ شێوەیەك ئەوەیان پێ نەسەلمێنراوە کەجوتیارانێك هەبون کە لەڕێی ریفۆرمی زەوی‌یەوە دەکرا یەکبخرێن‌و بخرێنە جۆش‌و خرۆشەوە. یەکێ لەو شتە عەنتیکانەی دواتر رویاندا ئەوە بوو کەجوتیاران پشتیوانی‌یان لەو حزبە نەکرد کەبانگەشەی بۆ ریفۆرمی زەوی دەکرد بەڵکو دەنگیان دایە پارتی دیموکرات کەدژی ئەنجامدانی ریفۆرمی زەوی بوو، ئەگەرچی پەیمانی دابوو ستەمی دەوڵەت لەکۆڵ جوتیاران بکاتەوە.

ئەگەر جولانەوەیەکی جوتیاری هەبوایەو چاوەڕوانی ئەوەی لیٚ بکرایە کە لەدەوری مەسەلەی نەتەوایەتی کۆ ببێتەوە، کەمالیستەکان رویان تێدەکردو لەگەورە زەویدارەکان هەڵدەگەڕانەوە. لەو ساتە وەختە پڕ تەنگژەیەدا کەتێیدا چارەنوسی گەلی تورك لەمەترسیدا بوو، کەمال پاشا پشتیوانیی هەر چینێکی بەلاوە مەبەست بوو. مرۆ کەپەیڤینە کورتەکەی نێوان کەمال پاشاو ئارالۆڤی باڵوێزی یەکێتیی سۆڤێت لەئەنقەرە دەخوێنێتەوە، ئەوەی لیٚ هەڵدەکرێنیٚ کە کەمال پاشا مەراقی بوو پشتیوانیی هەر چینێك بەدەست بێنیٚ. ناوبراو بەئارالۆڤی وت ((ئێوە، لەروسیا، چینێکی کرێکاری جەنگاوەرو قاڵبووی خەباتتان هەیە کەلێی رادەبینریٚو دەبیٚ پشتی پیٚ ببەستریٚ. بەڵام ئێمە چینی کرێکارمان نیە. جوتیارەکەشمان سەنگێکی یەکجار بچوکی هەیە))[31]. مەگەر ئەمە نیشانە بەوە نادا کەبونی جوتیارانێکی خاوەن هۆشیاریی سیاسی شتێکی ئەستەمە؟ بەڵام خۆ ئەم جۆرە چینە هەر نەبوە، چونکە ئەم توێژە لەبەر دڵسۆزیی رەگەزیو دینی بۆ ئەمو ئەو شێرازەی لەبەر یەك هەڵوەشابوو و بۆ دابینکردنی گوزەرانی خۆی پشتی بەهێزە ناوخۆییەکان بەستبو. لەبەر ئەوە کەمالیستەکان بۆ گەیشتن بەجوتیاران هەر دەبوایە بەرێبەرە تەقلیدییەکاندا، واتە زەویدارە گەورەکانو پیاوانی ئاین، تێپەڕن. زۆربەی جاریش ئەو زەویدارانە کەوتبونە خۆ بۆ هەرچی زوتری خۆ دەوڵەمەندکردن. کەمالیستەکان وەك چۆن سەر بۆ هەر پرۆسەیەکی ئاسایی دادەنەوێنریٚو وەك چۆن سەریان بۆ هەر داواکارییەکی جوتیاران بۆ کۆنترۆڵ کردنی زەوی دادەنەواند، ئاوەهاش سەریان بۆ ئەو فشارانە دانەواند. نرخی ئەو هاریکارییەی کەمالیستەکانو گەورە پیاوان رێککەوتنێکی نەنوسراو بوو لەنێوان هەردولا لەسەر هێشتنەوەی بارودۆخی لادیٚ وەکو خۆیو تەنانەت پایەدار کردنیشی. ئەمە لەرێگەی دامەزراندنی پارتی گەلەوە هاتەدی چونکە زەویدارە گەورەکان لەتوخمە بەهێزەکانی ئەو

[31] S.I. Aralov: Bir Sovyet Diplomatinin Turkiye Hatiralari, Istanbul, 1967, 92.

حزبە بوونو بەپێی قانون هەڵبژاردنو بەبردنی ماددەی ٧٤ بۆ ناو دەستوری تازە، ماددەیەك کەبەکردەوە دەرگای بەرووی ئەنجامدانی ریفۆرمی زەویدا داخست، زەویدارە گەورەکان گروپێکی گوشاری بەهێزیان لەناو کۆمەڵەی نیشتمانیدا بۆ خۆیان دەستەبەر کرد[٣٢]. دواتر، حکومەت لەرێی خوێندنەوە ویستی بارو گوزەرانی جوتیاران باشتر بکات، بەو هیوایەی کەجوتیارانی لادێی ئەناتۆلیا وردە وردە چاویان بکرێتەوەو بارودۆخیش وردە وردە بگۆڕێ.

رەگۆ ریشەی ئابووریی سیاسیی کەمالیزم لەهەیکەلی کۆمەڵایەتیی بۆ رژێمی تازە بەجێماوو رێوشوێنی ناساندنی ئەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتیی‌یەدا خۆی دەنوێنێ. دەوڵەتە تازەکە وا خۆی ناساند گوایە ((دەوڵەتی گەلە))و دەوڵەتی عوسمانیی پێشو ((دەوڵەتی کەسانێکی دیاریکراو)) بوە[٣٣]. لەکاتی خەباتی نەتەوایەتیی‌دا کەمالیستەکان هەمو ئەوانەیان دەخستە پاڵ گەلەوە کەپشتیوانیی‌یان لەخەباتی نەتەوایەتیی دژی هێزی ئیمپریالیستەکانو رژێمە کۆنەکە دەکرد. وەك گوزارەی ((دەسەڵاتی سێیەم))ی فەرەنسا پێش شۆڕشی ١٧٨٩، گوزارەی ((گەل)) زۆربەی هەرە زۆری گەلی دەگرتەوە، بەلێدەرکردنی توێژێك لەگروپە کۆمەڵایەتیی‌یە-ئابوریی‌یەکانو چەند کەسێك لەئەندامانی رژێمی کۆن. ئەرکی بنەرەتیی ئەو فۆرماسیونە هەرەوەزە، تێکشکاندنی رژێمی کۆنو هاوپەیمانەکانیو هێنانە کایەی رژێمێکی تایبەت بوو. ئەم ئەرکە بەر لەهەمو شتێك هاریکارییو بەتەنگەوە هاتنو کاری هاوبەشی لەهەمو لایەنە پێکهێنەرەکانی ئەم قەوارە-گەلە دەخواست. لەسۆنگەی ئەمەوە ململانێی چینایەتی لەرووی گەوهەرییەوە شتێکی دور بوو[٣٤].

---

[٣٢] بڕوانە: Avcioglu، ٢٣٥.

[٣٣] وتاری کەمال پاشا لەئەنجومەن لە ١٣ی تابی ١٩٢٣، بەپێی Ozturk، ١٦٦.

[٣٤] وتاری کەمال پاشا لەکۆنفرەنسی ئابوری، بەپێی Okcun، ٢٥٥-٢٥٦، هەروا بڕوانە: un Soyev ve Demecleri, vol. 2, 97, Ankara, 1959.

ئەو گۆبەندو گێچەڵانەی بەرۆکی کەمالیستەکانیان گرتو ئەو چارە شۆڕشگێڕییانەی کەمالیستەکان گەڵاڵەیان کردن، لەخەباتی نەتەوەیی دژی ئیمپریالیزمو دامو دەزگا جیهانییەکانی پێکهاتەی عوسمانی-ئیسلامییەوە هەڵقوڵان نەك لەململانێی چینایەتییەوە. ئەو ململانێیانە، بەتایبەتی تێکۆشان لەدژی دامودەزگا عوسمانییە-ئیسلامییەکان، پێیان لەسەر یەکێتیی گەل وەك نەتەوە دادەگرت نەك لەسەر ناکۆکییەکانی ناو ریزی گەل. ئەمەش هۆی هێرشی کەمالیستەکانە بۆ سەر ئایدیۆلۆژیای جیهانیی رژێمی کۆن، کە لەبری ئەوەی چەوساوەکان لەدژی چەوسێنەران تیژکا، هەمو چینەکانی سستو ئفلیج دەکرد. دیارە هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی هەردو شت، کارەساتی لێدەکەوتەوە. لەڕوی سیاسیشەوە، مستەفا کەمالو لەوە ژیرتر بوو کەبکەوێتە ئەم جۆرە داوەوە.

لەو قۆناغەی پەرەسەندندا، کەمالیستەکان نکۆڵییان لەوە دەکرد کەململانێی چینایەتی لەتورکیا سەرهەڵدەدا، وردتر چونکە وڵات چینی بەو ئەندازەیە پێشکەوتوی لێ نەبو کەبتوانێ ئەم چەشنە ململانێیە هەڵسوڕێنێ. کاتێك کەمال پاشا لەم بارەیەوە لەگەڵ ئارالۆڤی باڵوێزدا دوا، وتی ((تورکیا هچ چینێکی نیە... چینی کرێکار نیە چونکە پیشەسازییەکی پێشکەوتو نیە. پێویستە ئاستی بورژوازییەکەمان بگەیەنینە ئاستی چینی بورژوازیی راستەقینە. بازرگانییەکی لاوازمان هەیە چونکە سەرمایەمان نیە)). حکومەتیش بایەخێکی تەواو ((بەپەرەپێدانی بازرگانیی نەتەوەیی دەدا، کارگە دادەمەزرێنێ، سامانی ژێر زەوی دەردێنێ، دەستی یارمەتی بۆ بازرگانەکانی ئەناتۆلیا درێژ دەکاو دەوڵەمەندیان دەکا. ئەمە ئەو گیروگرفتانەن کەڕوبەڕوی دەوڵەت بونەتەوە))[٣٥]. لەسۆنگەی ئەمەوە، ئامانجی سەرەتاییی ئابووری سیاسیی کەمالیزم پێکهێنانی ژێرخانێکی چینایەتیی شایستەی کۆمەڵی مۆدێرنی سەرمایەدار بوو. دواتر، کەئەمە دێتە دیو

---

[٣٥] Avalom، ٢٣٤-٢٣٥.

ململانـێی چینایەتیشـــی بـــەدواوە دێ، دەوڵـــەت وەك نـــاوبژیوان خـــۆی لەمەسەلەکە تێدەگەیەنێ.

ئەگـەرچی کەمالیستـەکان چینـی پێشـــکەوتویان لـــەتورکیا دیـــاری نەکردبوو، بەڵام دەیانزانی گروپەکانی بەرژەوەندی توانای رێکخســتنی حزبـی سیاسـی‌یان هەیـەو لەتوانایاندایـە چـالاکی لـــەدژی بـــەرژەوەندیی گـــەل هەڵسوڕێنن. لەسەردەمی زۆن تورکدا تورکیا بـــەدەم نائارامی‌یـەکی دژوارەوە کەئۆباڵەکەی لەملی حزبە سیاسی‌یەکان بوو، دەتلایـــەوە. رژێمـی نـوێ ئـەم چەشنە چالاکەیانەی رەت کردەوەو تەنـــها یـەك حزبـی بـۆ خزمـەت کردنـی تورکیای نوێ راگەیاند کەپارتی گەلە، حزبێك کـــە(( هـەمو نەتـەوە، نـەك بەشێکی، دەگرێتە خۆ))[٣٦]. ئەمەش نیشانەیەکی تری بێ مننەتی‌ی رژێمـی کەمالیســت بـوو لەچینـەکانو بەڵگەیـەك بـوو لەسـەر بـــاوك ســـالاریی رژێمەکەیان کەخۆی بەرێبـــەری بێلایـەنی گـەل دادەنـاو وا خـۆی دەناسـاند کەرێگای دروست پیشانی گەل دەدا.

لەبیستەکاندا تورکیا نمونە ئابوری‌یەکەی ئەو پرۆژە لبرالـەی تـاقی‌کردەوە کەکۆتو زنجیری کاتی‌ی پەیمانی لـــۆزان رێـی لێ تـەنی بـوو. لـەو سـالانەدا حکومـەت دەورێکی گرنگـی لەدامەزراندنـەوەی هەیکـەلی ئـابوریی وڵاتـدا گێڕاو چەند ئەندامێکی نوخبەی کەمالیست بەشدارییان لەچەند پرۆژەیەکی ئابوریدا کرد وەك دامەزراندنی چـەندان دەزگـای گـەورەی لەبابـەتی بـانکی بازرگانی کەتا ئەمڕۆ یەکێکە لەگەورەترین پرۆژە بازرگانی‌یەکان. حکومـــەت

---

[٣٦] کەمال پاشا لەرۆژی ٧ی شوباتی ١٩٢٣دا وتارەکەی لەسەر مینبەری مزگەوتی پاشـــا خوێندەوە. بڕوانە:

un Soylev ve Demecleri, vol. 2, 97, Ankara, 1959.

لەسایەی ئەو هەستو ئەندێشانەدا، نوشوست هێنانی دو ئەزمونە کورت خایەنەکەی فرە حیزبی، شتێکی حەتمی بوو. بڕوانە:

Walter Weiker: political Tutelage Tutelage and Democracy in Turky, Leiden, 1973.

دەیخواست پێکهاتەیەکی بنچینەیی دامەزرێنێ کەنەبونی دەبوە هۆی مانەوەی بازاڕی ناوخۆ بەدواکەوتویی.

ئەگەر بێبازاڕییە گەورەکە دەمو دەست کاری لەتورکیا نەکردایە، رەنگە ئەم ئەزمونەی لیبرالیزمی ئابوری زۆرتری بخایاندایە، چونکە تەنگژە ئابوورییەکەی جیهانی سەرمایەداری کە لەساڵی ۱۹۲۹دا دەستی پێکرد، تینێکی زۆری بەدەستێخستنی دەوڵەتدا. ئاسەواری بێبازاری لەسەر ئابوری بەس بوو بۆ هاندانی حکومەت بۆ پەیڕەوکردنی چەند کردارێکی خێرا. تەنگژەکە ئاوا گوزارشتی لێ کرا کەشکستێکە بۆ رژێمی پرۆژەی ئازاد کەبەرۆکی سەرمایەداریی رۆژئاوایی دەگرتەوە. واش پێدەچو یەکێتیی سۆڤێت، بەو سستمە کۆنترۆڵکەرو دیسپلین سەپێنەی هەیبوو، رزگاری بوو بێ لەتەنگژەکە. بۆیە کەمالیستەکان یەکێتیی سۆڤێتیان ئاوا هاتە بەرچاو کەرەنگە فۆتۆکۆپییەکەی بەکەڵکی هەندێ بواری ئابوریی تورکیا بێ.

بەمانایەکی دی، دەسوەردانی دەوڵەت لەکاروباری ئابوری لەلای تورك شتێکی تازە نەبو. تورکەکان لەیەکەم جەنگی جیهاندا بەو ئەزمونەدا تێپەڕین، کاتێك بە((ئابوریی دەوڵەت)) ناویان بردو لەسییەکانیشدا دەسکاریی گوزارەکەیان کردو کردیانە ((دەوری دەوڵەت)). بەلام هەردو ئەزمون لەڕوی رواڵەتی بنەڕەتییەوە وەکو خۆیان، بەبێ گۆڕان، مانەوە. ئەو رواڵەتە بنەڕەتییەش بریتی بوو لەدەست گرتنی کەرتی تایبەتو یارمەتیدانی بۆ گەشەکردن بەڕۆشن کردنی رێگاکەیو جێبەجێکردنی چەند کردارێکی ئابوری کە کەرتی تایبەت لەوە لاوازتر بوو کەخۆی بەتەنها ئەنجامیان بدا[٣٧]. بەلام ئەمجارە ئەم سیاسەتە روخسارێکی رەسمیی بەخۆوە

---

[٣٧] پێناسە سەرەتاییەکەی دەستێوەردانی دەوڵەت وەرگیراوە لە:
Tekin Alp ((Harbden Sulha Intikal Iktisadiyati-Devlet Ikitisadiyati, in Iktisadyat Mecmuasi, Vol. 2. Nos. 62 and 64, 16 Aug. and 14 Sept. 1917.

بۆ شارەزابون لەگفتوگۆی دواتر دەربارەی دەستێوەردانی دەوڵەت، بڕوانە:
Korkut Boratav: Turkyie de Develetcilik (1923-1950), Ankara, 1952.

گرتو گروپە کارناسەکانی تورکی بێزار کرد. ئیتر دەوری دەوڵەت بوو بە ((یەکێ لەشەش پرنسیپە لەگۆڕان نەهاتوەکەی)) ساڵی ١٩٣١ی پارتی گەل کەدواتر لەساڵی ١٩٣٧دا خرایە پاڵ دەستورەوە. ئەم شەش پرنسیپە ئایدیۆلۆژیاو سەرەنجام ئابوریی سیاسیی کەمالیزمیان دیاری دەکرد. لەسۆنگەی ئەمەوە ئەم شەش پرنسیپە ئەوە دەهێنن کەنەختێك بەتێروتەسەلی هەندێ شتیان لێ وەرگرین. بەپێی مەحزەرەکانی کۆنفرەنسی ساڵی ١٩٣٥:

((یەکێ لەپرنسیپە سەرەکییەکانمان ئەوەیە کەنەك بەو چاوە تەماشای گەلی کۆماری تورکیا بکەین کە لەچەند چینێکی جیاواز پێکدێ، بەڵکو بەو چاوەی کە کۆمەڵێکی فرە پیشەیە، بەپێی پێداویستیەکانی دابەشکردنی کاری ژیانی تاکەکەسو کۆمەڵایەتیی گەلی تورك. ئەوە نیشانەیە کەجوتیاران، پیشەوەران، کرێکاران، کاسبکاران، کارمەندانی دەوڵەتو بازرگانان گروپە سەرەکییەکانی کاری کۆمەڵی تورك پێکدێنن. کەوتنە گەڕی هەر یەکێ لەو گروپانە بۆ ژیانو بەختیاریی ئەوانی دیو کۆمەڵ شتێکی پێویستە.

لەبەر رۆشناییی ئەم پرنسیپە، ئامانجی حزبمان بریتییە لەدەستەبەرکردنی رژێمی کۆمەڵایەتی، هاریکاری لەبری ململانێی چینایەتیو بەدی هێنانی پێکەوە سازان لەنێوان بەرژەوەندییەکاندا. دەسکەوتیش بەپێی لێوەشاوەییو توانای کارکردن دەبێ.

ئەگەرچی ئێمە کارو چالاکیی تایبەت بەپرنسیپێکی بنچینەیی دادەنێین، بەڵام یەکێ لەبۆچونە سەرەکییەکانمان بریتییە لەبەشداربوونی چالاکانەی دەوڵەت لەو بوارانەدا کەتێیدا بەرژەوەندییە گشتیو ژیانییەکانی نەتەوە سەرباسی مەسەلەکانن، بەتایبەتی لەبواری ئابوریدا، بۆ بردنی نەتەوەو وڵات بەرەو خۆشگوزەرانی بەنزیکترین کات.

بایەخدانی دەوڵـەت بـەکاروباری ئـابوری لەوەدایـە کەدەوڵـەت وەسـتای راستەقینەی بینا بێ، هانی پرۆژەی تایبـەت بـدات و کـارە ئـەنجام دراوەکـان پوخت و کۆنترۆڵ بکات.

دیـاریکردنی کاروبـاری ئـابوریی دەوڵـەت بـەپێی پێداویسـتی یەکانی بەرژەوەندیی گشتیی باڵای نەتەوە دەبێ. ئەگەر پرۆژەیـەك کەدەوڵـەت بڕیـار دەدا بەپیی ئـەو پێداویسـتی یە هەڵسـوڕێ، بەدەسـت خـاوەندارانی کـەرتی تایبـەت بـێ، هـەموو جـار خۆمـاڵی کردنی بـەپێی ئـەو قانونـە دەبـێ کەرێوشوێنێك بۆ قەرەبوکردنەوەی زیانی خاوەنەکانی پرۆژە تایبەتەکە دیـاری دەکا. کاتێك ئەو زیانە مەزەنە دەکـرێ، ئەگـەری قـازانج کـردن لـەئایندەدا لەبەرچاو ناگیرێ))[٢٨].

سـەرەڕای مۆرکـی تۆتالیتارییانـەی رون و رۆشـنی ئـەم بەڵگەنامەیـەو کەوتنە ژێر کاریگەریی تەوژمی فاشیستیی ساڵانی سـی، کەمالیسـتەکان هەمو پەیوەندییەکیان بەفاشیزمەوە رەت کردۆتـەوە. ئەنقـەرە بەپێچەوانـەی هەردو رژێمەکـەی رۆمـاو بەرلینـەوە، پرنسـیپەکانی لیـبرالیزم و تـیۆرانینی سەدەی نۆزدەهەمی دەربارەی پێشکەوتن بەلاوە پەسەند بوو، حوکمی قـانونی دەناساندو دانی بەگرنگیی دەوڵەتی دەستوردا دەنا. بەپێچەوانەی فاشـیزمەوە یەکجیهانیی شارستانی، ئەقلانیـەت، تاکەکەسـی و یەکسـانیی بنـەڕەتیی نێوان مرۆڤ و گروپـە ئیتنیکییـەکان رەت نەکرایـەوە. رژێمـی کەمالیسـت لەگەوهەردا ئینتیقالی مایەوە، بەرادەیـەك کـەرێی بـۆ رژێمێکـی سیاسـی و ئابوریی لیبرال خۆش دەکرد کە لەئایندەی نزیکدا جێی بگرێتەوە.

لەسەرتای سییەکاندا ترس هەبو نەبا گروپە بیروکراتەکان دەست بەسـەر دەوڵەت و حزبدا بگـرن و لـەبری سـەرمایەدارییەکی لـبرال سـەرمایەداریی

[٢٨] ئەم بڕگەیە بەشێکە لەوەرگێڕاوە رەسمییەکەی پرۆگرامی پارتی گەلی کۆماری تورکیـا لە:

Donald Webster: The Turkey of Ataturk, Philadelphia, 1939, 308-309.

دەوڵەت دامەزرێنن. کۆنفرەنسی ١٩٣٥، کەهەندێ لەمەحزەرەکانیمان خستە بەرچاو، رەنگدانەوەی ئەو ترسە بوو. ئەم مەترسی‌یە بیروکراتی‌یە بەزەقترین شێوە خۆی لەئاسەواری رۆژنامەی ((کاردۆ))ی سەرەك وەزیران عیسمەت ئینونودا دەنواند. بەلاّم ئەو بەرهەڵستی‌یە توندو سفتەی هاتە ئاراوە، بوە هۆی داخستنی ئەم رژنامەیە لەکۆتایی‌ی ساڵی ١٩٣٤دا. لەهەمان کاتدا جەلال بایاری سەرۆکی گروپی بانقی بازرگانی، لەساڵی ١٩٣٣دا کرابوە وەزیری ئابوری، ئەمەش رونی دەکاتەوە کەرژێم کەیفی بەوە نەدەهات کەدەوڵەت زێدەڕۆیی لەدەستێخستندا بکا. بایار تا ساڵی ١٩٣٧، کاتێك کرایە سەرەك وەزیران، سەرپۆستی ئەم کارە بوو. بایار ئەگەرچی لیبرالێکی دڵسۆز بوو بەلاّم دانی بەوەدا دەنا کەبورژوازی‌ی تورك لاوازەو پێویستە دەوڵەت دەورێکی سەرکردەیی لەئابوریدا بگێڕێ. بایار دەترسا نەبا دەوری دەوڵەت، بەرێبەرایەتی توندڕەوەکان، دورایی‌یەکی وا پەیدا بکا کەسەرەنجامەکەی بەپوکانەوەی کەرتی تایبەتی ساوا کۆتایی‌ی پێ بێ. لەسۆنگەی ئەمەوە کەوتە سەرنج راکێشان بۆ ئەم مەسەلەیەو بانگەشە بۆ بەخشینی بەشێکی زۆرتری ئابوری‌ی نەتەوەیی بەکەرتی تایبەت. بەجۆرە، لەو دەمەدا مشتومڕێکی زۆر لەسەر ئەوە هەبوو کە گوایە دەوڵەت نەیتوانیوە سنورێك بۆ دەستێوەردانی خۆی دانێ‌و کارێکی وا بکا کە گروپی کارناسانی تورك لێی رازی بن[٣٩].

هیچ پێویستی نەدەکرد کارناسەکان نیگەران بن، بەتایبەتی پاش ئەوەی ئینونوی سەرەك وەزیران دڵنیای کردنەوە کەمەبەستی دەوڵەت لەم دەستێوەردانە، ئافراندنی هەیکەلێکی پیشەسازی‌ی شایستەی ژیانە،

[٣٩] دیداری کۆرەل گوێمەن لەگەڵ جەلال بایار لە٢ی مارتی ١٩٧٠ لەوتاری:
((Stages of Etatist Development in Turkey)), Gelisme Dergisi/ Studies in Development, no. 10, Winter 1967, 91.

کەئەمەش شتێکە بورژوازی بەتاك‌و تەنیا بۆی ناچێتە سەر[٤٠]. مەبەست لەزۆربەی کردارەکانی ئەو دەمە-وەك دارشتنی یەکەم نەخشەی پێنج سالە (١٩٣٤-١٩٣٨)، دامەزراندنی بانقی سۆمەر لەسالی ١٩٣٦داو بانقی ئیتی لەسالی ١٩٣٥دا-بەدیهێنانی ئەو ئامانجە بوو، بێ لەوەی کەراستەوخۆ بۆ کەرتی تایبەتیش بەسود بوون[٤١]. دەولەت سەرەرای ترس‌و گلەو گازاندەی بورژوازی، لەبری بورژوازی دەوری سەربەخۆی خۆی دەگێرا.

لەو چەند سالەی ناتەبایی‌و مشتومردا، سەرنج دەدرێ کەرەورەوەی روداوەکان بەرەو دەولەتی تاك حزبی دەچو، دەولەتێك کەتێیدا حزب لەگەل دەولەتدا یەکدەگرێتەوە. ئەم رەهەندە، کەفۆتۆکۆپیی دەولەتە فاشیستەکان بوو، بەدلی بالەکەی ریشیب بەکیری سکرتێری گشتیی پارتی گەلی کۆماری تورکیا بوو. ئەم بالە کەوتە هێرشکردنە سەر لیبرالیزم‌و پێشبینی کردنی لەبەریەك هەلوەشانەوەی، کارێك کەزالبونی دەوری دەولەتی لێدەکەوێتەوە. ئەگەرچی ئەم بالە زۆر بەهاتوهاوار بوو بەلام لایەنگرانێکی زۆری لەناو حزبدا نەبو. ئەندامانی ئەم بالە دژایەتیی گروپی کارناسان‌و بەشێکی زۆری کۆماریخوازە دەسرۆکانیان کرد. سەرەنجام، سالی ١٩٣٦ سەرۆك کەمال ئەتاتورك خۆی لێ تێکەیاندو بەکیری ناچار کرد دەست لەکار بکێشێتەوە چونکە بەکیر ویستبوی دەست بەسەر حزبدا بگرێ‌و لەهەمو بوارەکاندا، لەوانە بواری ئابوری، بۆچونی توندرەوانەی خۆی بسەپێنێ[٤٢]. بۆ سالی دواتر مۆرکی لیبرالیزم خرایە پال ئابوریەوەو ئەم رێبازە درێژەی کێشا، تا لەدواییدا لەژێر فشاری پابەندبون بەبێلایەنی لەکاتی جەنگدا، پەکی کەوت.

---

[40] Basvekil Ismet: ((Firkamizin Devletcilik Vasfi)), Kadro, no. 22, Oct. 1933.

[٤١] Goymen، ٩٧.

Z.Y. Hershlag: Turkey, The Challenge of Growth, Leiden, 1968, 61.

[٤٢] Goymen، هەمان، ١٠٥.

سەرگرتنی ئـابوریی سیاسـیی کـەمالیزم تەنـها پـاش سـالّی ١٩٤٥و سەرکەوتنی دیموکراسی‌یە لیبرالەکان یـەکلابۆوە. لەسـایەی ئەمـەدا تورکیـا سستمی فرە حیزبی سیاسی‌و ئابوری‌یەکی تێکەلاّوی وای دامەزراند کـەتێیدا کەرتی دەولّەت ملکەچی کەرتی تایبەت بوو. بورژوازیی سـاوا کـە کـەمال ئەتاتورك هەولّی پێگەیاندن‌و کردنی بەچینێکی بورژوازیی راستەقینە دەدا، ئـەوەندە باسـکی ئەسـتور بـوو بـوو کەبـەگژ حـیزبی دەسـەلاّتداردا بچـێ‌و لەیەکەمین هەلّبژاردنی گشتیی خاوێندا شکستی پێبگەیەنێ. دواتـر، ئـەم چینە درێژەی بەگەشەکردنی خۆیدا، بەرادەیەك کە لەئابوریدا هەردو کـەرتی بازرگانی‌و پیشەسـازیی پـەرە پـێداو لەهـەمان کاتیشـدا چینەکـەی تـری کۆمەلّی سەرمایەداری پەیدا کرد، واتە چینی کرێکـاران. تەنانـەت لادێـش کەرژێمی کەمالیست لەسۆنگەی فاکتەری سیاسی‌یەوە پشت گوێی خسـتبو، ئەویش بەنۆرەی خۆی کەوتە ژێر کاریگەریی گۆرانکاریەکانی دوای برانـەوەی جەنگ، ئیتر بەشێوەیەکی بلەزترو گورج‌و گۆلّتر تێکهەلّکێشی ئابوریی بازار بوو. بەلاّم لەگەلّ ئەوەشـدا، هـەر کـەولاّت گـیرۆدەی تەنگژەیـەکی ریشـەیی دەبوو-وەك ئەوەی لەسالّی ١٩٦٠و ١٩٧١و ١٩٨٠ رویدا-رژێمی دەسـەلاّتدار هەمیشە دەچۆوە سەر ئەوەی کەپێویستە بچنەوە سەر رێی کەمالیزم. ئەمەش بەلّگەی ئەوەیە کـەئابوریی سیاسـیی تورکیـای مۆدێـرن لـەدوەم جـەنگی جیهانەوە بنەما ئایدیۆلۆژی‌یەکانی خۆی لەدەسـداوەو تـا ئـەمرۆش تورکیـا سەرگەرمی گەرانە بەشوێن ئەو بنەمایانەدا.

# تەوەری یەکەم

## دەستوری تورکیاو دەستکاری‌یەکانی

عەباس خۆشناو*

بەرایی

ئەم لێکۆڵینەوەیە لەپەیوەندیی نێوان دەستورو پەرلەمانی تورکیاو پەیوەندیی نێوان پەرلەمان (دەسەڵاتی یاسادانان)و دەسەڵاتی راپەڕاندن دەکۆڵێتەوەو چۆنێتیی بەڕێوەچونی پرۆسەی سیاسەت لەلایەن هێزە سیاسی‌یەکانەوە شیدەکاتەوە. بەم پێودانگە لێکۆڵینەوەکە بەسەر سێ توێژینەوەدا دابەش کراوە، لەیەکەمیاندا لەپەیوەندیی نێوان دەستوری تورك‌و ریفۆرمەکان کۆڵراوەتەوە بەو پێیەی کەریفۆرمەکان بنەماو پرنسیپە سەرەتایی‌یەکانی پەیڕەوکردنی دەستور پێکدێنن، دوەمیشیان بۆ لێکۆڵینەوەی پەیوەندیی نێوان دەستورو پەرلەمان‌و پەیوەندیی نێوان ئەم دواییەیان‌و دەسەڵاتی راپەڕاندن تەرخان کراوەو لەسێیەمیشیاندا دیراسەی قانونەکانی هەڵبژاردن کراوەو لەدەستکاری کردنیان‌و مەبەست لەو دەستکاری کردنانە کۆڵراوەتەوە.

---

* ماستەر لەبواری پەیوەندیی نێودەوڵەتان دا.

## ١-١ : دەستورو ریفۆرمەکان

سەردەمی دەستور کە لەسەرەتای سەدەی ١٩دا دەستی پێکرد ، ئەڵقەیەکی نوێی زنجیرەی دورو درێژی مێژوی تورك پێکدێنێ. هیچ یەکێ لەدەستورەکانی تورکیا دور لەڕاستی‌یەکانی ئەم نەریتە درێژخایەنە سەری دەرنەهێناوە. زۆربەی جاریش، ئەڵقە هەرە نزیکەکانی ئەم نەریتە ئەو ریفۆرمانە بوە کە بەتورکی پێیان وتراوە ((تەنزیمات))، تا ئەو سنورەی کەقۆناغێکی دیاریکراوی مێژوی عوسمانی کەئەو ریفۆرمانەی تێدا کەوتۆتە گەڕ. بە ((سەردەمی تەنزیمات)) ناوی دەرکردوە. ئاشکراشە کە ئەو ریفۆرمانە لەژێر تینی سێ فاکتەردا هەڵسوڕاون. یەکەمیان هەوڵدانی دەوڵەتانی رۆژئاوا بوو بۆ بردنی هەندێ لەنیشانەکانی بیری رۆژئاوایی بۆ ناو تورکیا (زمان، کەلتورو بەتایبەتی ویژەی شۆڕشی فەرەنسا)و ئاشناکردنی تورکیا بەهەندێ قانونی رۆژئاوایی. ئاسەواری ئەم مەسەلەیە لەیاداشتەکانی خالیدە ئەدیب* هەستی پێدەکرێ کەتێیدا هاتوە ((دەوڵەتە ئەوروپایی‌یەکان بیرو ئەندێشەی مۆدێرنیان بۆ تورکیا دابین کردو گیانێکی نوێیان بە بەری نوسەرانی تورکدا کرد))[1].

فاکتەری دوەم هەوڵدانی تورکیا بوو بۆ بەدەستهێنانی روخسارەکانی ژیانی رۆژئاوایی لەسەدەی هەژدەهەمەوە، بەتایبەتی ئەو روخسارانەی دەبنە مایەی زیادبونی کارایی‌ی هێزە سوپایی‌یەکانی لەڕێگەی وەرگرتنی تەکنەلۆژیای نوێ‌و تازەکردنەوەی هەندێ لەدامودەزگاکانی کارگێڕان وەك سیستەمە کارگێڕی‌یەکانی پارێزگاکان‌و گومرگ‌و دامەزراندنی دەزگای نوێی وەك

---

*خالیدە ئەدیب نوسەرێکی ئازادی تورکەو پەروەردەی دەستی هۆزانڤانی تورك نامق کەماڵە، لەچارەگی یەکەمی سەدەی بیستەمدا لەنوسینەکانیدا بانگەشەی بۆ پێویستی‌ی هۆشیارکردنەوەی ژنانی تورك کرد، یەکێ بوو لەدڵسۆزترین لایەنگرانی حزبی ئیتیحادو تەرەقی‌و دواتریش پشتیوانی‌ی لەجوڵانەوەی کەمالیستی کرد.

[1] محمد زكي عبدالقادر، الحرية والكرامة الانسانية، القاهرة، ١٩٥٩، ص ٢٣٠.

نەخومەنی دەوڵەت. زۆربەی هەرە زۆری ئەو ریفۆرمانە تارادەیەك زۆر لەرژێمی فەرەنسی وەرگیران[٢]. ئەوە جێی تێرامانە کەفوئاد پاشای سەدری ئەعزەمی زەمانی سولتان عەبدولعەزیز لەنامەیەکدا بۆ سولتان عەبدولعەزیز، لەرەوتی هەڵرشتنی بیرو بۆچونو پێشنیارەکانی سەبارەت بەچاککردنی کاروباری دەوڵەتی عوسمانی، نوسی بووی ((..وڵاتانێك کە گەورەم حوکمیان دەکا، هەمو مەرجێکی پێویستیان بۆ بوژدانی هەر دەوڵەتێکی ئەوروپا تێدایە، بەڵام بۆ ئەوەی بتوانین سود لەو مەرجانە وەرگرین دەبیّ هەمو دامودەزگا سیاسیو کارگێڕییەکانو دەزگاکانی داد تازە بکەینەوە. لەم بارەیەوە کۆمەڵە رێوشوێنو قانونێکی کۆن هەن کەلەمەوبەر سودبەخشو بەکەڵك بوون بەڵام ئەمڕۆ نەك هەر بیّ کەڵکن بەڵکو گومانی تێدا نیە کەزیانبەخشیشن))[٣].

فاکتەری سێیەم هەوڵدانی دەوڵەتی عوسمانی بوو بۆ بەدەستهێنانی بڕواو متمانەی دەوڵەتە ئەوروپاییەکان ((ئینگلتەرە، روسیا، فەرەنسا، نەمسا)و خۆ دەربازکردن لەدەستێوەردانیان لەکاروباری ناوخۆی. لەم بارەیەوە مەدحەت پاشا پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە ((ئەگەر دەسوبرد لە راگەیاندنی دەستوردا بکەین، دەوڵەتە ئەوروپاییەکان پشتیوانیی خۆیان لەوە دەردەبڕن کەمیرنشینی سرب لەجاران زیاتر بەدەوڵەتەکەمانەوە ببەسترێتەوە، کاتێك سوپامان دەچێتە ناو بەلگراد.. چونکە ئەوەی هەموو پایتەختەکانی جیهان

---

[٢] احمد نوري النعيمي، تركيا وحلف شمال الاطلسي، المطبعة الوطنية، عمان (الاردن)، ١٩٨١، ص ٢٨.

[٣] اورخان محمد علي، السلطان عبدالحميد الثاني حياته واحداث عهده، الطبعة الاولى، مكتبة دار الانبار، الرمادي، ١٩٨٧ ص ٥٢.

بایەخی پێ دەدەن، مەسەلەی راگەیاندنی دەستورەکەمانە. کاتێك ئەو دەستورە رادەگەیەنین، هیچ گیروگرفتێك بێ چارەسەر لەدەوڵەتەکەماندا نامێنێ)) [4].

وا دانرابوو کەراگەیاندنی دەستور هەمو دژواری‌یەکان رامالێ‌و هەمو گیروگرفتەکان بەئەنجام بگەیەنێ، بەتایبەتی تەنگژە سیاسی‌یە ناوخۆیی‌یەکان کە لەگەڵ هەڵایسانی راپەرینە نەتەوەیی‌یەکانی دژی داگیرکەرە عوسمانی‌یەکاندا ئەوەندەی دی تەشەنەیان کرد، بەتایبەتی لەلوبنان (١٨٥٨)و ناوچەکانی بالکان: بۆسنیا هیرزەگۆڤینیا (١٨٦٠)، رۆمانیا (١٨٦١)، سربیا (١٨٦٢)، یۆنانی‌یەکانی‌کریت (١٨٦٦)، بولگاریا (١٨٧٦).

ریفۆرمەکان بەکردەوە لەسالی ١٨٢٦دا بەگەڕ کەوتن، کاتێك سولتان مەحمودی دوەم لە ٢٨ی مایسدا فەرمانی خەتی شەریفی دەرکرد. بەپێی خەتی شەریف سوپا سەرلەنوێ رێکخرایەوە، سوپای ئەنکەشاری (واتە سیستمە سوپایی‌یە کۆنە کلۆربوەکەی پیادەی دەوڵەتی عوسمانی) لەبەر یەك هەڵوەشێنرایەوەو لەجێی ئەو، سیستمێکی سوپایی‌ی مۆدێرن بەناوی سیستمی نوێوە دامەزرا. سەرەڕای کرچ‌و کاڵی‌ی ئەو ریفۆرمانە بەڵام لانی کەم رێیان بۆ جێبەجێ کردنی ریفۆرمی زیاتر خۆشکردو بونە هەوێنی پێشکەوتنی وڵات. لەبەر ئەوە خەتی شەریف گوڵخانە بەدرێژەپێدانی ئەو ریفۆرمانە دەژمێردرێ. گوڵخانە ناوی ئەو دەستورەیە کە کۆمیسیۆنی مستەفا رەشید پاشا بەفەرمانی سوڵتان عەبدولمەجیدی یەکەم لە ٣ ی تشرینی دوەمی ١٨٣٩دا دایڕشتوە [5].

سەرۆکی کۆمیسیۆنەکە، واتە مستەفا رەشید پاشا، لەو کەسانە بوو کەبانگەشەی بۆ رژێمێکی دەستوری‌ی پەرلەمانی دەکردو هەر لەسەرەتاوە رایگەیاندبوو کەدەوڵەتی عوسمانی لەرێگەی دەستورێکەوە کە گوزارشت

---

[4] هەمان سەرچاوە، ل ١٠٠ ١٠١.

[5] بۆ زیاتر شارەزابون لەگوڵخانە بڕوانە: الدستور، ترجمة نوفل افندي نعمة الله نوفل، المجلد الاول، المطبعة الادبية، بيروت، ١٩٨١.

لەمافی هاوولاتیان دەکا، دەباتە ئاستی دەولەتە پێشکەوتوەکان. توانیشی سولتان عەبدولمەجید قەناعەت پێ بێنی‌و دەقی دەستورەکەشی زۆر بەنهێنی ئامادە کرد[6].

بەپێی خەتی شەریف گولخانە، مافە مەدەنی‌یەکانی هاوولاتیانی دەولەتی عوسمانی، یەکسانی لەماف‌و ئەرکەکاندا بەبێ گوێدانە دینی هاوولاتیان، باج سەندن بەشێوەیەکی دادپەروەرانەو دابین کردنی ئەمن‌و ئاسایش‌و رێزو حورمەت بۆ هەموو هاوولاتیان، سەلمێنرا. دواتر لەسالی ١٨٤٠دا ریزە قانونێکی تەواوکەری خەتی شەریف گولخانە دەرکران کە لەئەدەبیاتی تورکی‌دا بە ((تەنزیمات خەیریە)) ناوبانگیان دەرکردوە، لەوانە قانونەکانی جینایات‌و کارکردن بۆ دەرکردنی قانونی مەدەنی، دەرکردنی قانونی بازرگانی، پێکهێنانی دادگای بازرگانی، رێکخستنی باج سەندن، دامەزراندنی ئەنجومەنی دەولەت بۆ بریاردان لەسەر پرۆژەی یاساکان‌و پێکهێنانی چەند ئەنجومەنێکی ناوچەیی‌ی راوێژکارانە بۆ والی‌یەکان کە لەئەندامەتی‌ی گەورە پیاوانی موسلمان‌و ناموسلمان پێك هاتبون[7]. بەهەمان شێوە، سالی ١٨٥٦ چەند بریارێکی تر کەبەختی شەریف هەمایۆن ناویان دەرکرد، باسکی بریارەکانی خەتی شەریف گولخانەیان ئەستورتر کرد، یەکسانی‌ی ماف‌و ئیمتیازات‌و پلەوپایەیان بۆ هەمو هاوولاتیانی ئیمپراتۆریەت بەبێ گوێدانە ئینتیمای دینی‌یان سەلماند[8]. بەهەر حال، بەتەنگەوە چونی ریفۆرمەکان هاوئاواز نەبوو چونکە هەموو لایەنەکان لەسەر واتای ریفۆرم یەکدەنگ‌و یەکرا نەبوون. بۆ نمونە، روسەکان مەسەلەی ئەرمەنیان لەخالی ١٦ی پەیمانی ئایاستنانۆس‌و خالی ٦١ی پەیمانی بەرلین

---

[6] عبد القديم زلوم، كيف هدمت الخلافة، الناشر بلا، ١٩٦٢، ص ٣٦.

[7] بروانە: ساطع الحصري، البلاد العربية والدولة العثمانية، دار العلم للملايين، بيروت، بدون تاريخ.

[8] هەمان سەرچاوە.

وروژاندبوو که لەهەردوکیاندا باسی پێویستی‌ی ئەنجامدانی ریفۆرمی پێویست لەویلایەته ئەرمەن نشینەکان کرابوو. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کەلەو کاتەدا زاراوەی ریفۆرم هەمو ئەو ئیمتیازو ماف‌و دامودەزگایانەی دەگرتەوە کەدەبونە هۆی هێنانە دی‌ی ئۆتۆنۆمی بۆ تایفە مەسیحی‌یەکانی دەوڵەتی عوسمانی. لەسۆنگەی ئەمەوە سوڵتان عەبدولحەمید ئەگەرچی ناچار بوو پەیمانی بەرلین ئیمزا بکا، کەڵەوەکێشانە پێی لەسەر ئەوە داگرت کەنابێ ئەم خاڵە جێ‌بەجێ بکرێ‌و لەم بارەیەوە وتی ((مردنم لەو ریفۆرمانە پێ باشترە کەدەبنە مایەی جیابونەوەی رۆژهەڵاتی ئەناتۆلیا))[٩].

بێ لەوە، هێزە کۆمەڵایەتی‌یە پارێزگارەکان ریفۆرمەکانیان بەدەسکردی ئەوروپایی‌یە کافرەکان دەزانی‌و هەندێکی‌تر پێیان وابوو هێشتا کاتی ئەنجامدانی ئەم چەشنە ریفۆرمانە نەهاتوە. سولتان عەبدولحەمیدی دوەم لەم بارەیەوە وتویەتی کەژمارەی بەرهەڵستکارانی دەستور لەریزی چینی بالادا لەلایەنگرانی دەستور زۆرتر بوە ((ئەدهەم پاشاو زۆر وەزیری تر و بەشێکی زۆری پیاوانی دەسرۆی دەوڵەت دژی ئەوەن ئازادی‌یەکی تەواو بۆ گەلێك تا گەلێك بسەلمێنرێ، تەنانەت خەیرەددین پاشای تونس لەزەمانی سەدری ئەعزەمی‌ی‌دا پێی وتم کەپێش ئەوەی خەڵکی نەزان بەقانون چەکدار بکرێن، دەبێ زۆر بیری لێ بکەینەوە))[١٠].

کەچی هێزە کۆمەڵایەتی‌یە لیبرال‌و-تارادەیەك-رادیکالەکان بەپێچەوانەوە، پێیان وابوو کەریفۆرمەکان جددی نەبون، روکەش‌و سەرپێ‌یی بون‌و لێیان رانابینرێ دەوڵەتی عوسمانی لەڕوخان‌و هەرەسهێنان رزگار بکەن. سەرەڕای ئەمە، ریفۆرمەکان لەقۆناغی بەرایی‌دا تەرکیزیان کردە سەر پێشخستنی وێژەو زمان‌و کەلتوری تورك‌و بلاوکردنەوەی خوێندن لەولاتدا. ئەوەی ئەم

---

[٩] اورخان، نفس المصدر، ص ٢١٧.

[١٠] مذكرات السلطان عبدالحميد، ترجمة وتعليق محمد حرب عبدالحميد، دار الانصار، القاهرة، ١٩٧٨، ص ٣٨.

خەتەشی گرتەبەر دوو رۆژنامە بوو کەبریتی بوون لە ((تەرجومانی ئـەحوال)) (کەساڵی ١٨٦٠ دامـەزرا)و ((تەسـویری ئـەفکار)) (کەهـەمان سـاڵ یەکـەم ژمـارەی لیٚ دەرچـو)[11]. بـەلاّم زۆری پـیٚ نـەچو بانگەشـەکردن بـۆ ریفـۆرم مۆرکێکی ((شۆڕشگێڕانەتری)) وەرگرت، چونکـە هـێزە لیبرالـەکان کەوتنـە بانگەشە بۆ دامـەزراندنی رژێمێکـی پاشـایەتیی دەسـتوری. لایـەنگرانی ئـەو ریفۆرمانـە بـە ((لاوانـی تـورك)) یـاخود ((عوسمانیـیە نوێکـان)) (یـەنی عوسمانیلەر) ناوبانگیان دەرکرد کەبەناوبانگترینیان نامق کەمال، زیا بیکـتەو ئیبراهیم شوناسی بوو. ئەوانـە گروپێکیـان لـەخۆیان پێکـهێنا، کۆمەڵەیـەکی نهێنیـیان دروست کردو پیلانیان لەدژی سـوڵتان عەبدولعـەزیز گـێڕا چونکـە عوسمانیـیە نوێکان سوڵتان عەبدولعەزیزیان بەسەرچاوەی خراپەو شەڕانگێزیی دەوڵەت دەزانیو پێیان وابوو هێنانە سەر کاری سـوڵتانێکی پێشـکەوتنخوازو پەیڕەوی کردنی دەستور تیماری هەموو دەردێك دەکا[12].

هێنری ئیلیۆتی باڵیۆزی ئینگلـیز لـەوتارێکدا کـە لـەگۆڤارێکی سـەدەی نۆزدەهـەمدا بـڵاوی کردۆتـەوە، دانـی بـەوەدا نـاوە کەخەڵکانیلـەدژی سـوڵتان عەبدولعەزیز ورووژاندوەو لەم بارەیەوە نوسـیویەتی ((بـەوەی کەچـەند سـاڵێکم لەتورکیا گوزەراند بوو، بڕوایەکی وام لـەلا پـەیدا ببـوو کەدەوڵـەتی عوسمـانی پێویستی بەریفۆرمێکی زۆرە، دەشزانی بـەبێ پێـك هێنـانی پەرلـەمانێك بـۆ جڵەوکردنی سوڵتانو وەزیرەکانی، هیچ ریفۆرمێك خێری لیٚ هەڵناوەریٚ))[13].

سـەرنەگرتنی پیلانەکـە سـەرانی گرۆپەکـەی ناچـار کـرد راکـەنو پـەنا بـۆ پاریسو لەندەن ببەن، ئیتر تا کڵپە سـەندنی تـەنگژەی سیاسـی لەحـەفتاکانی سەدەی ١٩و وردتر تا ساڵانی ١٨٧٥-١٨٧٦ نەیانتوانی بچنەوە سەر سیاسەت

---

[11] Robert Devereaux, The first ottoman constitutional Period: Astudy of the Midhat nstitution and Parliament (Baltimor: Johns Hopkins press, 1963, p-63).
[12] Ibid.,

[13] اورخان نفس المصدر، ص٧١.

لەتورکیا، بەتایبەتی پاش ئەوەی مەدحەت پاشای والی‌ی دانوبو بەغدا بوە یەکێ لەگەورەترین رێبەرانی تازەو لەلایەنگرانی دەستورو ریفۆرم. مەدحەت پاشا کە بەباوکی دەستوری عوسمانی ناسراوە، لەو بڕوایەدا بوو کەڕاگەیاندنی دەستور دەبێتە مایەی یەکسانی‌ی هەموو هاوڵاتیانی دەوڵەتی عوسمانی، ئەمەش تەگەرە لەدەستێوەردانی دەوڵەتە بیانی‌یەکان لەکاروباری ئیمپراتۆریەت دەدا، چونکە ئەوسا دەوڵەتی عوسمانی ئەو هەلەی بۆ دەرەخسێ کەمەرج بۆ چارەکردنی گیروگرفتی بالکان دانێ. لەم بارەیەوە زیاد لەبیست پرۆژەی دەستور پێشنیارکرا، لەوانە پرۆژەکەی مەدحەت پاشا کەپێشنیاری کردبوو پەرلەمانێك پێك بێ کەدوو سێ‌ی ئەندامەکانی لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردرێو سێیەکی لەلایەن حکومەتەوەو وەزیرو راوێژکارەکانیش ئەندامی ئاسایی‌ی پەرلەمانەکە بن. پرۆژەیەکی تریش هەبوو سەعید پاشاو سلێمان پاشا پێشنیاریان کردبوو بانگەشەی بۆ بەسەرچاوە وەرگرتنی دەستوری فەرەنسایی دەکرد. بەڵام پێشنیارکەرانی زۆربەی ئەو پرۆژانە شارەزایی‌ی تەواویان لەکاروباری دەستور نەبوو. بۆ نمونە، وەك سوڵتان عەبدولحەمید لەیاداشتەکانیدا باسی کردوە، مەدحەت پاشا لەهیچ دەستورێکی نەکۆڵیبۆوەو شارەزاییشی لەم بارەیەوە نەبوە، تەنها ئەوەی لەبەرچاو بوو کەحوکمی پەرلەمانی لەئەوروپا خێرێکی زۆری لێ کەوتۆتەوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لەم بارەیەوە قوڵ نەبۆوە. سوڵتان عەبدولحەمید لەم بارەیەوە نوسی‌بووی ((حەبی سلفات بەکەڵکی هەموو نەخۆشی‌و هەمو کەسێك نایەتو لەم سەروبەندەدا واتێدەگەم مەشروتیەت (دەستور) بەکەڵکی هەمو گەلو هەمو پێکهاتەیەکی نەتەوەیی نایە. جاران پێم وابوو مەشروتیەت بێ سودە، ئێستاش بڕوای تەواوم بەوە هەیە کەزیانبەخشە))[14].

---

[14] مذكرات السلطان عبدالحميد، ص ٢٤- ٣٤.

تەنانــەت ئــەندامانی لاوانــی تورکیــش کــەدروشمی دەســـتورو ژیـــانی پەرلەمانی‌یان هەلگرتبوو و بەرهەلستــیی سـولتان عەبدولحــەمیدیان دەکـرد. دیدێکی رۆشنایان بۆ ئەم چەمکانە نەبو. بەپێی دکتــۆر ئێرنسـت ئـا. رامـزور ((گومانی تیدا نیە کەلاوانی تورك زۆر لەو شتانە تێ نەدەگەیشتن کەهەولیان بۆ دەدا، چونکە لەبنەڕەتدا هیچ شتێك نەبو خۆی بۆ ئامادە بکەن، لەبەر ئـەوە بەشێکی زۆر لەو بۆچونو ئەندێشانەی بــەتورکی گوزارشـتیان لێ‌دەکـرد، نـەك هەر لێی تێ نەدەگەیشتن بەلکو سەریان لەو زاراوانەش دەرنەدەکرد کەبەکاریان دەهێنان. هەر ئەوەیان بەلاوە گرنــگ بـوو کەوشـەی لەبابـەتی ((نیشـتمان))و ((دەستور))و ((پەرلەمان)) بەکار بێنن))[15].

بـەکردەوە، لـە ٢٣ی کـانونی یەکـەمی ١٨٧٦دا یەکـەم دەسـتور لـە ١١٣ مـاددە، بەپشت بەستن بەدەستوری بەلژیك، راگەیەندرا.

دەسـتوری سـالی١٨٧٦و دەســـتورەکانی دواتــر بەهــەنگاوێکی گرنگــی پێکـهوەنانی تــەلاری سیاســیی دەولــەتی عوسمــانی-تورکــی دەژمــێردرێن، ئەگــەرچی زۆربــەی جــار پابــەندبوون بەجێ‌بــەجێ کردنــی ناوەرۆکەکـــەیان پابەندبوونێکی لاواز بوە.

## ١-٢: دەستورو پەرلەمان

تورکیاو لەمەش دورتر ئیمپراتۆریەت، یەکەم ولاتی رۆژهەلاتی ناوەراسـتە ئەنجومـەنێکی یاساداناني هەلبژێردراوی هەبێ چونکە مێژوی ئەو ئەنجومەنە بۆ سالی ١٨٧٦ دەگەرێتەوە. ئەگــەرچی ئـەو ئەنجومـەنـە سـەرکەوتن‌و ژێرکـەوتنی بەخۆوە دیوە، بەلام ئەم دەستەیەی یاسادانان هەمیشە شـوێنی خۆی لـەرژێمی سیاسیی تورکدا هەبوەو زادەی دەستورە عوسمانی‌یەکەی سالی ١٨٧٦بوە. ئەم

---

[15] ارنست أ. رامزور، تركيا الفتاة وثورة ١٩٠٨، ترجمة صالح احمد العلي، منشـورات دار مكتبة الحياة، بيروت، ١٩٦٠، ص٤٠.

ئەنجومەنە بەئەنجومەنی مەبعوسان ناوی دەرکردو لەدو ئەنجومەنی ئەعیان (هەیەت ئەیان)و ئەنجومەنی نوێنەران پێکهاتبوو. ژمارەی ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران ١١٥ نوێنەر بوو، ٦٩ یان موسڵمان بونو ٤٦ یان فەلەو جولەکە. ژمارەی ئەندامانی ئەنجومەنی ئەعیانیش ٢٦ ئەندام بوو. ئەندامانی ئەنجومەنی یەکەم لەلایەن سوڵتانەوە دیاری دەکرانو بۆ هەتا هەتایە بەئەندامی دەمانەوەو هی ئەنجومەنی دوەم لەلایەن گەلەوە لەڕێی هەڵبژاردنێکی ناڕاستەوخۆوە هەڵدەبژێردران، چونکە ئەوەی هەڵی دەبژاردن ئەنجومەنە کارگێڕییەکانی ویلایەتەکان بون، ئەویش بەپەیڕەو کردنی سیستمی دەنگدانی سنوردار چونکە تەنها ئەوانەی مولکی تایبەتیان هەبو مافی دەنگدانیان بۆ سەلمێنرابوو. ئەمەش بەو واتایە دێ کەتەنها بەشێکی دەزگای یاسادانان لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردرا[١٦].

ئەنجومەنی مەبعوسان دەسەڵاتێکی دیاریکراوی بۆ دەرکردنی یاساو سانسۆر خستنە سەر حکومەتی بۆ سەلمێنرا بوو، بەڵام سەلماندنی مافی دەرکردنی یاسایەکی تازە یا گۆڕینی یاسایەکی دەرکراو ناچاری دەکرد ڕەزامەندیی کاربەدەستان بەدەست بێنێ. هەر کات پێشنیارێکی دیاریکراویش پەسەند بکرایە، گەڵاڵەی قانونەکە لەلایەن ئەنجومەنی دەوڵەتەوە ئامادە دەکرا (کەئەنجومەنێکە لەبابەتی دەستەی ڕاوێژکاری قانونی بەمۆدێلە فەرەنسایییەکەی Conseild Etat ) (ماددەی ٥٣). ئەو یاساو چارتەرانە تەنها هێز لەوەوە پەیدا دەکەن کە کاربەدەستان یاساو چارتەرەکان پەسەند بکەن چونکە کاربەدەستان مافی موتڵەقی ڤیتۆشیان هەبو (ماددەی ٥٤).

[16] Robert Devereaux, op-cit, p-63.

هەر چۆنێك بێ، یەکلاکردنەوەی مەسەلەکان بەدەست سولتانەوە بوو چونکە لەو رژێمە دەستوورییەدا سولتان بەردی بناغەی رژێمەکەی پێك دەهێنا. ئەوە بەڵگەیە کە لەڕوی یاسادانانەوە ئەنجومەنی وەزیران- کەسولتان ئەندامەکانی دیاری دەکرد-مافی هەبوو قانونو چارتەر پێشنیار بکاتو لەکاتی نائاساییدا، کاتێك پەرلەمان نەدەبەسترا، ئەنجومەنی وەزیران دەسەڵاتی دەرکردنی ئەو ئەحکامەی هەبو کە لەئاستی قانوندا بوون، بەمەرجێك ئەو ئەحکامە دژی دەستور نەبنو بخرێنە بەردەمی پەرلەمانیشەوە کاتێك دەبەسترێ ((ماددەی ٣٦). کاتێك ناتەباییش لەنێوان ئەنجومەنی نوێنەرانو وەزیرەکان پەیدا دەبو، سولتان ئەو مافەی هەبو کەوەزیرەکان بگۆڕێ یا ئەنجومەنی نوێنەران هەڵوەشێنێتەوەو داوای هەڵبژاردنێکی نوێ بکات (ماددەی ٣٥). لەچوارچێوەی لێپرسراوەتیی جینائیو سیاسیی وەزیرەکانیشدا، وەزیر بەبێ رەزامەندیی سولتان نەدەدرا بەدادگا (ماددەی ٣١). سەبارەت بەلێپرسراوەتیی سیاسیش، دەستور بەرونیو بەئاشکرایی دانی بەم لێپرسراوەتییەدا نەنا.

زۆربەی دەسەڵاتەکانی پەرلەمان لەڕوی دەستورییەوە، بەشێوەیەکی بنەڕەتی پەیوەندییان بەمەسەلە داراییەکانەوە هەبو (بودجە، خەرجیو هیتر) (ماددەی ٩٦و ١٠٠). لەکاتی نائاساییشدا ئەنجومەنی وەزیران مافی هەبو بەپێی فەرمانێکی شاهانە خەرجییە پێویستەکان پەرە پێ بدا، بەمەرجێك دواتر لیستەکە بدرێتە پەرلەمان، لەکاتی بەسترانیدا (ماددەی ١٠١). بەپێی ماددە ناوبراوەکان، دەستوری ١٨٧٦ سولتانی کردبوە بناغەی رژێمی سیاسیی عوسمانی چونکە پەرلەمان زۆر لەو بنچینەیە دورکەوتەوە کەلیبرالەکانو داواکارانی ریفۆرم بیریان لێ دەکردەوە. بەڵام سەرەڕای هەمو شتێك دەبێ ئاوا سەیری مەسەلەکە بکرێ کەبونی پەرلەمان خۆی لەخۆیدا

پێشکەوتنێکی گـەورە بـوو بـۆ تیـۆریی سیاسـیی عوسمـانی. ئەگـەرچی ئـەو پەرلەمانە پەرلەمانێکی لاواز بوو بەڵام رازی بـوون بـەمافی گـەل لەبەشـداری کـردن لەحکومـەتدا شـێوەی سـەرەتاییی سـەلماندنی مـافی گەلـە لـــەمێژووی تورکـدا، چونکـە بـەهۆی ئـەو بەشـداربونەی گەلـەوە تاڕادەیـــەك هــەلێك بــۆ رەخنەگرتن لەبابی عالیو کۆشك سەری دەرهێنا[17]. تەنانەت ئەم ئەزمونە کەم دەسەلاتو کورت خایەنەی حوکمی دەستووریش (کەماوەی بەسترانی دوو خولی پەرلەمانەکەی، لەپێنج مانگ زیاتری نەبرد) جێی رەزامەندیو بەدڵی سوڵتان نـەبوو و زۆری نـەبرد سـوڵتان لەسـاڵی ١٨٧٨دا بـۆ ماوەیـەکی نادیـــاریکراو پەرلـەمانی هەڵوەشـاندەوەو تـا سـی سـاڵی تـر وڵاتـی بەشـــێوەیەکی تـــاکڕەو بەڕێوەبرد. لەم بارەیەوە گـالفنی پـەیامنێری رۆژنامـەی لـەندەنیی ((تـایمز)) لەڕاپۆرتـە هـەواڵێکدا نوســـیبوی کەدامـــەزراندنی حکومـــەتێکی دەســـتوری لەتورکیا ((وەك ئەوە وایە بەدەزوی لم کراسێك بچنیت))[18].

سـوڵتان لەپـەیڤینێکیدا لەگـەڵ ئوســتادی زمــانو ســەرۆکی زانکــۆی پۆدابســت پرۆفیســۆر ئــارمینیۆس دامـــیری پــەردەی لـــەڕوی هۆکـــانی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان هەڵماڵیو ئاماژەی بەوە کرد کە((ماوەیـەکی کـەم پـاش هاتنـە سـەر کـاری، ئەنجومـەنی نوێنـەرانی هەڵوەشـاندەوەو لەســۆنگەی ئەمەوە ئەوەیان خستە پاڵ کەدیکتاتۆرێکی زۆردارە. سوڵتان لەم بارەیەوە پێی وتم ((بـیری لیبرالـیزم وردە وردەو بـەدرێژاییی چـەندین سـەدە لەئـەوروپادا بڵاوبۆتـەوەو رەگـی داکوتـاوە. لـەم وڵاتـەی منیـش داوام لێدەکـەن ئـەم بیرانـە

---

[17] Ibid. p-70.

[18] Seton-Watson, R.W, Disraeli, Gladston and the Eeastern Question, London, 1935. p-30.

لەخاك‌و خۆڵی سفت‌و بێبارانی ئاسیا بڕوێنم، لەکاتێکدا ئەم خاك‌و خۆڵە ئێستا بەکەڵکی رواندنی ئەم روەکە نایەت. من ماوەیەکم دەوێ تا بەردەکان لادەبەم، درك‌و داڵ‌و گیاکەڵە ناهێڵم، ئەرزەکە بژار دەکەم، خۆڵەکە هەڵدەگێڕم‌و ئاوی دەدەم، ئەوسا ئەم شەتڵە تازەیە دەتوانێ لەم وڵاتەدا بڕوێ‌و بەبێ زیان چەکەرە بکا. بڕوام پێبکە ئەوسا کەس بەقەدەر من کەیفی بە بڵاوبونەوەو رەگ داکوتانی نایەت))[19].

هۆی دوەمی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان لەسەر زاری خودی سوڵتان دەردەکەوێ کەوتویەتی ((من یەکەم سوڵتانم لەمێژودا ئەنجومەنی مەبعوسان بکاتەوە. بەڵام کەبینیم نوێنەرەکان بەپێی پێویست کامڵ‌و تێگەیشتو نین، ئەنجومەنەکەم داخست، ئایا دەزانی چ نرخێکمان لەبری ئەنجومەنی مەبعوسانی عوسمانی داوە؟* لەم جەنگەدا سەرتاپای بالکان‌و روملیشمان لەدەسدا))[20].

پاش داخستنی ئەنجومەنەکە بیروباوەڕی لیبرالی‌ی رۆژئاوایی بەشێوەیەکی فراوان بڵاوبۆوەو خوێندکاران، رۆشنبیران، بیروکراتەکان‌و ئەفسەرانی سوپا رۆژ بەرۆژ زیاتر بەلای بەرهەڵستی کردنی رژێمدا دایاندەشکاند. لەژێر فشاری راپەڕینی میرانی مەکەدۆن، سوڵتان ناچار بوو چاو بەدەستوردا بگێڕێتەوە. لەم بارەیەوە تەحسین پاشا لەکتێبی ((بیرەوەری‌یەکانی یەڵدز))دا نوسیویەتی ((عەبدولحەمید کەوتە بیرکردنەوە لەمەسەلەی گێڕانەوەی دەستورو تەنانەت زۆر

---

[19] اورخان، نفس المصدر، ١٣٨.

*کۆبونەوەکانی ئەنجومەنی مەبعوسان، بەر لەوەی داخرێ، بوو بوونە مینبەرێك بۆ بانگەشەکردن بۆ راگەیاندنی جەنگ لەدژی روسیا، لەکاتێکدا بەشێکی زۆری نوێنەرە خوێن گەرمەکان ژێر بەژێر مەیلی کۆمەڵە چەکداری‌یە نهێنی‌یەکانی دژی دەوڵەتی عوسمانی‌یان هەبوو و تەنانەت هەندێکیان لەسەرکردەکانی ئەو کۆمەڵە نهێنی‌یانە بون.

[20] هەمان سەرچاوە، ٣٤٣.

دەستوری ئەوروپاییی هێناو بەتەرجەمەکردنیانیدا. لەم سەروبەندەدا وەرگێڕ وەلی بەگ دەستوری ئەڵمانیی وەرگێڕایە سەر زمانی تورکی. سوڵتان پاش وردبونەوە لەدەستورە ئەوروپاییەکان هەندێك کەسی راسپارد گەڵاڵەی دەستور ئامادە بکەن))[21]. ساڵی ۱۹۰۸ کار بەدەستور کرایەوە. لەسۆنگەی ئەمەوە هەندێ کەس ئەم قۆناغە، بۆ جیاکردنەوەی لەیەکەم قۆناغی دەستور، بەقۆناغی دوەمی دەستور ناو دەبەن[22].

ساڵی ۱۹۰۹ دەسکارییەکی گەوهەریی دەستوری ساڵی ۱۸۷٦ کرا بەجۆرێك کەدەسەڵاتی پەرلەمان لەسەر حیسابی دەسەڵاتی سوڵتان زیاد کرا. لەکاتێکدا پێش دەسکارییەکە سوڵتان مافی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی هەبو، کارێکی وا کرا کەهەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان پێویستی بەرەزامەندیی ئەنجومەنی ئەعیان بێ. کەهەڵیشدەوەشێنرێتەوە، دەبێ (بەپێی ماددەی ۷) لەماوەی سێ مانگدا هەڵبژاردنی تر بکرێ.

لەدەستوری دەسکاریکراودا بەشێوەیەکی رون و ئاشکرا دان بەوەدانرا کەوەزیرەکان لەبەردەم ئەنجومەنی نوێنەراندا تاك تاك و بەکۆمەڵ بەرپرسیارن و ئەو مافەش بەتەواوی بۆ هەردو ئەنجومەنی نوێنەران و ئەعیان سەلمێنرا کەدەسپێشخەری لەئامادەکردنی چارتەرو قانونەکان بکەن (ماددەی ٥۳)، مافی ڤیتۆ خستنە سەر چارتەرەکانی پەرلەمانیش لەسوڵتان سەنرایەوە، بەجۆرێك کەدەرفەت هەبوو بەزۆرینەی دوو لەسەر سێی ئەندامانی هەردو

[21] هەمان سەرچاوە. ۳۱۸.

[22] Recal okandan, Amine Hukukumuzun Ana hatlari Istanbul: I.G.H.F. yayini, 1957, p-240.

ئەنجومەن ڤیتۆکە بسڕێتەوە. بێ لەوە چیدی ڕێ بەسوڵتان نەدرا بۆ ماوەی زیاد لەدو مانگ ڕێگری لەدەرکردنی ئەو قانونانە بکا (ماددەی ٥٤).

وەك ئەنجامگیریەکی تیۆری، ئەم چەشنە دەسکاری کردنەی دەستور لێی رادەبینرا رژێمی سیاسیی عوسمانی بکاتە پاشایەتی‌یەکی پەرلەمانی‌ی لەسەر مۆدیلی ڕۆژئاوایی.

هەر چۆنێ بێ، سەردەمی لیبرالیزم بەکردەوە زۆری نەبرد چونکە دەوڵەت دیسان چۆوە سەر دەسەڵاتی تاکڕەوو حزبی دەسڕۆ. ئەوە نیشانەیە کە گروپی ئیتیحادو تەرەقی کە لەساڵی ١٩٠٨دا دەسەڵاتی گرتبوە دەست، پاش بزوتنەوەی ٣١ی مارتی ١٩٠٩ی ئەستەمبوڵ دەسەڵاتی خۆی توندوتۆڵتر کردو کەوتە کز کردنی دەسەڵاتی بەرهەڵستکارانی. لەئەنجامدا دەسەڵاتی پەرلەمان لەبەردەم دەسەڵاتی کۆمیتەی ناوەندی‌ی ئیتیحادو تەرەقی پاشاکشەی کرد بەڵام ناکۆکی‌یەکانی ناو ئیتیحادو تەرەقی یارمەتی‌ی پەرلەمانیاندا تا بەشێك لەنفوزی خۆی وەرگرێتەوە. بۆ نمونە، پێشنیاری ڕۆژی ٣١ی دیسەمبەری ساڵی ١٩١١ کە لەگەڵ ئارەزوی سەرکردایەتی‌ی ئیتیحادو تەرەقی‌دا دەگونجا، نەیتوانی زۆرینەی پێویستی دو لەسەر سێی دەنگەکان بەدەست بێنێ. بەڵام لەهەڵبژاردنی پەرلەمانی دوای ساڵی ١٩١٣، ئەندامانی ئیتیحادو تەرەقی بەتەواوی دەستیان بەسەر پەرلەمانو حکومەتدا گرتو ((کەشێکی پڕ تۆقاندنو ترسیان پێك هێناو پیاوانی خۆیان بەسەر سنوقەکانی دەنگداندا دابەش کرد. لەئەنجامدا لیستەکانیان بردی‌یانەوەو زۆرینەی ئەنجومەنی مەبعوسانیان پێك هێنا))[٢٣]. بەهۆی هەست نەکردنی کاربەدەستانی سەرکردایەتی‌ی حزب بەلێپرساوەتی لەلایەكو لەبەر پێداویستی‌یەکانی جەنگ

---

[٢٣] اورخان، نفس المصدر، ٣٢١.

لەلایەکی تردوه، دەوری پەرلەمان بەدرێژاییی ئەو ماوەیە تا بڕانەوەی جەنگی یەکەمی جیهان تارادەیەکی زۆر لاوەکیو پەراوێزی مایەوە. دوا بەدوای شکستی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەجەنگی یەکەمی جیهاندا، دەوڵەتی عوسمانی بەکردەوە هەرەسی هێناو حکومەتی ئەستەمبوڵ لەساڵانی ئاگربڕدا بەشێواوی مایەوە. لە هەمان کاتدا هەوڵ دەدرا دەزگایەکی حکومیی نوێ لەئەناتۆلیا لەسەر دەستی نیشتمانپەروەرانی دژی داگیرکەران پێکەوە بنرێ. ئەم قۆناغە کەپێی دەوترێ قۆناغی رزگاریی نیشتمان (١٩١٨-١٩٢٣) بایەخێکی زۆری بۆ مێژووی دەستوری تورکیا هەیە، چونکە لەو ماوەیەدا دەسکارییەکی زۆری دەستور کرا. پاش ئەوەی هێزی داگیرکەری هاوپەیمانان چەندین پەرلەمانتارو نیشتمانپەروەری گرتو راونا، مستەفا کەمال لە ١٨ی مارتی ١٩٢٠دا داوای کرد دەستەیەکی نوێی گۆشکراو بەدەسەڵاتێکی نائاسایی بۆ کۆبونەوە لەئەنقەرە، پێك بێ. ئەم دەستەیە ناونرا ئەنجومەنی نیشتمانیی گەورەی تورکو بەوە لەپەرلەمانی عوسمانی جیا دەکرایەوە کەهەم دەسەڵاتی یاسادانانی هەیە هەم دەسەڵاتی راپەڕاندنو بەکردەوە ئەنجومەنێکی شۆڕشگێڕی هەڵبژێردراوی خۆ بەدەستوری عوسمانی نەبەستوو بوو.

ئەم ئەنجومەنە لەساڵی ١٩٢١دا دەستی بەدارشتنی دەستور کرد. سەرەڕای کەمیی ماددەکانی ئەو دەستورە (کەتەنها لە ٢٣ مادده پێکهاتبوو)، دەشێ دەستورەکە بە بەڵگەنامەیەکی هەرە گرنگ بژمێردرێ، چونکە لەو دەستورەدا بۆ یەکەم جار ناوی پرنسیپی سەروەریی نیشتمان هات، دەستور خۆی بەتاکە نوێنەری راستەقینەی گەل ناساندو دەسەڵاتێکی زۆری لەبواری یاسادانانو راپەڕاندندا بۆ ئەنجومەن سەلماند، لەوانە ئەگەر پێویستی کرد- دیاری کردنو لابردنی وەزیرەکان (ماددەی هەشتەم).

هۆی سەلماندنی دەسەڵاتێکی زۆر بۆ ئەنجومەن لەساڵانی جەنگی سەربەخۆیی‌دا بۆ چەند فاکتەرێکی سیاسی دەگەڕێتەوە، لەوانە لابردنی سوڵتان‌و بەشێك لەدەسوپێوەندەکانی (دەبێ ئەوەش بزانرێ کەسەڵتەنەت تەنها پاش سەرکەوتنی یەکجارەکی بەسەر یۆنانی‌یەکاندا لە ٣٠ی ئۆکتۆبەری ١٩٢٢، ئنجا هەڵوەشێنرایەوە). بەهەر حاڵ، باوەڕێکی وا هەیە کەئەم حکومەتەی ئەنجومەن بەوەی کە لەڕوی سیاسی‌یەوە گونجاوتر بوە (چونکە ڕەنگدانەوەی بیروباوەڕی نیشتمانپەروەران بوە) ڕژێمێکی دیموکراتیتر بوەو گوزارشتی لەسەروەری‌ی نیشتمان کردوە. لەبەر ئەوە، مادام ئەنجومەنەکە لەویستو بڕیارەکانیدا دژی بەرژەوەندی‌ی گشتی‌ی نەبوە، بەو پێ‌یەی کەنوێنەری ڕاستەقینەی گەل بوە، هیچ پێویستی نەدەکرد سانسۆر بخرێتە سەر دەسەڵاتەکەی. ئەم دەزگا یاسادارێژە هیچ کات بەقەد قۆناغی ڕزگاری‌ی نیشتمان نفوزی سیاسی‌ی نەبوە. لەو کاتەدا بەڕاستی تیۆری‌ی سەروەری‌ی یاسادانان لەئارادا بوو، بەجۆرێك کەئەنجومەن بەتەواوی دەستی بەسەر هەمو ڕوخسارەکانی چالاکی‌ی ئیداری‌دا گرتو زۆربەی جاریش لەمەسەلەکانی ڕاپەڕاندندا لەوانە لەبواری پەیوەندی‌ی دەرەوەدا، چارتەری دەخستە بەردەم وەزیرەکانەوە[٢٤].

دەتوانرێ نەبونی حزبی سیاسی‌ی ڕێکوپێك‌و کەمی‌ی سەرکردەی حزبی لەقۆناغی یەکەمی ئەنجومەنی گەورەی نیشتماندا (١٩٢٠-١٩٢٣) بەیەکێ لەهۆیە سەرەکی‌یەکانی ئەم باڵادەستی‌یەی ئەنجومەن بژمێردرێ.

---

[24] Mumtaz Soysal, Dis politik veparlamento Ankara: A.U.S.D.F. yayini, 1969, pp-77-100.

پاش راگەیاندنی کۆمار لە ٢٩ی ئۆکتۆبەری ١٩٢٣دا باروودۆخ پێویستی بەدارشتنی دەستورێکیتر کرد، چونکە دەستوری ساڵی ١٩٢١ بەمانای وشە دەستور نەبو بەڵکو بەڵگەنامەیەك بوو مشوری گیروگرفتە دەستورییە گرنگەکانی ئەو سەردەمەی خواردبوو.

بەگشتی، دەستورە تازەکەی ساڵی ١٩٢٤ کەئەنجومەنی گەورەی نیشتمان پەسەندی کرد، زۆربەی هەرە زۆری پرنسیپە بنچینەییەکانی دەستوری ساڵی ١٩٢١ی هێشتەوە، بەو پێیەی کەئەنجومەن ((تاکە نوێنەر))ی گەلەو بەم پێودانگەش مافەکانی سەروەری جێبەجێ دەکا (ماددەی چوارەم). دەسەڵاتی یاسادانانو راپەڕاندنیش بەئەنجومەن سپێردرا (ماددەی پێنجەم)و ئەنجومەن لەرێی ئەو سەرکۆمارەوە کەخۆی هەڵی بژاردوە پەیرەوی لەدەسەڵات دەکردو مافی لەکارخستنی ئەو وەزیرانەشی هەبو کەسەرۆك دایدەنان (ماددەی حەوتەم). سەرۆکیش ئەو دەسەڵاتەی نەبو کەئەنجومەن هەڵوەشێنێتەوەو داوای هەڵبژاردنێکی نوێ بکا.

گومان لەوەدا نیە کەدەستوری ساڵی ١٩٢٤ بەناوەڕۆك دەستورێکی دیموکرات بوو بەڵام چەمکەکانی رۆسۆو زۆرینە هەمان چەمکی رۆژئاوایی دیموکراسی پێك ناهێنن، چونکە دیموکراسیی رۆژئاوایی پشت ئەستورە بەسیستمێکی ئاڵۆزی ((تەرازو راگرتن))و ((تەگەرەدان)). ئەوەش بەڵگەیە کەچەمکی ((زۆرینە)) لەدیموکراسیدا دەسەڵات بۆ ((ویستی گشتیی)) گەل دەسەلێنێ (ئەمەش لەپراکتیکدا ویستی زۆرینە پێکدێنێ). ئەم ویستەش ویستێکی رەهاو دابەشنەکراوو بێ هەڵە نیە. لەچوارچێوەی سیستمی پەرلەمانیدا ئەمە بەو واتایە دێ کە دەزگای یاسادانان نوێنەری ویستی راستەقینەی گەلە، لەبەرئەوە هەر سنوردانانێك بۆ دەسەڵاتی دەزگای

یاسادانان وەك ئـەوە وایـە سـنور بـۆ دەسـەڵاتی گـەل دانـرێ‌و لەبایـەخی کـەم بکرێتەوە. بێ لەوە، مادام ((ویستی گشتی)) هەمیشـە لەسـەر هەقـە، هیـچ کۆت‌و زنجیرێك سودی نیە.

گفتوگۆو مشتومڕی دەستوری ساڵی ١٩٢٤ گوزارشت لەبیروبۆچونی ئەو کەسـانە دەکـا کەدەسـتوریان داڕشـتوەو شـوێنی ئـەو دەسـتورەش لـەڕژێمی سیاسی‌ی تورك ئاشکرا دەکا. بۆ نمونە، کۆمیتەی ئامادەکاری دەستور ویستی بـەندێك بخاتـە نـاو دەسـتورەوە کەبەهۆیـەوە سـەرۆك مـافی هەڵوەشـاندنەوەی ئەنجومـەنی نیشتمانی‌و ڕەت کردنەوەی پێشنیارەکانی هەبێ‌و هـەر ڤیتۆیـەکی سەرۆکیش بەزۆرینەی دوو لەسەر سێ بەتاڵ بکرێ، بەڵام ئەنجومەنی نیشتمانی سەرتاپای بەندەکەی ڕەت کردەوەو ڕازی نـەبو سـەرۆك مـافی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومـەنی هـەبێ. سـەبارەت بەدەسـەڵاتی ڤیتـۆش بـەجۆرێك ئـەو دەسـەڵاتەی تەنگەبەر کرد کەئاسایی بوو ڤیتۆی سەرۆك بەزۆرینەیەکی کەم نەك بەزۆرینەی دوو لەسەر سێ بەتاڵ بکرێ. نمونەیەکی دیکەش ڕەت کردنەوەی ئەو پێشنیارەی کۆمیتەی ئامادەکاری دەستور بوو کەدەیویست ماوەی سەرۆکایەتی ٧ ساڵ بێ بەڵام ئەنجومـەن ماوەکەی کردە ٤ ساڵ بۆ ئەوەی لەگەڵ ماوەی خولی ئەنجومـەندا بگونجێ.

ناڕەزایی لەماددەیەکی تری دەستوریش هەبو، ئـەویش پێشـنیاری کردنـی سەرۆك بوو بەفەرماندەی هێزە چەکدارەکان، چونکە زۆربـەی پەرلـەمانتارەکان ئەمـەیان بەپێشێل کردنی سەروەری‌ی نیشتمان دایە قەڵەم، لەبەرئەوە ماددەکـە

دەسکاری کراو سەرکردایەتیی باڵای هێزە چەکدارەکان بەئەنجومەنی نیشتمانی سپێردرا[٢٥].

لەخولی دوەمدا (١٩٢٣-١٩٢٧) ئەنجومەنی نیشتمانی بەوریاییەوە ویستی ماف و دەسەڵاتە دەستورییەکانی خۆی بپارێزێ بەرامبەر بەزیاد بونی نفوزی دەسەڵاتی راپەراندن کەخۆی لە ((کۆمەڵەی کەمالیست))و ئەو کەمالیستانەدا دەنواند کەوردە وردە دەستیان بەسەر ئەنجومەن و سەرتاپای رژێمی سیاسیدا گرتبوو[٢٦]، ئەمەش دەوری ئەنجومەنی نیشتمانیی کەم کردەوەو کردی بەدەورێکی لاوەکی. دەربارەی دەسکاری نەکردنی دەسەڵاتی ئەنجومەنیش، ئەتاتورک لەدانیشتنێکی یەکەم ئەنجومەنی نیشتمانیدا وتی ((منم کەئەم ئەنجومەنەم کۆکردۆتەوە، منم کەدروستم کردوە... کەس هەیە حەز نەکا دەسکردی خۆی بەپوختی ببینێ؟ ئێوە تەنها رێز لەئەنجومەن دەگرن، بەڵام من بێ لەوە رێز لەدەسکردی دەستی خۆم دەگرم))[٢٧].

بەڵام سەرەرای ئەمە، ئەفسانەی ((سەروەریی یاسادانان)) بەرەسمی درێژەی کێشا چونکە حکومەت بەرەچاوکردنی رەزامەندیی ئەنجومەن هەوڵی دەدا بریارەکانی دارێژێ و وردە وردە چیدی پێویستی بەوە نەکرد ئەنجومەن بریارەکان پەسەند بکات[٢٨].

---

[25] Sunakili, Turkish constitutional Develo pmnets and Assemble Debates of the Constitution of 1929 and 1961 (Istanbul Roberts colleg Research center, 1971) pp-130-63.

[26] Frederik E.Frey, the Turkish Political Elite (Cambridge; M.I.T. press, 1965), p-390.

[٢٧] ضابط تركي سابق، كمال اتاتورك الرجل الصنم، ترجمة عبدالله عبدالرحمن، مؤسسة الرسالة، الطبعة الثالثة، بيروت، ١٩٨٨، ص ١٨٦ ١٨٩.

[٢٨] Soysal, op-cit, pp-105-119.

بەپێی پرنسیپی سەروەریی دەستور، دەشێ هەمو شتێك بابەتی چالاکییەکانی دەستەی یاسادانان بێ بەمەرجێك دژی دەستور نەبێ. لەدەستوری ساڵی ١٩٦١یش تەئکید لەسەر ئەو سەروەرییە کرایەوەو لەو دەستورەدا دەستەی یاسادانان شوێنێکی دیاری بۆ خۆی لەرژێمی دەستوریی تورکیادا مسۆگەر کرد (ماددەکانی ٥، ٩٧، ٨١، ٨٣، ٨٥، و ١٤٧)، بەم پێودانگە دەستور رازی نەبوو مافی بەشداری کردن لەیاسا دارشتن بۆ دەسەڵاتی راپەڕاندن بسەلێنێو ئەو دەسەڵاتەی تەنها بۆ ئەنجومەنی نیشتمانیی گەورە سەلماندو رێی نەدا هیچ لایەنێك لەم کارەدا جێی بگرێتەوە (ماددەی پێنجەم). بێ لەوە، دەستوری تورك پەیڕەویی لەسیستمێکی پەرلەمانیی سنور بۆ کێشراو کرد، چونکە رێی نەدا گەل راستەوخۆ بەشداری لەدەرکردنی یاسادا بکا. تەنانەت لەدەسکاری کردنی دەستوریش هانا نەبرایە بەر ریفراندۆم. تاکە مەسەلە کەکەس نەیوێرا پێیدا بچێتەوە پێویستیی پەرلەمان بوو بەزۆرینەیەکی لێوەشاوەو لێهاتوو.

بەهەر حاڵ، ئەوەی بۆ دەسەڵاتی راپەڕاندن مایەوە، لەروی دەستورییەوە دیاری نەکراوە چونکە ئەو بوارانەی کاریان پێ دەکا دیاری نەکراونو زۆربەی کارو سیستمەکانی دەبێ چوارچێوەیان بۆ دیاری بکرێ بۆ ئەوەی لەگەڵ قانونەکاندا هاوجوت بن، بەبێ ئەوەی ئەمە بەمانای سەلماندنی مافی یاسا دەرکردن بێ. ئەوە رونە کەدەسەڵاتی دارشتنی قانونی دەسکاری کردنی چارتەرو سیستمەکان لەدەستوری ساڵی ١٩٧١دا بەرێزەوە ناوی هاتوە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەدەرەتانی سەلماندنی مافی یاسادانان لەسیستمی دەستوریی تورکیا هێشتا لەزۆربەی رژێمە دیموکراتەکان تەنگەبەرترە.

لەروی تیۆرییەوە، دەستوری تورك نەیتوانیوە هیچ دەسەڵاتێکی یاسادانان بۆ دەسەڵاتی راپەڕاندن بسەلێنی، بەتایبەتی لەتەنگاویو ئاشوبدا. بەڵام

لەئەزمونە کردارەکی‌یەکاندا دەبینین لەکاتی جەنگی دوەمی جیهاندا ئەنجومەنی نیشتمانی دەسەڵاتێکی رێکخراوەیی‌ی فراوانی لەبواری ئابوری‌و دارایی‌دا بۆ حکومەت سەلماند. ئەم دەسەڵاتە پاش کارکردن بەدەستوری ۱۹٦۱، لەلایەن دادگای دەستوری‌یەوە هەڵوەشێنرایەوە. بەجۆرە، لەبواری یاسادانانی تورکدا هیچ تەگەرەیەکی پراکتیکی یا گەلی لەبەردەمی دەسەڵاتی یاسا دارشتندا نیە، بەڵام دەستوری ساڵی ۱۹٦۱ لەبوارێکی گرنگدا لەدەستوری ساڵی ۱۹۲٤ لایدابوو، ئەویش بەوەی کەسیستمێکی بۆ چاوگێڕانەوەی دادگا بەدەستورایەتی‌ی قانونەکان ساز کردبوو. لەم بوارەدا، دەستەی یاسادانان لەروی قانونی‌یەوە لەسەر مەودای دور هیچ دەسەڵاتێکی بۆ نەمایەوەو وەك هینی ساڵی ۱۹٦۰ی لیّ هات یاخود سەروەری‌یەکەی (وەك دادگای دەستوری بۆ چوە) بەدەستورەوە بەستراوەتەوە.

دەستوری ساڵی ۱۹٦۱، کە دودڵ بوو لەسەلماندنی ئیمتیازات بۆ یاسادانان لەبەرامبەر دەسەڵاتی راپەڕاندندا، لەوە نەدەپەنگایەوە کەهەردو دەسەڵات بخاتە ژێر کۆنترۆڵی دادوەری‌یەوە. بێ لەسیستمی چاوگێڕانەوەی دادوەری، دەسکاری‌یەکانی دەستوری ساڵی ۱۹٦۱ هەیکەلی دەستەی یاسادانانیشی گرتەوە. بەم پێودانگە ئەنجومەنی نیشتمانی‌ی گەورەی تورك لەدو دەستە پێك دەهات کەبریتی بون لەکۆمەڵەی نیشتمانی‌و ئەنجومەنی‌ی پیرانی کۆمار، بەڵام دەستوری ساڵی ۱۹٦۱ وازی لەتاك ئەنجومەنی دەستوری پێشو هێناو دەستەیەکی یاسا دارێژی جوت ئەنجومەنی‌ی پێك هێنا، ئەگەرچی یەکدەنگی‌یەکی شایستەی رێز لەنێوان دانەرانی دەستوری ساڵی ۱۹٦۱دا هەیە کەهەمویان ویستویانە دەستەیەکی تری دەسەڵات ئسلوبی خۆی هەبێ لەهەڵبژاردندا بۆ بەرپەرچ دانەوەی کۆمەڵەی نیشتمانی. لەم بوارەدا کۆمیسیۆنی ئستەمبوڵ یاخود کۆمیسیۆنی ئۆنەر (بەناوی سەرۆکەکەیەوە)—

کە لەمامۆستاکانی زانکۆ پێك هاتبوو ــ کەوتە گەڕ بۆ ئامادەکردنی پرۆژەی دەستورێك پێش پێکــەوەنانی کۆمەڵــە ئەسـڵی‌یەکەو پێشنیاریشــی کــرد ئەنجومــەنێکی دیکــە پێك بــێ کــە بەشــێوەیەکی جوزئــی پشــت ئەسـتور بــێ بــەدەنگدانی گــەل. لــەچوارچێوەی ئــەم پێشــنیارەدا ســێ یــەکی ئــەندامانی ئەنجومــەنی پیران لەلایــەن ئــەو دەنگدەرانــەوە هــەڵدەبژێردران کــە لانــی کــەم ناوەندی‌یــان تــەواو کردبــوو، باقی‌یەکەشــی لەلایــەن چــەند رێکخراوێکــەوە هەڵدەبژێردران. کۆمەڵەی بنچینەیی ئەم پێشنیارەی رەت کردەوە چونکە لەگەڵ پرنسیپەکانی دیموکراسیدا نەدەگونجاو ئەنجومــەنی دوەمــی هــەڵبژارد کــە لەبنەڕەتدا لەویستی گەلەوە هەڵدەقولاً، بەلاًم دەسەلاًتی ئــەو ئەنجومەنــە لــەوە زیاتر تەنگەبەر کرا کە کۆمیسیۆنی ئەستەمبوڵ پێشنیاری کردبوو[٢٩].

سەربار، دەسـتوری سـاڵی ١٩٦١ ئەنجومــەنی ئــەمنی قــەومی‌ی تورکیــای دروست کرد بۆ ئەوەی بەکەڵکی نوێنەرایەتی کردنی دەنگی جەنەڕاڵــەکان بــێ لەرژێمی سیاسیدا. دەستور دەیویست لەرێی ئەم ئەنجومەنەوە گفتوگۆی نێوان فــەرماندە ســوپایی‌یەکان‌و وەزیــرە مەدەنی‌یــەکان ئاســانتر بــەرێوە بچــێ‌و ئامۆژگــاری بخرێتــە بــەردەم ئەنجومــەنی وەزیرانــەوە بــۆ بڕیــاردان ســەبارەت بەکاروباری ئەمنی قــەومی. ئــەم دەورەش دوا بــەدوای کودەتــای ســاڵی ١٩٧١ لەرێی گۆڕینی دەســتورەوە جێگیر کــرا، چونکــە دەســتور ئــەوەی تێدا هــات کەپێویستە لەسەر ئەنجومەنی ئەمنی قەومی بۆچونــی پێویســت بــۆ بڕیــاردان بخاتە بــەردەمی ئەنجومــەنی وەزیرانــەوە. یــەکێ لەنوســەرەکان گفتوگــۆی پێش کودەتــای ســاڵی ١٩٨٠ی نێــوان ســەرەك وەزیــران‌و ئەندامــە ســـوپایی‌یەکانی

---

29 Ergun ozbudun, parliament in the Turkish political System, Journal of Sonth Asian and Middle Eeastern Studies, vol. II, No.I, 1970, p-55.

ئەنجومەنەکەی بەنمونە هێناوەتەوە، چونکە لەو گفتوگۆیەدا سەرەك وەزیران پێی لەسەر ئەوە داگرت کەئەنجومەنی ئەمنی قەومی تەنها دەسەڵاتی ئامۆژگاری کردنی هەیە. ئەندامە سوپاییەکانیش بەنابەدڵی بەمە رازی بوون ((ئەگەر ئامۆژگاری قبوڵ نەکرایە... تەقینەوە روی دەدا))[30].

بەهەر حاڵ، هەندێ لێکۆڵیاری سیاسی بۆ شیکردنەوەی ئاڵۆسکاوییە هەیکەلییەکانی رژێمی سیاسیو سەرهەڵدانەوەی زەبروزەنگ دەچنەوە سەر دەستوری ١٩٦١ کە رێبەرە رۆشنبیرەکانی تورکیا بۆ چارەسەرکردنی هەڵەکانی عەدنان مەندریسی سەرەك وەزیران دایاننابوە. لەم بوارەدا جەنەراڵ کینان ئیڤرین سەرۆکی دەستەی ستادی سوپای تورك کە لە١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠ بەکودەتا دەسەڵاتی گرتە دەست ئاماژەی بەوە کرد کە ((دەستوری ١٩٦١ نەرمو نیانتر بوو. لەبەر ئەوەی زەرەرمان لێ کردو کەوتینە کار بۆ دەستێوەردانی ١٢ی ئەیلول))[31].

هەندێ لەمامۆستاکانو رۆژنامەوانانی تورك وای بۆ چون کەعەیبەکە لەدەستوردا نەبو، بەڵکو لەرێبەرە سیاسییە کۆنەکان بوو چونکە حزبە سیاسیە بنەڕەتییەکان بەرژەوەندیی جیاجیایان هەبوو، لەلایەن ئەو کەسانەوە بەرێوە دەبران کەبایەخیان بە دابین کردنی پێداویستییە ماددییەکانو قازانجە کورت خایەنەکان دەدا لەسەر حیسابی ریفۆرمکاریی هەیکەلی درێژخایەنو نەشیاندەویست دامودەزگای پەرلەمانی پێك بێنن کە لەرێیەوە پەیرەوی لەئازادیی سیاسی بکرێ.

---

[30] Nicbolas S. Ludington and James W. Spain, Dateline Turkey: the case for Patience, foreign policy, No.50, spring 1993, p-159.

[31] Ibid, 156.

## ١-٣ : دەستورو یاساکانی هەڵبژاردن

پاش برانەوەی دوەم جەنگی جیهان وردە وردە هەلی هاتنەکایەی رژێمێکی فرەحزبایەتی لەتورکیا چەکەرەی کرد. عیسمەت ئینونو لەم بارەیەوە پەنجەی بۆ پێویستیی بوونی ئۆپۆزیسیۆنی حزبی درێژکردو پیّی لەسەر ئەوە داگرت کەدەبیّ سیستمێکی هەڵبژاردنی گشتی پیادە بکریّ بۆ ئەوەی پەرە بەرژێمی دیموکراتی تورکیا بدریّ[٣٢]. پارتی دیموکرات پشتیوانیی لەدەسپێشخەرییەکەی ئینونو سەبارەت بەپەیدابونی چالاکیی سیاسیی پشت ئەستور بە فرە حزبایەتی کردو لەو یاداشتەدا کە لە٧ی ئایاری ١٩٤٥دا بلاّوی کردەوە وتبوی ((گومان لەوەدا نیە کەئەمڕۆ بیروباوەڕی دیموکراسی سەرتاسەری گەل دەبزوێنیّ لەسەر کۆمارەوە تا بچوکترین هاوولاّتی. مەگەر بزوتنەوەی دیموکراتەکانی سەراپای دنیا سەرکەوتنیان بەدەست نەهێناوە؟ مەگەر پرنسیپی ڕێزگرتن لەئازادییە دیموکراتییەکان خەریك نیە پشت بە (گرەنتیی نێودەوڵەتی) ببەستیّ))[٣٣]. لەسێبەری ئەو دەسپێشخەریو هەلومەرجەدا هەڵبژاردنی گشتیی ساڵی ١٩٤٦ کراو دەوڵەتیش کۆمەڵە قانونێکی بۆ ڕێکخستنی هەڵبژاردن دەرکرد. سەیر لەوەدایە کەدەوڵەت بۆ هەڵسوڕاندنی هەڵبژاردنی دیموکراتی شارەزاییی پێویستی نەبوو. بیّ لەوە، خەڵکانی روناکبیرو زۆربەی خەڵکانی سادەش شارەزاییيان لەم بارەیەوە نەبوو.

---

[32] Gulek Kasim, Democracy Takes Root in turkey, Foriogn Affairs, vol. 30, No.I, October, 1951, p-139.

[٣٣] أحمد نوري النعيمي، السياسة الخارجية التركية بعد الحرب العالمية الثانية، دار الحرية، بغداد ١٩٧٥، ص٨٢.

لەڕاستیشدا لەو ماوەیەدا حزبی بەرهەڵستکاری دیکە هەبو بەڵام لەبەر سەر دەرنەکردنیان لەم قانونانە خۆیان بۆ هەڵبژاردن نەپاڵاوت[٣٤].

قانونە نوێکانی هەڵبژاردن پەیڕەوییان لەسیستەمی زۆرینەی کەمو مەڵبەندی گەورەی هەڵبژاردن کرد کەسیستەمی دەنگدانی زۆرایەتیی یەك خولی لێ پێکدێ.

پاشان لەڕەوتی هەوڵداندا بۆ دۆزینەوەی رێوشوێنێك بۆ سنورادنان بۆ خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات، وەك ئەوەی لەگەڵ عەدنان مەندرێسی سەرەك وەزیرانی پێشودا لەدەستوری ١٩٦١دا رویدا. سیستەمی هەڵبژاردنی رێژەیی پەیڕەو کرا بۆ ئەوەی ببێتە مایەی پەراگەندەییی سیاسی (و کەم کردنەوەی دکتاتۆریەتی دەسەڵاتی راپەڕاندن)و تەگەرەدان لەداشکاندنی حکومەتەکانی ئایندە بەلای یاسادانانەدا. لەسایەی ئەو سیستەمەی هەڵبژاردندا هیچ شتێك حزبە لێك نزیکەکانی هان نەدەدا یەك بگرن. لەلایەکی دیەوە سیستەمی هەڵبژاردنی رێژەییی ساڵی ١٩٦١ لەسیستەمەکانی تری هەڵبژاردن زیاتر توانای بڵاوە پێکردنی هەبوو، چونکە بەجۆرێك هانی تاکڕەویی دەدا کەحزبەکانی پچڕ پچڕ دەکرد، بێ لەوەی کەنوێنەرایەتیی گشت لاییش بەکردەوە نەدەکەوتە ژێر کاریگەریی دەنگدانەوە. بەگۆڕینی سیستەمی هەڵبژاردن، هیچ یەکێ لەو حزبانەی لەهەڵبژاردنی ١٩٦١دا بەشداربوون، نەیانتوانی زۆرینەی رەهای کورسییەکانی کۆمەڵەی نیشتمانی بەدەست بێنن. ئەمە ئەو حزبە سەرەکییانەی عەدالەتو پارتی گەلیشی گرتەوە کەجاران

---

[34] Reed, Ahoward, Anew Force in Democration Turkey, the Middle Ecast Tournal, vol. 7, No I, 1953, p34.

بەهەردوکیان ۹۰٪ی سەرجەمی دەنگی دەنگدەران و ۹۸٪ی کورسی‌یەکانی پەرلەمانیان بەدەست دەهێنا.

لەهەڵبژاردنی ١٤ی ئایاری ١٩٥٠دا پارتی دیموکرات زۆرینەی رەهای بەدەست هێناو ٥٥٪ دەنگەکانی مسۆگەر کرد بەرامبەر بە ٤٢٪ بۆ پارتی گەلی کۆماری تورکیا. حزب و گروپە سەربەخۆکانی تریش ٣٪ یان بەدەست هێنا. بەجۆرە، پارتی دیموکرات زۆرینەی کورسی‌یەکانی پەرلەمانی بەدەست هێنا، ٤١٠ کورسی‌ی لەئەنجومەنی نیشتمانی‌ی گەورەی تورك بۆ خۆی مسۆگەر کرد بەرامبەر بە ٦٩ کورسی بۆ پارتی گەلی کۆماری تورکیا[٣٥]. سەرەڕای ئەمە، ئەو حزبانە لەسایەی سیستمە تازەکەی هەڵبژاردندا نەیانتوانی وەك حزبی زۆرینە حوکم بکەن، چونکە خودی رژێم نەیدەتوانی زۆرینەی جێگیر مسۆگەر بکات. لەئەنجامدا تورکیا ژمارەیەکی زۆر حکومەتی بەخۆوە بینی کەزۆری نەدەبرد هاوپەیمانێتی‌یەکەیان هەرەسی دەهێنا. ئەمەش لێکۆڵیارێکی هانداوە ئەم سیاسەتە بە ((سیاسەتی تەنگژە)) ناوزەد بکات[٣٦].

بەهەر حاڵ، دەسکاری کردنی قانونی هەڵبژاردن لەساڵی ١٩٥٧دا لەلایەن پارتی دیموکراتەوە بەڵگەی ئەوەیە کەهەڵبژاردن کاری کردۆتە سەر هەیکەل و پێکهاتەی حزبەکان. بەپێی دەسکاری کردنی قانونی هەڵبژاردن کەپارتی دیموکرات ئەنجامی‌دا، قەدەغە کرا حزبە سیاسی‌یەکان لەکاتی هەڵبژاردندا پشتی یەکتری بگرن و ببنە هاوپەیمانی یەکتری. مەبەستی پارتی دیموکرات لەم قانونە رێ گرتن بوو لەهاوپەیمانێتی‌ی سێ حزبەکەی ئۆپۆزیسیۆن کە

---

[35] Ergun ozbundun, The Turkish party system: institutionalization, polarization, and Fragmentation, middle Eastern studies, vol-17. No-2, April 1991, p229.

[36] Gulek, Kasim, op-cit, p-34.

بەتەمابوون بەیەك لیست دابەزنە هەڵبژاردن. بەم دەسکاری‌یە پارتی دیموکرات لەهەڵبژاردنی ١٩٥٧دا خۆی لەئەگەری دۆڕان رزگار کـرد. بـێ لـەوە گۆڕینـی سیسـتمەکانی هـــەڵبژاردن کــاری کـردە ســەر یـەکرێزیی حزبــەکان. لــەم سـەروبەندەدا تێبینـیی ئـەوە دەکـەین کـە لەهـــەڵبژاردنی ســاڵانی ١٩٦٥و ١٩٦٩دا حزبە لاوەکی‌یەکان لەگـەڵ حـیزبی عـەدالـەتدا یـەکیان نـەگرتبۆوەو سەرەنجام هیـچ ئیئتیلافێکـی کاریگـەریان پێـك نـەهێنا. رەنگـە دروسـت بـێ سیستمی هەڵبژاردنی رێژەیی بەدەنگدانێکی نایەکلاکەرەوە بژمێردرێ، چونکە لـەکاتێکدا رێ دەدا هـەمو حزبێـك سـەربەخۆیی‌یەکی تـەواوی لەهــەڵبژاردنیدا هەبێ، بەدەگمەن زۆرینەی رەها بۆ هیچ حزبێك دەسەلمێنێ، ئەمـەش حزبـەکان هـاندەدا لـەناو پەرلـەماندا فراکســیۆن دروســت بکــەن. نــاکۆکی‌ی نێــوان هاوپەیمانێتی لەکاتی هەڵبژاردن‌داو هاوپــەیمانێتی لـەناو پەرلـەماندا بەڵگـەی رون بوو لەسەر ناپایەداریی زۆرینە حکومی‌یەکانی تورکیا. بۆ نمونە، زۆر جار لەناو پەرلەماندا حزب نەیتوانیوە تۆکمەیی‌ی خـۆی بپـارێزێ چونکـە ئەندامـە حزبی‌یــە پەرلــەمانتارەکان دژی پێشــنیارێك دەنگیــان داوە کەحکومــــەتی حزبەکەی خۆیان خستویەتی‌یە پێــش پەرلـەمان. خشـتەی ژمـارە ١ گوزارشـت لەدژە دەنگدانی نـاو پەرلـەمان دەکـا کەلەسـایەی رژێمـی تـاك حزبـی‌دا هیـچ سودێکی لێ نـابینرێ بـەڵام ئـەو دەنگدانـە لـەقۆناغی فرەحزبـی‌دا تاڕادەیـەك مەغزای خۆی هەیە[37].

ســەرەڕای ئەمــە، هەڵوێســتی دژە دەنگــدان یــان دەنگــدان لـــەدژی پێشـنیارەکانی حکومـەت بەدەگمـەن مایـەوە. بـۆ نمونـــە، لەهەشــتەم خــولی ئەنجومـەندا (١٩٤٦-١٩٥٠) تەنـها ٩٥ ئـەندام لەسـەرجەمی ٤٣٥ ئـەندامی

[37] Frederick W.Frey, op-cit, p.362.

پارتی گەل ـ واتە بەرێژەی ٢٢٪ی ژمارەی پەرلەمانتاران ـ لانیکەم یەك جار لەدژی پێشنیارەکانی حکومەتەکەیان دەنگیان داو بەهەمان شێوە لەدەیەم خولی ئەنجومەندا (١٩٥٤-١٩٥٧) دەبینین رێژەی پەرلەمانتارانی پارتی دیموکرات کەدژی پێشنیارەکانی حکومەتەکەیان دەنگیانداوە تەنها ١٤٪ بوە (خشتەی ژمارە ١).

بێ لەوە، حزبەکان لەگێچەڵە گرنگەکاندا تۆکمەیی یەکی لەرادەبەدەر نیشاندەدەن، بەتایبەتی لەو گێچەڵانەدا کە کار دەکەنە سەر ژیانی حکومەت. بەم پێودانگە بە بەکارهێنانی پێوانەی ((تۆکمەیی)) دەتوانرێ ئەندازەی تۆکمەیی ی حزبایەتی ی ناو کۆمەڵەی نیشتمانی پێوانە بکرێ. شیکردنەوەی سەرەنجامەکانی خوێندنەوەی ناوەکانی دو دانیشتنی ١٩٦١-١٩٦٢و ١٩٦٥-١٩٦٦ی کۆمەڵەی نیشتمانی، وەك لەخشتەی ژمارە دو رون کراوەتەوە، دەری دەخا کەدو حزبە سەرەکی یەکەی پارتی گەلی کۆماری تورکیاو حزبی عەدالەتو هەروا پارتی کاری تورکیا کەحزبێکی بچوك بوو، لەحزبە بچوکەکان تۆکمەتر بون، سەرباری ئەمە، حزبەکان هەوڵدەدەن تۆکمەیی یەکی زۆرتر نیشان بدەن کاتێك لەحکومەتدا دەبن زیاتر لەوەی کە لەریزی ئۆپۆزیسیۆندا دەبن[٣٨].

بونی چەند زۆرینەیەکی حزبی ی ئاشکراو چەند حزبێکی کاریگەر بۆ ماوەیەکی کەم هۆی کەمکردنەوەی نفوزی سیاسی ی دەستەی یاسادانان بەرامبەر بەدەسەلاتی راپەراندن. بەرامبەر بەمەش دەکرێ بوترێ کەلاواز بوون یان داخورانی زۆرینە حزبی یەکان دەبێتە هۆی زیادبونی نفوزی دەستەی یاسادانان. بۆ ساغ کردنەوەی ئەم گریمانەیەش چەند بنەمایەکمان هەیەو لەم

---

[38] Ergun ozbudun, op-cit, p.64.

سەروبەندەدا هەڵبژاردنەکانی چوار خولەکەی کۆمەڵەی نیشتمانی دوا بەدوای کودەتای ساڵی ١٩٦٠ ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کەدو خول لەو خولانە بەزۆرینەیەکی حزبیی رون بەڕێوە چونو دو خولەکەی تر بەبێ هیچ زۆرینەیەکی حزبی. ساڵی ١٩٧٥ Weinbaum تێبینیی کرد کە لەماوەی نێوان ١٩٦١-١٩٦٥داو لەسایەی پێداویستییەکانی هاوپەیمانێتی، پەرلەمان رۆڵێکی زۆرتری بۆ سازاندن (تەنسیق) بەڕێوە دەبرد چونکە پەیوەندیی بەدەسەڵاتی راپەڕاندنەوە پەیوەندیی هاوکاریو پشت بەیەکتری بەستن بوە. بەڵام لەپڕ دەوری پەرلەمان بەهۆی هاتنە سەرکاری حیزبی عەدالەتەوە کەهەڵبژاردنی ساڵی ١٩٦٥ی بردەوە، گۆڕانی بەسەردا هاتو لەدەوری ((سازاندنەوە)) بوو بەدەوری ((ملکەچ کردن)). دواتر، داخورانی زۆربەی حزبی عەدالەت لەساڵی ١٩٧٠دا بەهۆی هەڵگەڕانەوەی نزیکەی چل پەرلەمانتاری سەر بەو حزبەو پێکهێنانی پارتی دیموکرات، بوە مایەی کۆتایی هاتنی ملکەچ بونی دەستەی یاسادانان بۆ دەسەڵاتی راپەڕاندن[39]. پاش ساڵی ١٩٧١ حکومەتی ناحزبی (یاخود حکومەتی بان حزبی لەلایەن ئیریمەوە) بۆ ماوەی دو ساڵ لەتورکیا هاتە سەر کار. ئەمەش وابەستەییی دەستەی یاسادانانی بەدەسەڵاتی راپەڕاندن کەم کردەوەو پەرەی بەهاریکاریی نێوان هەردولادا. دەستەی یاسادانان دیسان کەوتەوە سازاندن، کاتێك هیچ حزبێك بەتەنها زۆرینەی رەهای لەهەڵبژاردنەکانی ١٩٧٣و ١٩٧٧ بەدەست نەهێنا، چونکە قانونی ئەوسای هەڵبژاردن دەرفەتی بەو حزبە دەدا کە ٢٨٪ی دەنگەکان بەدەست دێنێ زۆرینەی کورسی پەرلەمانی پێکهاتو لە ٤٥٠ ئەندام مسۆگەر بکات. بۆچونە ناو پەرلەمانیش پێویست بوو لەسەر حزبەکان

[39] Ibid. p.70.

١٠٪ی دەنگەکان بەدەست بێنن. لەبەرئەوە هەر حزبێك ١٠٪ دەنگەکانی بەدەست نەهێنایە نەیدەتوانی بچێتە ناو پەرلەمان ئەگەر لەمپەری هەندێ ناوچەی هەڵبژاردنیشی تێپەڕاندایە. پاشان دەسکاریی ئەو لەمپەرە کرا، کاتێك تورگوت ئوزال قانونێکی ئێجگار ئاڵۆزی بۆ هەڵبژاردن پەسەند کرد کەبەهۆیەوە ئەوە بەسەر حزبە پاڵێوراوەکاندا سەپێنرا کەدو لەمپەر بڕبن، یەکێکیان ((لەمپەری ولاّت)) بوو کە ١٠٪ی سەرجەمی دەنگەکانی پێکدەهێنا، ئەوی تر ((لەمپەری شەش هەرێمەکە)) بوو کەحزبەکانی ناچار دەکرد لەمپەری ٢٠٪ی دەنگەکان بەدەست بێنن تاکو کورسییەکانی پەرلەمان بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن. بەهۆی ئەو قانونانەی هەڵبژاردنەوە قۆناغی حکومەتی هاوپەیمانێتیی لاواز لەتورکیا دەستی پێکرد. تەنانەت حکومەتەکەی سلێمان دیمیرێلیش کە لەدانیشتنی ساڵی ١٩٧٩ی پەرلەمانتاری تورکدا بە ٢٢٩ دەنگ بەرامبەر بە ٢٠٨ متمانەی پێ بەخشرا، لەبەر چەندین هۆ وەك حکومەتەکانی پێشوی تورك بەحکومەتێکی لاواز دەژمێردرێ. ئەگەر پشت بەپێوانەی پەرلەمان ببەستین، دەبینین ٢٠٨ دەنگ متمانەیان بەحکومەتەکە نەبەخشیوە، ٩ دەنگ بەشدارییان لەدەنگداندا نەکردووە دەنگێکیش کارتی بەسپێتی هێشتۆتەوە. ئەگەر ئەم ژمارانە کۆ بکەینەوە، دەردەکەوێ کۆژمارەی نەیارانی حکومەتو ئەوانەی کەیفیان پێ نایە ٢١٨ پەرلەمانتارە بەرامبەر بە ٢٢٩ پەرلەمانتار. ئەو جیاوازییە کەمەی نێوان هەردو ژمارەش رەنگە کاریگەرییەکی زۆری هەبوبێ، چونکە تەنگژەیەك کە لەتشرینی یەکەمی ١٩٧٩دا دەست لەکار کێشانەوەی پۆلەند ئیجیویدو حکومەتەکەی لێ کەوتەوە، هەرگیز سەری هەڵ نەدەدا ئەگەر ناوبراو ١١

کورسـی لەهـەڵبژاردنی لاوەکـیدا نەدۆڕاندایـە*. لەلایـەکی دیکـەوە هاوپەیمانێتیی لەهەڵبژاردندا کارێکی وا دەکا حکومـەتی زۆرینـەی نـەتوانێ بەوپەڕی ئازادییەوە بڕیارەکانی خۆی داڕێژێ. ئەوەش بەڵگەیـە کەپشـتیوانیی حزبە راستڕەوەکان، بەتایبـەتی حزبەکـەی تورکش (پـارتی کـاری نەتـەوەیی)و حزبەکەی ئەربەکان (رەفا)، تـای تـەرازوی حکومەتەکـەی دیمیرێلی سـەنگینتر کردو وای کرد چارەنوسی ئەم حکومەتە بوەستێتە سەر حەزو ئارەزوەکانی ئـەم حزبانە کە لەحکومەتیشدا بەشدار نەبون[40].

بەهەر حاڵ، دەسکاری کردنی قانونەکانی هەڵبژاردن یان رەتکردنەوەی ئەو دەسکاری کردنانە یا بەو ئیتیجاهەدا دەڕۆیی کەرێ لەهـەندێ حزبـی سیاسـی بگیرێ تـا بەشـداری لەهـەڵبژاردندا نەکـەن گوایـە ئـەو حزبانـە شـەرعیەتیان لەدەسـت داوە بەتایبـەتی حزبـە کۆمۆنیسـتو جیاخوازەکـان وەك ئـەوەی لەهەڵبژاردنی ساڵی ١٩٨٦دا رویدا، یا بەو مەبەسـتە بـوە کەلەمپـەر بخرێتـە بـەردەمی حزبـە بچوکەکانـەوە بـۆ ئـەوەی هیـچ کورسـییەکیان لەپەرلـەماندا دەسـنەکەوێ. بۆنمونـە پـارتی سۆسیالیسـتی تورکیـا لەهـەڵبژاردنی ١٩٩١دا نەیتوانی رێژەی ١٠٪ی پێویست بۆ چونە ناو پەرلەمان بەدەست بێنێ.

بێ لەوە، دەرکردنی قانونێك سـەبارەت بەئـەنجام دانـی هـەڵبژاردنێکی زوو (بۆ نمونە، ساڵێك پێش وادەی خۆی) هەندێ جـار بـەو مەبەسـتە دەبـێ کـەرێ

---

* ئەم هەڵبژاردنە نمونەیەکی بچوك کراوەی هەڵبژاردنی پەرلەمانەو ئاماژەیەکی ئاشکراشـە بۆ چۆنێتیی دابەشبونی هێزە سیاسییەکانی وڵات.

[40] الانتخابات في تركيا: هزيمة للعسكر واليسـار، مجلـة الوطـن العربـي، العـدد ٥٠٥، ١٧ تشرين أول ١٩٨٦، ص٤٢.

لەگەشەسەندنی هەندێ رەهەندی سیاسی بگرێ کەبەشێکی پێشەوا سیاسی‌یە دێرینەکان، لەوانە رێیان پێ دراوە بگەرێنەوە ناو ژیانی سیاسی* نوێنەرایەتی‌ی دەکەن (وەك بانگەوازەکەی ٨ی تشرینی دوەمی ١٩٨٨ی تورگوت ئۆزال). رەنگە ئامانجەکەشی کات بەسەر بردن بێ بۆ دەستەبەر کردنی زۆرینە لەناو پەرلەماندا بۆ حزبێکی دیاریکراو بەداهێنانی چەند بنەمایەك بۆ هاوپەیمانێتی‌ی حکومەت‌و حزبەکانی تر، وەك بانگەوازەکەی تانسۆ چیللەری سەرۆکی پارتی رێی راست لەهەڵبژاردنی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٩٥دا.

هەندێ جاریش مەبەستی دەسکاری کردنەکە تەگەرەدانە لەگەیشتنی هەندێ حزب بەدەسەڵات چونکە گەیشتنی ئەو حزبانە لەوانەیە کاریگەری بخاتە سەر بنچینەی عیلمانی‌ی کۆماری تورکیا. ئەوە بەڵگەیە کەهەوڵدان بۆ پیادەکردنی سیستمی دوو خولی‌ی هەڵبژاردن لەبری سیستمی ئێستای یەك خولی‌ی زۆرینە، بەو مەبەستە بوە کەرێ لەهاتنە سەر کاری حزبی رەفای ئیسلامی بگرێ. سەبارەت بەرەتکردنەوەی دەسکاری کردنی قانونەکانی هەڵبژاردنیش، روبەروبونەوەی نێوان جەنەراڵەکان‌و رێبەرە مەدەنی‌یەکانی لەساڵی ١٩٧٣داو ململانێ‌یان لەسەر هەڵبژاردنی سەرۆك دەری دەخا کەپاڵێوراوی سەرۆکایەتی ئەفسەرێك بوو بە پلەی جەنەراڵ بەناوی فاروق گورەر Faruk Gurier کە دەیویست جێی سەرۆکی پێشو (سۆنای) بگرێتەوە، لەکاتێکدا دەستوری تورك وای تێدا هاتوە کەدەبێ سەرۆك لەریزی ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانی‌ی گەورە هەڵبژێردرێ. جەنەراڵ پاش شەش خولی

---

*ئەمە سلێمان دیمیرێل‌و بۆلەند ئیجیویدیشی گرتەوە کە بەپێی دەستورە کاتی‌یەکەی ساڵی ١٩٨٢ هەمو چالاکی‌یەکی سیاسی‌یان لێ قەدەغە کرابوو.

دەنگدانی نهێنی شکستی هێنا، بەتایبەتی کەحزبی عەدالـەتو پـارتی گـەلی کۆماری تورکیا دژایەتییان کـرد. لـەدوا دواییـدا حزبـەکان لـەنێوان خۆیـاندا لەسەر هەڵبژاردنی فـەخری کۆرتـورك (فـەرماندەی پێشـوی هـێزی دەریـایی) رێککەوتنو هەر لەو کاتەی بەسەناتۆر دانرا بەسەرکۆماریش هەڵبژێردرا.

رەتکردنەوەی دەستکاری کردنی قـانونی هـەڵبژاردنی سـەرۆك دەری دەخـا کەئەنجومەنی نیشتمانی دژی پاڵێوراوە هـەڵبژێردراوەکانی سـەرۆکایەتیو ئـەو کەسانە بوە کە لەدەرەوەی ئەنجومەن دەسەپێنرێنو لەهەمان کاتیشـدا بەڵگـەی ئەوەیـە کەحزبـە سیاسـییەکان سـەرەرای نـاکۆکیو ناتـەباییان ویسـتویانە ((مۆتەکەی)) دیموکراسی بهێڵنەوەو ئەوەندەی پێیان بکرێ خۆیـان لەپێشـێل کردنی دەستور دورەپەرێز راگرن.

## خشتەی ژمارە (١)
## دەنگدانی سەلبی لەسەر پێشنیارەکانی حکومەت لەلایەن پەرلەمانەوە

| پەرلەمان | پێشنیارەکانی حکومەت‌و دەنگە سەلبییەکان | پێشنیارەکانی حکومەت‌و دەنگە حکومییە سەلبییەکان | پێشنیارەکانی حکومەت‌و دابەشبوونی تێکڕای دەنگە سەلبییەکان | پێشنیارەکانی حکومەت‌و دەنگە سەلبییە حزبییە تێکڕاییەکانی حکومەت | پێشنیارەکانی حکومەت‌و دەنگدانی تێکڕایی سەلبیی پەرلەمانتاران |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ١٣٤ | ١١٢ | ٢,٢٨٦ | ٩٦٧ | ١٧٨ |
| ٢ | n.d | n.d | n.d | n.d | n.d |
| ٣ | ٤ | ٤ | ١٧ | ١٧ | ١٦ |
| ٤ | ٢٤ | ٢٤ | ٤٣ | ٤٣ | ٢٣ |
| ٥ | ٣ | ٣ | ٦ | ٦ | ٥ |
| ٦ | ٤ | ٤ | ١٢ | ١٢ | ٩ |
| ٧ | ١٤ | ١٤ | ٤ | ٤٠ | ١٩ |
| ٨ | ١٨٨ | ٣١ | ٢,٢١ | ١٧٢ | ٩٥ |
| ٩ | ١٧٧ | ٨٤ | ١,٦٧٠ | ٣٠٣ | ١٥٥ |
| ١٠ | ١٢٨ | ٣٩ | ١,٥٩٣ | ١٠٧ | ٦٣ |

## خشتەی ژمارە (٢)

## تۆکمەیی‌ی حزبەکان لەناو پەرلەمان‌و پێوانەکەی بەهۆی هاوکۆلکەی تۆکمەیی‌یەوە

| حزب | ناوەکان بەلیست (١٩٦٢-١٩٦١) | ناوە گرنگەکان | ناوەکان بەلیست (١٩٦٦-١٩٦٥) | ناوە گرنگەکان |
|---|---|---|---|---|
| عەدالەت | ٩٢,٨ | ٩٩,٢ | ٩٩,٢ | ٩٩,٤ |
| پارتی گەل | ٩٢,٦ | ٩٥,٣ | ٦٨,٤ | ٩٨,٣ |
| پارتی تورکیای نوێ | ٨٣,٨ | ٨٤,٠ | ٧٦,٩ | ٩١,١ |
| پارتی جوتیاری‌ی نیشتمانی‌ی کۆمار | ٧١,٠ | ٧٤,٤ | ٧٣,٤ | ٨٠,٣ |
| پارتی نەتەوە | ٧٩,٠ | ٧٥,٧ | ٦٠,٩ | ٩١,٦ |
| کار | - | - | ٩٨,٨ | ٩٨,٨ |

## تەوەری دووەم

# پەڕینەوە لەسستمی تاکە حزبەوە بۆ سستەمی فرەحزبی لەتورکیا

ئەیوب ئەمیر کەواسمی*

حزبی سیاسی تەنها لەکۆمەڵگای لیبرالی دیموکراتدا نیە، چونکە لەکۆمەڵی توتالیتاریش حزبی سیاسی هەیە، ئەگەرچی لەم جۆرە کۆمەڵەدا، حزب جگە لەرەواکردنی سستمی سیاسی ناتوانێ کارێکی دیکە بکا. سارتوری هەردوو دەستە لەژێر ناوونیشانی سستمی فرەحزبیدا، دەخاتە بەر باس[1]. لەکۆمەڵی لیبرالی دیموکراتدا، کەتیایدا کەسو گرووپی جۆراوجۆر بە بەرژەوەندیو بیری جۆراوجۆرەوە لەپێناوی وەدەست هێنان یان پاراستنی دەسەڵاتی سیاسیدا لەرێگای بەشداریی سیاسییەوە پێشبڕکێ دەکەن، حزبە سیاسییەکان زادەی ئەم بیرو تەوژمانە دەبن. هاورێیەتیی دیموکراسیی سیاسی لەگەڵ حزبە سیاسییەکانیشدا هەر لەم روانگەیەوە پێویستە. بەهەمان بەڵگە ماکس ڤیبەر حزبەکان بەرۆڵەی دیموکراسی لەقەڵەم دەدا.

لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ ئەمە بگوترێ کەپەیدابوونی دیموکراسیی سیاسی پەیوەندیی بەهەڵو مەرجی واوە هەیە کەزۆرترین زانایانی رۆژئاوا بەبێ پێکهاتنی ئەو مەرجانە بەدووری دەزانن.

---

* مامۆستای کۆلیجی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی زانکۆی تەورێز (ئێران).

[1] Max Weber, Essays in Sociology, (New York: Oxford University Press, 1946). Turkish Copy, p. 102.

جێگیربوونی دیموکراسیی سیاسی بەم هۆکارانەی خوارەوە بەستراوەتەوە[1]:

١-پێکهاتنی یەکێتیی نیشتمانی.

٢-مشتو مڕی سیاسیی دووروودرێژی نێوان هێزە کۆمەڵایەتیو سیاسیی‌یەکانی ناو کۆمەڵو زاڵ نەبوونی یەکێکیان لەم پرۆسەیەدا.

٣-قبوڵ کردنی هۆشیارانەی بەها دیموکراتیی‌یەکان لەلایەن خەڵکەوە.

٤-پەیدابوونی داوودەزگای شێوازە دیموکراتیی‌یەکان.

هانتینگتۆن Huntington وەك روستۆ Rustow باوەڕی وایە کە لەپێناوی جێگیربوونی دیموکراسیی سیاسیدا یەکەم: گەشەسەندنی کەسایەتیی نیشتمانی پێویستەو مەرجی دووەم: دروست کردنی حکومەتێکی ناوەندیی‌یە. پاشان نۆرە دەگاتە دەنگدەرو حزبە جەماوەریی‌یەکان[3]. سەربار، زانایانی وەك ماکس ڤیبەر، لیپست، دانیل لیرنەرو زانا هاوچەرخەکانی دیکە لەمەڕ هۆیەکانی پەیدابوونو جێگیربوونی دیموکراسیی سیاسی چەندان تیورییان دارشتوە کەجێگای لێوردبونەوەن. بۆ نموونە: ماکس ڤیبەر لەو رایە دابوو کەپەیدابوونی دیموکراسیی سیاسی هاوشانی پێکهاتنی سەرمایەی پیشەسازی دەبێ، چونکە دیموکراسیی پایەدار لەولاتانی وادا بەرقەرارە کەسەرمایەداریی پیشەسازیی‌یان گەشەی کردووە[4].

لیپست Lipset پەرەپێدانی ئابووری لەجێگیربوونو مانەوەی دیموکراسیی سیاسیدا بەکاریگەر دەزانێ. ئەو هەڵهێنجراوانەی لەم بارەیەوە وەدەستی کەوتوون، نیشاندەری ئەم راستیی‌یەن کە لەولاتانێکدا کەپەرەپێدانی ئابووری

---

[2]D.A. Rustow, "Transition to Democracy", Comparative Politics 2(3) 1970, pp.358-370.

[3]Samuel P.Huntington and J.I. Domingues, Political Development, in Handbook of Political Science by Fred I.Greenstein and Nelson W. Polsby, published for use Turkey Reading, Mass. 1975. P.18.

[4]Max Weber, in Lipset S.Martin, Political Man, (Garden City, New York, Doubleday, Turkish Copy, 1960), p.26.

تێیدا روو لەگەشەیە، دیموکراسییەکەیان جێگیرە[5]. دەربارەی هەل‌ومەرجی پەیدابوونی دیموکراسیی سیاسی، دانیێل لیرنەر تەئکید لەژمارەی خوێندەواران، شارنشینو نەخشی هۆیەکانی راگەیاندن دەکاتەوە[6]. زانایانی مارکسیستیش لەمەڕ هەل‌ومەرجی پەیدابوونی دیموکراسیی سیاسی دیدو بۆچوونی خۆیان هەیە. گرامشی لەو باوەڕەدا بوو کە لەپێناوی پەیدابوونی دیموکراسیی سیاسیدا گەشەسەندنی کۆمەڵی شارستانی (مەدەنی) پێویستە[7]. تربۆرن Therborn هەل‌و مەرجی پەیدابوونی دیموکراسیی سیاسی لەپێکهاتنی سەرمایەداری دادەبینێ. لەدیدی ئەودا دیموکراسیی جێگیر لەو ولاتانەدا دەبینرێ کەهەر لەئێستاوە ئەندامی رێکخراوی هاوکاریو پەرەپێدانی ئابووریی سەرمایەدارین (OECD)[8] واتە ولاتانی ناوەندی سستمی ئابووریی سەرمایەداری. لەکۆتاییدا برنگتۆن مۆر Barrington Moore لەمارکسستەکانو تۆکیۆڤیل Tocqueville لە لیبرالە دیموکراتەکان، هۆکارەکانی پەیدابوونی دیموکراسیی سیاسی لەزۆربوونی هێزە سیاسیو کۆمەلایەتییەکان دادەبینن[9]. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، ئەم مەسەلەیە پێویستی بەلێکۆڵینەوەی زۆرتر هەیە، چونکە هەندێ واقیع شتی پێچەوانەیان تێدایە. بۆ

---

[5]Ibid, p. 29.

[6]Daniel Lerner, Passin of Traditional Society, (Gelencoe: The Free Press, 1958), Passim.

[7]A. Gramsci, in, Maurice, Duverger, Socilogie de la Politique, Turkish Copy, 1975, p.382.

[8]G. Therborn, Sermayenin Egemenligi Ve Demokrasinin Doqusu. (ev. Sirin, Tekeli, Ankara. V.Yay, 1989), pp. 9-10.

[9]Barrington Moore, Jr, Social Origins of Dictatorship and Democracy, (Penguin Books, 1977), Turkish Copy, Passim, in addition Alexis de Tocqueville, Democracy in America, (New York: Vintage Books, 1954), Turkish Copy, Passim.

نموونـه: ئـەڵمانیا لەگـەڵ ئـەو هـەموو گەشـە پیشەسازییەشـدا نـەیتوانی وەك بریتانیاو ئەمریکا دیموکرات بێ. یان هیندستان بەو هەلو مەرجە ئابوورییەی هەیەتی زیاتر لە (٤) سەدەیە، جۆرە دیموکراسییەکی هەیە.

دیموکراسیی سیاسی پرۆسەیەکی مێژوویییە کە لەپێکـهاتنیدا هۆکـاری بنچینەییی لێکدانەوەی بەرژەوەندیی هێزە سیاســیو کۆمـەلایەتییەکانـە کـە بەهۆی رکابەری ناتوانن بەتـەنیا دەسـەلات بگرنـە دەسـت. بەواتایـەکی دیکـە دیموکراسیی سیاسی جۆرە مامەڵەیەکی سیاسیو پەیماننامەیەکی دیموکراتـە. کە لەئەنجامی هاوسەنگیی هێزە کۆمەلایەتیو سیاسییەکاندا دروست دەبێ.

ئـەو باسـەی سـەرەوە کـەوەك پێشـەکییەك گوتـرا، تارادەیـەك دەتوانـێ هۆکارەکانی پەیدابوونی سستەمە فرەحزبییـەکان لـەچوارچێوەی دیموکراسـیی سیاسیدا، بەرجەستە بکا. لەتورکیا، زۆرتریـن ئـەو گۆڕانکارییانـەی لەلایـەن تیۆریسـینەکانەوە لەپـەیدابوونی دیموکراسـیی سیاسـیدا بەکاریگـەر زانـراون لەقۆناغی پەڕینەوە لەسستەمی تاکە حزبـەوە بـۆ رژێمێکـی فرەحزبـی لـەئارادا نـەبوون. لـەم باسەشـدا دەمانـەوێ هۆکارەکـانی ئـەم گواسـتنەوەیە-یـان ئـــەم پەڕینەوەیـە-کەسـالی ١٩٤٦ لـەکۆماری تورکیـا رووی داوە، بتوێژینـــەوە. هەڵبەت دەبێ ئەوەش بزانرێ کە لەگوتارێکدا نـاتوانرێ لەهـەموو لایەنـەکانی بابەتەکە (بەهۆی لقو پۆپە زۆرەکانییەوە) بکۆلرێتەوە. لەبەر ئەوە، ئەم گوتارە زۆر تەئکید لەهۆکارە بنچینەیییە نێوخۆییەکان دەکاو بـەکورتی لـەهۆکارە دەرەکییەکان دەدوێ.

## هۆکارە بنچینەییە ناوخۆییەکان

ناتوانرێ پرۆسە سیاسـییەکان لەپێکـهاتی کۆمـەلایـەتی-ئـابووریی هیـچ کۆمـەڵێك جودا بکرێنەوە، چونکە پرنسیپی تێکڕایی رێگا لەوە دەگرێ. لەبەر ئەوە دەتوانرێ بگوتـرێ: گۆڕانـی پێکـهاتی کۆمەلایـەتی-ئـابووریی کۆمـەڵ تەئسیری خۆی لەسەر ستراتیجی سیاسیش بەجێ دێڵێ. بەهۆی ئەمەوە پەڕینەوە

لەسستەمی تاکە حزبەوە بۆ رژێمی فرەحزبی لەکۆماری تورکیا، لە دوا لێکدانەوەدا ئەنجامی گۆڕانکاری‌یەکانی پێکهاتی کۆمەڵە. وا دێتە بەرچاو کە لەگۆڕانکاری‌یەکانی نێوخۆدا دوو هۆکاری بنچینەیی لەپەیدابوونی رژێمی فرەحزبی‌ی تورکیادا نەخشێکی چارەنووس سازیان هەبوو بێ: زۆربوونی هێزە کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌یەکان‌و دەرکەوتنی جودایی‌ی دیدو بۆچوون لەئیئتلافی سیاسی‌دا. پێش ئەوەی لەم هۆکارە بکۆڵینەوە، پێویستە بەکورتی ئاشنایەتی‌یەك لەگەڵ پێکهاتی کۆمەڵایەتی-ئابووری‌ی تورکیا پەیدا بکەین، چونکە لەم رێگایەوە دەتوانین راستی‌و ناڕاستی‌ی دروست بوونی ئەو گۆڕانکاری‌یانە بزانین کە لەدیدی تیوریسینەکانی رۆژئاواوە لەمەڕ پەیدابوونی دیموکراسی‌ی سیاسی بەناچاری لەقەڵەم دراون.

## ١-روانینێکی تێکڕایی بۆ پێکهاتی کۆمەڵایەتی-ئابووریی تورکیا (١٩٢٣-١٩٤٦)

تورکیا لەساڵی ١٩٢٣دا بەرێبەری‌ی دەسەڵاتدارە علمانی‌یەکان دامەزرا. لەدیدی کۆمەڵایەتی‌یەوە، دەسپێکی ئەم کۆمارە پەیوەندی‌ی بەپێکهاتی کۆمەڵگەرایی‌ی عوسمانی‌یەوە هەبوو کە بەیەکپارچەیی لەماوەی چەندین سەدەدا (بەپەیوەندی‌ی ئایینی‌و بەها جیهانی‌یەکانیەوە) لەئارادا بوو. دوای شەڕی یەکەمی جیهان‌و فراوان بوونی نەتەوایەتی لەرۆژئاوادا، ئیمپراتۆریەتی فرە نەتەوەی عوسمانی کەوتە ژێر تەئسیری بزاڤە نەتەوەیی‌یەکان‌و لەئەنجامدا دابەش کراو دەوڵەتی نوێ‌تر (سەربەخۆو نیمچە سەربەخۆ) بە ناسنامەی نەتەوایەتی پەیدابوون کەیەکێك لەوان کۆماری تورکیابوو[10]. ئەم کۆمارە، بەناسنامە نوێ‌کەیەوە، دەیویست یەکێتی‌ی دەوڵەتە تازەکە بە بەهای

[10]Emre, Konger, Imparatorluktan Gunumuze Turkiyenin Toplumsal Yapisi, (Istanbul: Remzi, Yay. IV.B., 1985), Passim.

رۆشنبیریی تورکـەکانی پێش ئیسـلام بپـارێزێ. زاگـوگ ئـالب دامەزرێنـەری ئەندێشـەی نەتـەوەیی لـەتورکیا دەیگـوت: میللـەت بەشـێکە لەشارسـتانیەتی جیهانی‌و بۆ مانەوە پێویستی بەکەلتوری پیاوچاکانی خۆی هەیە. لەبەر ئـەوە، کەلتوری پێش ئیسلام بۆ میللەتی تورك بایەخی خۆی هەیە[11]. لـەوەلاّمی ئـەم پرسیارەشـدا کـە ئایـا کۆمــەڵێکی بـێ ناسـنامە دەتوانـێ ببێتـە بەشـێك لەشارستانێتیی جیهانی؟ مەسەلەی جـودا کردنـەوەی کـەلتورو شارسـتانیەتی هێنایە گۆڕێ[12]. بەهەر حـاڵ، لـەدیدی ئـەودا، کـەلتور لەدامـەزراندن‌و جێگـیر کردنی دەوڵەتی نەتەوەییدا هۆکارێکی بنچینەیی‌یە. بۆ ئـەم مەبەسـتە، گـوگ ئالپ لەبەرامبەر ناسنامەی ئیسلامی یان عوسمانی کەهەردووکیان لایـەنگری بەهای جیهانی بوون، داکۆکیی لەناسنامەی نەتەوایەتی‌کرد، بۆیە هێمـای بـۆ ئـەوەکرد کـەئایین لەکۆمـەڵی تورکیـا بەشـێکی جیانـەکراوەی میللەتـە. لـەم بارەیەوە دەڵێ: ئەگەر لەئەنادۆڵ لەکەسێك بپرسی، میللەت چی‌یـە؟ لـەوەلاّمدا دەڵێ: میللەت بەکەسانێك دەڵێـن کـەهاوزمان‌و هاوئـایین بـن[13]، لەبـەر ئـەوە دروست کردنی دەوڵەتی نەتەوەیی بەکەلتوری پان تۆرانیزم، بەبێ بەکارهێنانی ئاین مومکین نەبوو. بەم پێیە، تێز دارێژەرانی دەوڵـەتی نەتەوایـەتی سـودیان لەعلمانیەت وەرگرت. بەو هۆیە ئاین‌و نەتەوایەتی تێـك هـەڵکێش کـران. لـەم تێکهەڵکێشەدا، هـەوڵ درا بەشـێوەیەك سـوود لەتوخمـە ئاینی‌یـەکان وەرگـیرێ کەنەتەوەپەرستی، نەك ئیسـلامگەریی پـێ بـەهێز بـێ. سـەربار، بـەپێی ڕێ‌و شـوێنی علمانیـەت، هـەوڵ دەدرا ئـایین بکرێتـە بیروبـاوەڕی تاکەکـەس. بـەم

---

[11]Turkish Nationalism and Westren Civilization, Selected Essays of Z. Gokalp. N. Berksin Cevirisi, p. 104.

[12]Z.. Gokalp, Kultur Ve Uygarlik in Nilofer Gole, Muhendisler Ve Ideoloji, (Istanbul: Iletisim Yay, 1986), p.60.

[13]Z.. Gokalp, Turkculugun Esaslari, Hazirlayan Yalcin Toker, (Istanbul: Toker, Yay, 1987), p.27.

شێوەیە، بەڕێوەبەرانی بەرنامەی تێزە نەتەوەیی‌یەکان، بەریفۆرمی ڕۆشنبیری‌و کارگێڕی‌و یاسایی بنچینەی دەوڵەتی نوێی تورکیایان دارشت، لەبارێکدا ئاکامەکانی ئەو ریفۆرمانە لەدروست بوونی یەکێتی‌ی نەتەوەیی‌دا کاریگەری‌یەکی تایبەتی‌یان نەبووە. ئەنجامی ئەزمونەکانی ١٩٦٠ (پەڕینەوە لەسستمی تاکە حزبەوە بۆ رژێمی فرە حزبی) نیشاندەری ئەم راستی‌یەن کەئەو ریفۆرمانە-بەرێژە-لەناو شارەکاندا بەتایبەتیش لەنێو لاوانی خوێندەواردا، کاریگەر بوون[١٤]. لەکاتێکدا ئاماری شارنشینەکان (کە لەخشتەی ژمارە یەك دیار کراوە) نیشانی دەدا کە لەماوەی نێوان دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی‌و پەڕینەوە لەسستمی تاکە حزبەوە بۆ رژێمی فرە حزبی، شارنشینی گەشەیەکی وای نەکردوە کەبتوانێ هۆکارێك بێ لەمتمانەو بەراوردی ریفۆرمەکان یان لەدروست بوونی یەکێتی‌ی نەتەوەیی‌دا، چونکە زۆربەی دانیشتوان لادێیی بوون‌و لەڕووی کۆمەڵ‌و نەتەوایەتی‌و هۆزایەتی‌یەوە کەوتبونە ژێر تەئسیری پەیوەندی‌یە ئاینی‌یەکان‌و ئاشنایەتی‌یەکی وایان لەگەڵ واتای نەتەوایەتی‌دا نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەی خوێندەواران بەو ئەندازەیە نەبوو کەتەئسیرێکی بەرچاو بکاتە سەر شێلگیری‌و هۆمۆجینی‌ی کەلتور.

---

[14]Frederick W.Frey, "Education in Turkey", in Political Modernization in Japan and Turkey, ed. By Robert E. Ward and Dankwart A., Rustow (Princeton: University Press, 1964), pp. 224-225.

**خشتەی ژمارە (١)**

| سەرجەمی دانیشتوان بەملیۆن | شارنشینەکان ٪ | گوندنشینەکان ٪ | ساڵ |
|---|---|---|---|
| ١٣,٦٤٨ | ٢٤,٢ | ٧٥,٨ | ١٩٢٧ |
| ١٦,١٥٨ | ٢٣,٥ | ٧٦,٥ | ١٩٣٥ |
| ١٧,٨٢١ | ٢٤,٤ | ٧٥,٦ | ١٩٤٠ |
| ١٨,٧٩٠ | ٢٤,٩ | ٧٥,١ | ١٩٤٥ |

سەرچاوە: D.I.E. 1948;4 (دەزگای ئاماری تورکیا)

ئاماری ساڵی ١٩٣٥ ژمارەی خوێندەوارانی لەسەرانسەری وڵاتدا بە ١٨,٧٪ راگەیاندووە[١٥]. لێرە پێویست بە وەبیرهێنانەوەیە کەریفۆرمە کەلتورییەکان لەرێگای سستمی پەروەردەشەوە کەخوازیاری پتەوکردنی یەکێتیی نەتەوەیی بوو، ئەوەندە سەرکەوتوو نەبوو. چونکە زۆرترین ئەفسانەو فتوحاتو دادپەروەرییەکانی تورك، بەتایبەتی دەستڕۆیشتوییی کەلتوری لەبواری بیناسازیو هونەردا هی سەردەمی عوسمانی بووەو خوێندنی بابەتی وا لەمێژووی هونەرو ئەدەبیاتو بیناسازیدا دەیتوانی لەتوندکردنی ئایدیۆلۆژیای نەتەوە پەرستەکاندا کاریگەربێ[١٦]. هەڵبەت، دەبێ وەبیر بهێنرێتەوە کەزۆرترینی ریفۆرمەکانی نوێ خوازان کە بەشۆرشی ئەتاتورك ناسراوە، بەهۆی ئەوەی بەکەڵکی کۆمەڵ نەدەهاتن، لەلایەن خەڵکەوە رەت کرانەوە. لەبەر ئەوە ئۆزبودون Ozbudun ئیدیعا دەکا کە لەکۆماری تورکیا

[15]Emre Kongar, op.cit., p.389.

[16]Serif, Mardin, Din Ve Ideoloji, (Ankara: Iletisim, Yay, II.B., 1983), pp. 103-113.

شۆڕشێکی ناتەواو هەیە[١٧]. سەرەنجام، ناتەبایی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکانیش لەو وڵاتەدا نەگونجانی یەکێتی‌ی نیشتمانی‌ی نیشان دەدا، چونکە جۆری ناتەبایی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکان لەکۆتایی سەردەمی عوسمانی‌یەکانەوە بەشێوەی ناوەند-دەوروبەر هەیە[١٨]. لەکاتێکدا، ئەم جۆرە دوبەرەکی‌یانە بەگوتەی لیست رۆککان Rokkan تایبەتن بەسەردەمی دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی‌ی تورکیا نەك دروست بوونی یەکێتی‌ی نەتەوەیی[١٩]. بەم شێوەیە ئەو گۆرانکاری‌یانەی لەساڵانی ١٩٣٠-١٩٤٦ دا، لەپێکهاتەی کۆمەڵایەتی-ئابووری‌ی تورکیا روویاندا، تەئسیرێکی زۆریان کردە سەر یەکێتی‌ی نەتەوەیی‌و شێلگیری‌ی کەلتور چونکە لەساڵانی تەنگژەدا سیاسەتی کەرتی گشتی‌ی دەوڵەت گەشەیەکی باشی بە بەشە جۆراوجۆرەکانی ئابووری‌ی وڵاتدا، (پاشان بەژمارە ئاماژە بۆ ئەم مەسەلەیە دەکەین)، ئەمەش لەلایەکەوە کاری کردە سەر بەشە جۆراوجۆرەکانی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و لەلایەکی دیکەش، پەیوەندی‌یە کەلتوری‌یەکانی زیاد کردو لەپەیدا بوونی سازانی کەلتوری‌دا کاریگەر بوو، بەتایبەتی کە بە بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای نوێ لەبەرهەم هێنان‌و زیاد کردنی پەیوەندی‌یەکان، بەشە جۆراوجۆرەکانی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی زیاتر لێك نزیك بوونەوە. بۆ نموونە، بەسوود وەرگرتن لەتراکتۆرو پەینی کیمیایی، ئاستی بەروبوومی کشت‌و کاڵ زیادی کردو لەگواستنەوەی

---

[17]Ergun Ozbudun, "Established Revolution Versus Unfinished Revolution; Contrasting Patterns of Democratization in Mexico and Turkey", S.P. Huntington and Clement. H. Moore (eds), Authoritarian Politics in Modern Society, (New York: Basic Books, 1970).

[18]Selif Mardin, "Center-Periphery Relations: A Key to Turkish Politics". Political Participation in Turkey. (ed.) E.Akarli. G. Ben-Dor, (Istanbul, 1975), Passim.

[19]Lipset S.Martin and Stein Rokkan (eds). Party Systems and Voter Alignments: Crons National Perspective, (New York: Free Press, 1967), Passim.

زێدەی ئەو بەرھەمانەو بەرھەمی دیکەی کشتوکاڵو پیشەسازیدا، هۆیەکانی گواستنەوەی مۆدێرن، بەتایبەتی سکەی شەمەندەفەر کە لەناوچە لێک جوداکانی وڵاتدا فراوان بوو بوو، نەخشێکی گرنگیان دەگێڕا. هەروەها لەپەیوەندیی رۆشنبیریی ناوچە جۆراوجۆرەکانی وڵاتیشدا نەخشێکی زۆر گەورەی هەبوو. بەم شێوەیە ئەم رێڕەوە لەماوەی نێوان ساڵانی ۱۹۳۰-۱۹٤٦ لەسەر ئاستی وڵاتدا بووە هۆی گەشەسەندنی پێکهاتی کۆمەڵایەتی-ئابووری، کە لەپتەوکردنی پەیوەندیی‌یە نەتەوەیی‌یەکانیشدا کاریگەر بوو. هەڵبەت، دەبێ وەبیری بهێنینەوە کە لەهەر کۆمەڵگایەك ئاستی پەرەگرتنی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی - ئابوری، لەدیدی چالاکیی‌یە ئابووری‌یەکاندا، بەپێوەری تێکەڵ کردنی بەشە جۆراوجۆرەکانی ئابوری‌یەکەی دیاری دەکرێ. ئەگەر بەشێك لەپێکهاتووە کۆمەڵایەتی-ئابووری‌یەکانی کۆمەڵگایەك لەبەشەکانی دیکەی ئەو کۆمەڵگایە جودا بێتەوە، ئەم دەم بەشی جودا بۆوە رووبەرووی گرفتی وەك یەك دەبێتەوە کە لەدروست بوونی یەکێتی‌ی نەتەوەیی‌دا نەخشێکی سەلبی دەگێڕێ. بەجۆرە ئەو گۆڕانکاری‌یانەی لەسەردەمی تەنگژەدا لەتورکیا رویاندا ئەوەندە قوڵ نەبوون کە کار بکەنە سەر دامەزراوو بەهاکانی کۆمەڵ چونکە ئەو گۆڕانکاری‌یانە نەبوونە هۆی دەرکەوتنی ((تاکرەوی)) (Individualism) لەکۆمەڵداو سەرەنجام توشی لەخۆبێگانەبوونێکی تەواو نەبو تاپێویستی بەدروست بوونەوەی رژێمی کۆمەڵایەتی‌و خولقاندنی دامەزراوی نوێ بێ. لەراستی‌دا، بەفراوان بوونی تاکرەوی، کۆمەڵ بە بەهای نوێو دامەزراوی تازە ئاشنا دەبێ. هەروەك هایك لەم بارەیەوە دەڵێ: ((تاکرەوی‌ی راستەقینە... پێش هەر شتێك تیۆری‌ی سستمی سیاسی‌یە. ئەم تیۆری‌یە هەوڵێکە بۆ ناسینی ئەو هێزانەی لەژیانی کۆمەڵایەتی‌ی مرۆڤدا چارەنووس سازن. پاش ئەم قۆناغانەو سەردەرکردنی کۆمەڵ لێیان، رێسای سیاسی بەرەو زیاد بوون دەچێ))[٢٠].

[20]Hayke F.Von, "Individualism: True and Fales", The Essence of Hayke, 1975, p. 135.

لەبنچینەدا، بەهۆی فراوانبوونی تاکرەوییە کە تاکەکەس خۆی بەتاکە داڕێژەری چارەنووسی سیاسیی کۆمەڵ لەقەڵەم دەدا. رەنگە لەم روانگەیەوە بێ کەماکس ڤیبەر رایگەیاندووە کەتێزی تاکرەوی، تاکەکەس دەگەیەنێتە سەر لێواری هەموو کاروبارە سیاسییو کۆمەڵایەتییەکان[21]. ئەم گریمانانە لەقۆناغی پەڕینەوە لەسستمی تاکە حزبەوە بۆ سستمی فرە حزبی لەکۆماری تورکیا، لەهەلومەرجێکی وادا سەریان دەرهێنا کە کۆمەڵ بخەنە سەری رێی ئامانجەکانی تاکرەوی. کۆمەڵێکی وا لەو قۆناغە مێژووییەدا لەو گروپانە پێك هاتبوو کە لەسەر ئاستی ناوخۆدا وەك جاران خاوەنی پەیوەندیی نەتەوەییو تایفەیی بوونو خێزانیش سەرەڕای هەموو ریفۆرمە ئەنجامدراوەکان روخسارە پاترياريكييەكانی خۆی پاراستبو. لەسەر ئاستی کۆمەڵیشدا پەیوەندیی ئایینی لەپەیوەندیی نەتەوەیی پتەوتر بوو. بەقسەی کیدەر Keyder ئایدیۆلۆژیای نەتەوایەتی تەنها لەنێو نوخبەدا مانای هەبوو[22]. لەبەر ئەوە، زۆربەی ئەو دیاردانەی کەزانایانی رۆژئاوا بۆ پەیدا بوونی دیموکراسیی سیاسی بەپێویستی دەزانن، لەو ماوەیەدا لەتورکیا نەدەبینران. بەڵام ئەو گۆرانکارییانەی لەنێوان ١٩٣٠-١٩٤٦ (سالانی تەنگژە) رویاندا، زیاتر تەئسیریان کردە سەر پەیدابوونی دەسەڵاتە نوێکانو بەواتایەکی دی تەئسیریان کردە سەر زۆربوونی دەسەڵاتەکان.

### ٢-زۆربوونی دەسەڵاتەکان

بەگوتەی روستۆ ئەو هێزانەی لەکاتی دامەزراندنی کۆماری تورکیادا گەلەکۆمەکێی سیاسییان پێکهێنا بریتی بوون لەئەفسەرە بیروکراتەکان،

---

[21]Weber, The Protestant Ethic and the Spirit of Capitalism, (London: Allen and Unwin, 1971), Turkish Copy, Passim.

[22]Caglar, Keyder, State and Class in Turkey: A Study in Capitalist Development, Verso, (England; 1987), Turkish Copy., p. 99.

رۆشنبیرانو بازرگانەکان[23]. پێویستی بەگوتنە کە لەم ئیئتلافە سیاسی‌یەدا دەسەلات بەدەست ئەفسەرە بیروکراتەکان بوو. لەگەڵ دەست پێکردنی قەیرانی ١٩٢٩دا تورکیا رووبەرووی گرفتی بەرهەم هێنانەوەی کۆمەڵ بۆوە. کالا بۆ دەرەوە نێردراوەکانی تورکیا کەزۆرتری بەروبوومی کشتوکاڵی بوون، بێ رەواج کەوتنو نرخیان لەبازاردا شکا. شان بەشانی بێ رەواجی‌ی بەرهەمە نێردراوەکان، نرخی دراو شکاو لەئەنجامدا هاوردنی شمەك شێوانی تێکەوت.

بەم شێوەیە، دەوڵەت نەیتوانی پێداویستی‌یە زەروری‌یەکان بهێنێ[24].

لەئەنجامدا دەوڵەت بۆ رێگرتن لەداهێزرانی کۆمەڵ ئیمکاناتە خۆماڵی‌یەکانی بەکارهێناو بەئافەروز کردنی سیاسەتی لیبرالیزمو پیادەکردنی سیاسەتی دەوڵەتی، چالاکی‌یەکانی خۆی لەبواری ئابووریدا فراوان کردو بە بەرنامە ئابووری‌یەکەی زەمینەی بۆ گەشەسەندنی هێزە بەرهەم هێنەکان خۆشکرد. لەلایەکی دیکەوە، کەم بوونەوەی هاوردنی کالای پیشەسازیو پێویستی‌ی کۆمەڵ پێیان، بەرهەم هێنەرە خۆماڵی‌یەکانی بۆ بەرهەمهێنان هاندا. دەوڵەت بەدانانی گومرگێکی زۆر لەسەر ئەو شمەکانەی بەرهەم هێنانیان لەولات مومکین نەبوو، پشتیوانی‌ی لەبەرهەمی ناوخۆ کرد. سەربار، دەوڵەت بەدانی قەرزی درێژخایەن ئەو کەسانەی بۆ سەرمایەگوزاری هاندا کە بۆ بەرهەم هێنانی کالا نێوخۆیی‌یەکان سودیان لەکەرەستەی خاوی خۆماڵی وەردەگرت. ئەمەش کاری کردە سەر هەموو رشتە جۆراوجۆرەکانی ئابووری‌ی ولات[25]. ئەم سیاسەتە ئابووری‌یانەش دوای پچڕانی پەیوەندی‌یە ئیمپریالیستی‌یەکان لەگەڵ

---

[23]W.W. Rustow, The Stages of Economic Growth: Anoncommunist Manifesto, (Cambridge: Cambridge University Press, 1960), Turkish Copy., p.25.

[24]Haldun, Gulalp, Gelisme Stratejilen Ve Glisme Ideolojileri, II.B., (Ankara, Yurt, Yay, 1987), p.26.

[25]Ibid.

تورکیا لەئەنجامی دەرکەوتنی تەنگژەی جیهانیدا بەهۆی هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانەوە، درێژەیان کێشا[٢٦]. لەبەر ئەوە دەرفەتێکی گونجاو بۆ ئەوە هەڵکەوت کەتورکیا لەرووی پیشەسازیو کشتوکاڵەوە پێشکەوێ. بۆ نموونە: تورکیا پێش ساڵی ١٩٢٩ یەکێك لەبەکاربەرانی دانەوێڵە بوو، بەڵام دوای ساڵی ١٩٣٠ بووە یەکێك لەو وڵاتانەی دەغڵو دانیان دەنارده دەرەوە. لەبواری پیشەسازیشدا پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆوە بینی. لەساڵی ١٩٣٠، رێژەی پیشەسازی لەبەرهەم هێنانی ناتێکڕاییی نیشتمانیدا ١١,٤٪ بوو، لەکاتێکدا هی ساڵی ١٩٤٠ تەنها ١٨,٨٪ بوو[٢٧]. سەرباری ئەمە، دەبێ ئەوە وەبیر بهێنینەوە کە لەلێکۆڵینەوەی سیاسەتە ئابوورییەکان ئەوە هەڵدەهێنجرێ گوایە دەوڵەت ویستویەتی لەکەڵەکە کردنی سەرمایەدا سوود لەبەرهەمی گوندییانو هەقدەستی کرێکاران وەرگرێ، بەشێوەیەك کەدەوڵەت لەدیاریکردنی رادەی ناردنە دەرەوەی دانەوێڵە کەزۆربەی لەلایەن خاوەندارە بچووکەکانەوە دەچێنرا، چوارچێوەیەکی دانابوو کەبەشێوەیەکی راستەوخۆ دەبوە هۆی بێ رەواجی یان کەمبوونەوەی نرخی دانەوێڵە. ئەمەش لەدوولاوە گرنگ بوو، یەکەم: نرخی نان کەپێویستی خەڵکی شارو دێ بوو، زیادی نەدەکرد، دووەمیش: بەجێگیر کردنی نرخی نان، هەقدەستی کرێکاران بەو پێیە لەئاستێکی نزم دەمایەوە. لەبەرامبەردا زۆرتری خاوەن زەوییە گەورەکان خەریکی چاندنی لۆکە بوونو دەوڵەتیش بەهەموو توانایەوە زەمینەی ناردنە دەرەوەی ئەم جۆرە کەلوپەلو بەروبوومانەی خۆش کرد[٢٨]. لەئەنجامی ئەم سیاسەتانەدا بەشێك لەموڵکدارە گەورەکان دەرامەتێکی زۆریان دەست کەوت. خاوەن پیشەسازییەکانیش بە بەکارهێنانی هێزی کاری هەرزانو هەروەها

[26]Korkut Borataw; Turkiye' de Devletcilik, II.B., (Ankara: Savas Yay, 1982), p.114.

[27]Kongar, op.cit., p.271.

[28]Haldun Gulatp. Op. cit, p.27.

بەهۆی نەبوونی پێشبڕکێ لەنێوان کەڵو پەلە دروستکراوەکان (کە لەسیاسەتی پشتگیری دەوڵەتەوە پەیدا دەبوون) بواری تەواویان بۆ کەڵەکە کردنی سەرمایە پەیدا کرد. سەربار، گەشەستاندنی تەکنەلۆژیاو بەکارهێنانی لەبواری کشتو کاڵدا بەقازانجی موڵکدارە گەورەکان دەبوو، چونکە کەسانێك دەیانتوانی سوود لەتەکنەلۆژیای نوێ وەربگرن کەتواناای کڕینیان هەبێ. بەهەر حاڵ، خاوەنی زەوییە گەورەکان بە بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای نوێ (وەك تراکتۆر کەژمارەیان لەساڵی ١٩٤٠دا نزیکەی ١٠٦٦دانە بوو، بەرووبوومی کشتوکاڵییان زۆرتر کرد[٢٩]. لەبەر ئەوە، موڵکدارە بچوکەکان کە لەبەرهەم هێناندا ئامرازی کۆنیان بەکار دەهێنا، نەیانتوانی پێشبڕکێی بەرهەمی گەورە موڵکدارەکان بکەن. ئەم ڕێڕەوە بووە هۆی ئەوەی موڵکدارە گچکەکان رووبەرووی تەنگژە ببنەوە، بەتایبەتی کە لەگەڵ دەست پێکردنی شەڕی دووەمی جیهانیدا، مۆنۆپۆلی شمەكو کەڵوپەل کاری کردە سەر توند بوونی گرفتە ئابوورییەکانی چینە کەم دەرامەتو بێ بەشەکانی کۆمەڵ. ئاکامەکانی ڕێڕەوێکی وا بەم شێوەیە بوو: یەکەم: بووە هۆی زۆربوونی هێزە ئابوورییەکان کە لەچوارچێوەی موڵکداری گچکەو خاوەن پیشەسازیو بازرگانی گەورەدا بەرجەستە بوو بوون، دووەم: بارودۆخەکە موڵکدارە گچکەو بێ دەرەتانەکانی کۆمەڵی لەسیاسەتی کاربەدەستە بیروکراتەکانی دەوڵەت رەشبین کردو ئەمەش لەهەڵوێستی ئەم چینانە دەرهەق بەدەوڵەت بایەخێکی تایبەتی هەبوو. لەلایەکی دیکەوە، هێزە ئابوورییە نوێکان لەدوا رۆژانی شەڕی دووەمی جیهاندا، پێڕەوکردنی سیاسەتە ئابوورییەکانی دەوڵەتی ناوەندییان لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیاندا بەگونجاو نەدەزانیو داوای پێڕەوکردنی سیاسەتی ئابووریی بازاڕیان دەکرد. لەبەر ئەوە لەڕووی ئابوورییەوە لەناو رای گشتیدا بەرەیەکی یەکگرتووی هێزە نوێکانو چینو خەڵکی شارودێ لەدژی دەوڵەت پێك دەهات. ئەم گروپە لەدیدی ئایدیۆلۆژیشدا بەداکۆکی کردن لەئاینو

---

[29] Kongar, op. cit. P.400.

مەزهەب‌و ڕێ‌و ڕەسمی بەکۆمەڵ، لەبەرامبەر نوێ خوازاندا کەلایەنگری ڕیفۆرمەکانی ئەتاتورك بوون، هەڵوێستیان وەرگرت. دوای ئەم هەڵوێست وەرگرتنە، بۆ یەکەمین جار لەساڵی ١٩٤٦ ڕیفۆرمەکانی ئەتاتورك ڕەخنەیان لێ گیرا. بەم شێوەیە ئەو سەرکوتەی بۆ ماوەی (٢٠) ساڵ خۆی بەسەر کۆمەڵدا سەپاندبوو نەما. ئەو خەڵکەی لەو ساڵانەدا لەئەنجام دانی ڕێ‌و ڕەسمی ئایینی‌و مەزهەبی‌و داب‌و نەریتیان بێ بەش بوون، خۆیان لەتەك پارێزگارانی ئازادی‌و ئاییندا دۆزی‌یەوە. لەبەر ئەوەی زۆربەی خەڵکی پشتیوانیان لەو بزوتنەوەیە کرد کە لەمێژووی تورکیا بە بزوتنەوەی دیموکراتی بەناوبانگە چونکە ئەو بزوتنەوەیە بەڵێنی چاککردنی باری ئابووری پێ دان‌و لەڕووی ئایدیۆلۆژی‌و گفتی ئازادی‌ی دین‌و مەزەبەوە پەیمانی دڵخۆشکەری دانێ[30].

### ٣- پەیدا بوونی دوبەرەکی لەناو ئیئتلافی سیاسی‌دا

وا دەهاتە بەرچاو دەسەڵاتە نوێکان بۆ بەرگری‌کردن لەبەرژەوەندی‌یەکانیان دەبوایە بەرگری‌یان لەمەنتیقێك بکردایە کەپەیوەستی دابین کردنی بەرژەوەندی‌یە ستراتیژی‌یەکانیان بێ. لەبەر ئەوە ئەم مەنتیقە دەبوایە ڕێ‌و شوێنی وای لەئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌دا دابڕشتایە کەهەڵبەزو دابەزی ڕۆژانە کاری تێ نەکەن. ئەم جۆرە ڕێ‌و شوێنانە دەتوانن لەڕووی ئابوورییەوە لەڕژێمی بازاڕو لەڕووی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌یەوە لەچوارچێوەی پاراستنی ئازادی کەهاوشانی دیموکراسی‌ی سیاسی‌یە، بخرێنە ڕوو، چونکە بەڵگە هێنانەوە مەنتیقی‌یەکان پشتگیری‌ی گریمانەیەکی وادەکەن. بۆ نمونە: ئەو وڵاتانەی ماخۆی ڕژێمێکی سیاسی‌ی لیبراڵ‌و دیموکراتن، ڕژێمی ئابووری‌ی بازاڕیان هەیە. لەڕووی مەنتیقیشەوە، زۆربەی زانایان ڕایان وایە کەدیموکراسی لەجڵەو گرتنی دەرکەوتنی بزوتنەوە کۆمەڵایەتی‌یەکاندا، کارنامەیەکی ئیجابی‌ی هەیە. لەم بارەیەوە لیپسۆن تیوری‌یەکانی بەم شێوەیە دەخاتە ڕوو:

---

[30]Keyder, lok. Cit.

بەهۆی ئەزموونە مێژوویی‌یەکانو بەڵگە هێنانەوە مەنتیقی‌یەکانەوە ئەوە هەڵدەهێنجرێ کەهەر شۆڕشێکی کۆمەلاّیەتی‌و سیاسی بیری وەدەست خستنی دەسەلاّتی دەوڵەتی تێدایە، چونکە هەموو چینو توێژە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵ دەزگای دەوڵەت بەسەرچاوەی بێ دادی دەزانن. بەم گریمانەیە، پێش گرتن لەڕوودانی شۆڕش کاتێ لەتوانادا هەیە کە گواستنەوەی دەسەلاّت لەنێو هێزە کۆمەلاّیەتی‌و سیاسی‌یەکاندا بەشێوازی ئاشتیانە ئەنجام بدرێ[31]. لەبەر ئەوە دەبێ فەلسەفەی دیموکراسی‌ی لیبرالی ئەمڕۆ لەنێو Instrumentalism بدۆزرێتەوە، چونکە کارابوونی دیموکراسی لەجێگیرکردنی یاسادا، لەرژێمە دکتاتۆرەکان زۆرتر دێتە بەرچاو، هەر وەك کارل پوپەر وتوویەتی کەستەمگەری یان ڕەچاونەکردنی پرنسیپە دیموکراتی‌یەکان دەبنە هۆی شۆڕش[32]. ڕونسی مان لەو باوەڕەدا بوو کەیەکێك لەهۆکانی بەرپا نەبوونی شۆڕشی کۆمەلاّیەتی لەئنگەلتەرە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەدیموکراسی خۆی بەسەر کۆمەڵدا سەپاندبوو[33]. هەر چۆنێ بێ، گومان لەوەدا هەیە کەدیراسەی هۆکارەکانی جیاوازی‌ی بیروڕا لەناو ئیئتلافی سیاسی‌ی زەمانی دامەزراندنی کۆماری تورکیا بتوانێ بابەتەکە روون بکاتەوە.

دەرکەوتنی جیاوازی‌ی بیروڕا لەناو ئیئتلافەکەدا دەمێ ڕویدا کەدەوڵەت بۆ وەدەست هێنانی پشتیوانی‌ی گەل لەدەسەلاّتی بیروکراتەکان دەسپێشخەری‌ی لەگرتنەبەری سیاسەتێکی ئابووری‌ی نوێ کرد. ئەو کارە تازانەی دەوڵەت لەئەنجامی‌دا بریتی بوون لەدانانی باج لەسەر دەرامەتو بەروبوومی کشتوکاڵ،

---

[31]Leslie, Lipson, Demokratik Uygarlik, (Cev; Haldun, Gulalp, Is-Bankasi Yay, 1984) pp. 235-236.

[32]Karl R. Popper, Acik Toplum Ve Dusmanlan, (Ankara: Cev, Harun, Rizatepe; 1968), p.156.

[33]W.G. Runciman, Toplumsal Bilim Ve Siyasal Kurain, (Ankara: Cev; Erol. Mutlu, Teori Yay, 1988). pp.77-80.

یاسای ریفۆرمـــی زەوی‌و بەتایبـــەتی بـــەرپاکردنی خـــەباتێکی شـــێلگیر دژی مۆنۆپۆل.

ئەم کارانە ئەو دەسەڵاتە نوێیانەی شپرزەکرد کەدەوڵەمـــەندتر بـــوو بوون[٣٤]، بەشـێوەیەك یەکـــەمین درز لـــەئیئتلافی سیاســـی‌دا بـــەنارەزایی‌ی ژمـارەیـــەك نوێنەری ئەنجومـەنی گەورەی میللی دژی سیاسەتە نوێ‌کانی ئـابووری، ئاشـکرا بـــو. ئـــەم نارەزایی‌یانـــە لەلایـــەن زۆربـــەی تیۆریســـیونەکانەوە وەك یـــەك هەڵدەسەنگێنرێن. بۆ نموونە: (لویس) ئیدیعا دەکا کەسیاسەتە ئابووری‌یەکانی دەوڵەت لەگـەڵ بەرژەوەندی‌یـەکانی بـۆرژوازی‌ی تـازە پـێ گەیشـتوودا نـەبوون. بەهـــەمان بەڵگـــەوە، ئـــەم دەســـتەچین‌و گرووپـــە کۆمەڵایەتی‌یانـــە بـــەناچاری پشتیوانی‌یان لەدیموکراسی‌و رژێمی ئابووری‌ی بازار کرد[٣٥].

(کارپـات) بـاوەری وایـە کەسیاسـەتەکانی دەوڵـەت تـــەنیا بریتـــی بـــوون لەدروست کردن‌و جێگیرکردنی ئابووری‌ی نیشتمانی. ئەم ئەرکانە، لەناوەراستی دەیەی ٤٠دا، بەجێگیر بوونی ئـابووری‌ی نیشـتمانی کۆتایی‌یـان هـات‌و ئیـدی پێویستی بەسیاسەتی ئابووری‌ی دەوڵـەت نـەما[٣٦]. لەبـەر ئـەوە پشـتگیری یـان دژایەتی کردنـی سیاسـەتە ئابووری‌یـەکان، بـووە هـۆی پـەیدابوونی دوبـەرەکی لەنێو ئیئتلافی سیاسی‌دا. ئەم جودایی‌یە، هۆکارێك بوو کـو ئۆزبـودون هـۆی پەرینەوە لەسستمی تاکە حزبەوە بۆ رژێمی فرە حزبی‌ی تێدا دەبینێ[٣٧]. هەروەك پێشرەوانی بزوتنەوەی دیموکراتیش دانیان پێدانـا، ئیـدی بـۆرژوازی پێویسـتی بەپشتگیری‌ی دەوڵەت نەما. ناوەندی حزبی دیموکراتیش دوای ئەم باسـانە پێـك

[34] Boratav, op.cit., p.270.

[35] B Lewis, The Emergence of Modern Turkey. (London: Oxford University Press, 1968), p.317.

[36] Kemal Karpat. The Transition of Turkey's Political Regune to a Multipary System, (Michigan, 1973), p.71.

[37] Ozbudun. Loc. Cit.

هات. لەساڵی ۱۹٤۰، باسێك دەربارەی ریفۆرمی زەوی لەبەرنامەی كاری ئەنجومەن دانرا. ژمارەیەك لەنوێنەران (دامەزرێنەرانی داهاتووی حزبی دیموكرات) بەتوندی دژی ئەو باسانە بوون[٣٨]. لەساڵی ۱۹٤٥ یش بۆ بڕیاردانی یاسای ریفۆرمی زەوی، جارێكی دیكە كۆمسیۆنێكی تایبەت دەستی بەكار كرد. ماددەی حەڤدەمی یاسای ریفۆرمی زەوی حوكمی موڵكایەتیی زەوییە بەیارەكان یان ئەو زەوییانەی بە بەردەوامی نەدەچێندران، دەدایە كەسانێك كە بێ زەوی بوون یان زەوییان كەم بوو. پارێزگارانی دەسەڵاتە نوێكان حوكمی ناوبراویان كە لەیاسادا بەشێوەی ((تاپۆ دەكرێ)) هاتبوو، كردە ((لەئایندەدا تاپۆ دەكرێ))[٣٩]، لەبەر ئەوە، یاسای سەرەوە بڕیاری لێ نەدرا. هەروەها ئەو نوێنەرانەی دژی یاسای ریفۆرمی زەوی هەڵوێستیان گرتبوو، لە ۱۲ی حوزەیرانی ۱۹٤٥دا تێڕوانینی خۆیان لەراپۆرتێكدا كە لەمێژووی سیاسیی توركیا بە ((راپۆرتی چوار كەسەكە)) بەناوبانگ، نووسیو دایانە دەست گروپی حزبی جمهوریی گەل. ئیمزاكەرانی راپۆرتەكە نووسی بوویان كە كاتی ئەوە هاتووە دیموكراسی بەرقەرار بێو دەوڵەت دەبێ زەمینە بۆ پەرینەوە لەسستمی تاكە حزبەوە بۆ رژێمی فرە حزبی خۆش كا. ئەو نوێنەرانەی راپۆرتەكەیان مۆر كرد، لەمێژووی سیاسیی توركیادا كەسانێكی ناسراو بوون. یەكێك لەو نوێنەرانە جەلال بایار بوو كە لەسەردەمی ئەتاتوركدا بووە سەرۆك وەزیرو لایەنگری رژێمی لیبرال دیموكرات بوو. دووەمین كەسیان موڵكدارێكی گەورە بوو بەناوی عەدنان مەندەرەس، پرۆفیسۆر فوئاد كۆپرولولەر سێیەمین نوێنەری نارازی بوو. چوارەمین نوێنەری راپۆرت نووس،

---

[38]Cem, Eroglu, Demokrat Parti; Tarihi Ve Ideolojisi, (Ankara: Imge, Yay), pp. 11-12.

[39]Sadun Emrealp, Azgelismislik Ve Siyasat Yapilar: Turkiye-Misir-Peru, (Ankara: BT, Yay, 1983), p.103.

رەفیق کۆرال بوو کەچەندان ساڵ تیۆریسینی حزبی جمهوری گەل بوو[40]. بەهەر حاڵ، ئەم نوێنەرانە لەبنچینەدا پارێزەری بەرژەوەندییەکانی رۆژئاوا بوون، بەدروشمی دژی رۆژئاوایی توانیان زۆربەی نارازییەکان بۆ پشتیوانی کردنی بزوتنەوەی دیموکراتەکان راکێشن. بەم شێوەیە، بیروکراتەکان بەو بەڵگانەی لەخوارەوە نووسراون، ناچار کران واز لەتاکە حزبی بێنن:

١-بارودۆخی سستمی جیهانی، چونکە شەڕی دووەمی جیهان بەسەرکەوتنی بەرەی لایەنگری رژێمی ئابووریی بازاڕ کۆتایی هاتبوو. لەبەر ئەوە، لەئاستی جیهانیش بزاڤی دیموکراتی سەرکەوتوو بوو، ئەم کارە هاوکات بو لەگەڵ بەهێزبوونی بزوتنەوە دیموکراتەکانی ولاتانی خاوەن رژێمی بازاڕدا.

٢-بارودۆخی بیروکراتەکان: چونکە بیروکراتەکانیش خاوەن بەرژەوەندیی هاوبەش نەبوون. زۆربەشیان بەرژەوەندییەکانی خۆیان لەتەنگ دەسەلاتە نوێکاندا دەبینی.

٣-بێ توانایی‌ی شێوازی غەیرە سەرمایەداری، چونکە ٨٠٪ی کۆمەڵ بریتی بوون لەبەرهەم هێنو مولکدارە بچوکەکان کەپێشوازی‌یان لەشێوازە غەیرە سەرمایەداری‌یەکان نەدەکرد[41].

٤-پەیدا بوونی کلاوڕۆژنەی دڵنیایی‌یەك، چونکە لەو کاتەدا نەهێشتنی ناخۆشی‌یەکان لەرێگای رژێمی ئابووریی بازاڕ بە بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیای نوێ لەبواری کشتو کاڵدا لەتوانادا نەبوو. هەروەك پێشتر هێمامان بۆ کرد، مولکدارە گچکەکان توانای پێشبڕکێی گەورە مولکدارانو کۆمپانیای ئاژەڵداریو کشتوکاڵی‌یان نەبوو. لەبەر ئەوە بەدوور کەوتنەوەی ئەم دەستەیەی لادێیی‌یەکان لەچالاکیی ئابووری، رەویان بۆشار مسۆگەر بوو (رێڕەوی گوندی‌یان بۆ شار لەخشتەی ژمارە (٢) دا دیاری کراوە). وەك دەبینرێ، دوای ساڵی ١٩٤٦، رێڕەوی رەو بەرەو شار زیادی کرد. لەبەر ئەوە وادێتە بەرچاو

---

[40]Kongar, op.cit.,pp.158-159.

[41]Keyder, op.cit., pp.97-105.

کەدروستکردنی کلاورۆژنەیەکی دڵنیابوون بۆ کۆنترۆڵ کردنی جوتیارانی کۆچکردوو، شێوەیەکی هۆشیارانە بوو بێ. رەنگە لەبەر ئەوەش بێ ((کارپات)) ئیدیعای کردبێ کەیەکێك لەگرنگترین هۆکانی پەیدابوونی رژێمی فرەحزبی بریتی‌یە لەپێویستی‌ی رژێم بەکلاورۆژنەی دڵنیایی[٤٢].

هەڵبەت بۆ پەی بردن بە بایەخی ناخۆشی‌یەکان دەتوانرێ سەرنج بدرێتە گوتاری (عیسمەت ئینۆنۆ) کە لەمەڕ بەڵگەی وەدەرکەوتنی رژێمی فرە حزبی گوتوویەتی. ئەو دەڵێ ((ئەگەر ئێمە لەساڵی ١٩٤٥-١٩٤٦دا دەستپێشخەریمان لەجێگیرکردنی دیموکراسی‌دا نەکردبا، رووبەرووی رووداوی خوێناوی دەبووینەوە))[٤٣].

**خشتەی ژمارە (٢)**

| تێکرای دانیشتوان بەملیۆن | شارنشین ٪ | گوندی ٪ | ساڵ |
|---|---|---|---|
| ١٨,٧٩٠ | ٢٤,٩ | ٧٥,١ | ١٩٤٥ |
| ٢٠,٩٤٧ | ٢٥,٠ | ٧٥,٠ | ١٩٥٠ |
| ٢٤,٠٦٥ | ٢٨,٨ | ٧١,٢ | ١٩٥٥ |
| ٢٧,٧٥٥ | ٣١,٩ | ٦٨,١ | ١٩٦٠ |
| ٣١,٣٩١ | ٣٤.٤ | ٦٥,٦ | ١٩٦٥ |
| ٣٥,٦٠٥ | ٣٨,٥ | ٦١,٥ | ١٩٧٠ |
| ٤٠,٣٤٨ | ٤١,٨ | ٥٨,٢ | ١٩٧٥ |
| ٤٤,٧٣٧ | ٤٢,٩ | ٥٦,١ | ١٩٨٠ |

سەرچاوە: D.I.E. 1948. 4

[42]Karpat, Turk Demokrasi Tarihi, (Istabul, 1967), p. 12.

[43]Ismet Inonu in: Rifki S.Burcaks: Turkiye,' de Demokrasiye Gecis 1945-1950. (Ankara, 1979), p.55.

## هۆکاره دەرەکی‌یەکان

بەکۆتایی هاتنی شەڕی دووەمی جیهان، سەردەمێکی نوێ لەپەیوەندی‌ی نێودەوڵەتان دەستی پێ‌کرد کە لەسەر ئاستی جیهانی‌دا دوو تەوەری لێ بەرجەستە بوو. تەوەرێك بەرێبەری‌ی ئەمریکا پێڕەوی لەرژێمێك دەکرد کە بەپێ‌ی بازارِ دامەزرابوو وبەشی دنیای رۆژئاوای پێك دێنا. رۆژئاوایی‌یەکان لەسیاسەتە جیهانی‌یەکاندا بەپێی تیۆری ترومەن Trumen لەپاراستنی بارودۆخی ئێستا (Status quo) رووبەڕووی پەل هاوێشتنی کۆمۆنیزم بوونەوە. بۆ ئەم مەبەستە لەڕووی سیاسی‌یەوە سوودیان لەدیموکراسی وەرگرت (کەوا دەهاتە بەرچاو کە تاکە هۆی گونجاو بێ بۆ کانالیزە کردنی خەڵك). هەروەك تربورن دانی پێدا دەنێ زۆربەی وڵاتانی سەرمایەداری دوای شەڕی دووەمی جیهانی، لەجێگیر کردنی دیموکراسی لەکۆمەڵگەکەیاندا دەستپێشخەری‌یان کرد[٤٤]. لەبەر ئەوە نابێ دەرکەوتنی دیموکراسی لەدوای شەڕی دووەمی جیهاندا بەرێکەوت لەقەڵەم بدرێ، چونکە بەجێگیر بوونی دیموکراسی‌و ئازادی‌ی حزبەکان، بەئاسانی دەتوانرێ سەرنجی خەڵك بۆ چالاکی‌یە سیاسی‌یە ئامانجدەرەکان رابکێشرێ. لەوانەیە لەبەر هەمان بەڵگە بێ کەسیاسەتدارێژەرانی ئەمریکا دژی ئەو وڵاتانە بووبن کەسیاسەتیان بەپیشەی چینە شارنشینەکان دەزانی. یەکێك لەو وڵاتانەش تورکیا بوو کە لەخولی تاکە حزبی‌دا، سیاسەت تایبەت بوو بەچینە شارنشینەکان. هەڵبەت تیۆری‌یەکانی (هانتینگتۆن) لەم بارەیەوە جێگای سەرنجدانن: ئەو دەڵێ: ((لەکۆماری تورکیای سەردەمی تاکە حزبدا گوندی‌یەکان (کە زۆربەی دانیشتوانیان پێك

---

[44] Therborn, Op.cit, p.21.

دێنا، لەچالاکی‌یە سیاسی‌یەکان دوور بوون‌و سستمی نێودەوڵەتان نەیدەتوانی لەم بارەیەوە بێ دەنگ بێ))[45].

بەواتایەکی دیکە، سیاسەت دارێژەرانی ئەمریکا راکێشانی کۆمەڵانی جوتیارانی تورکیایان بۆ مەیدانی سیاسەت بەکارێکی مسۆگەر لەقەڵەم دەدا.

لەبنچینەدا، بەهەمان بەڵگەوە کیدەر دانی پێدا دەنێ کەدیموکراسی بۆ تورکیا لەلایەن رۆژئاواوە سەپێنراوە[46]. ئەمریکا دەیزانی ئەگەر خەڵك لەسیاسەت دوورە پەرێز بن، رۆژهەلات بەئاسانی دەتوانێ بۆ قازانجی خۆی سودیان لێ وەرگرێ (تێبینی وەرگێر: مەبەست لەرۆژهەلات بلۆکی کۆمۆنیستە). لەبەر ئەوە ئەو ولاتانەی کەوتبوونە بەرەی رۆژئاوا، دەبوایە سەرنج بدەنە تایبەتمەندی‌یەکانی کۆمەڵی خۆیان لەمەر چالاکی‌ی حزبە سیاسی‌یەکان، ئەوەش بەڵگەیە کە لەتورکیا رێبەران تەنیا مۆڵەتی کارکردنیان بەحزبە پارێزگارەکان داوە. بۆ ئەم مەبەستە، لەساڵی ١٩٤٦دا، چالاکی‌ی دوو حزبی چەپرەو کەتازە دامەزرابوون، قەدەغە کرا. بەم وەزعە، گومان دەکرا ئەمریکا لەپێناوی جێگیرکردنی دیموکراسی‌ی سیاسی لەتورکیا، سەرباری ئامانجی سیاسەتی جیهانی لەروی ئابووریشەوە ئامانجی دیاری کراوی هەبووبێ‌و بۆ وەدی هاتنیان دیموکراسی‌ی بەهۆیەکی پێویست زانی بێ. ئەمریکا بەپشتگیری‌ی حزبی وابەستە بەخۆی بەئاسانی دەیتوانی بریارە سیاسی‌و ئابووری‌یەکانی تورکیا بۆ ئامانجەکانی خۆی بەکاربهێنێ. بەهەر حاڵ، حزبی دیموکرات دوای جێگیر بوونی دیموکراسی لەپێناوی ئامانجە سیاسی‌یەکانی ئەمریکا چەند کارێکی پێویستی ئەنجامدا، چونکە ئەم حزبە

---

[45] Samoel P.Huntington, "Social and Institutional Dynamics of One Party System", S.P. Huntington, C.H. Moore (eds), Authoritanan Politics in Modern Society, (New York: Basic Books, 1970), pp. 12-17.

[46] Keyder, op.cit., p.110.

جاران بەرگریی لەراکێشانی کۆمەلآنی جوتیاران بۆ مەیدانی سیاسەت دەکرد. لەم زەمینەدا قسەکانی عەدنان مەندەرەسی رێبەری حزبی دیموکرات جێی سەرنجن. ئەو دەیگوت ((مادام کۆمەلانی جوتیاران پشتیوانمانن، رۆشنبیرانی ئیستانبولّ پووشکەیەك ناهێنن))[47].

لەرووی ئابووریشەوە، حزبی دیموکرات بەتوندی پشتیوانیی لەزیادکردنی بەروبوومی کشتوکالّ دەکرد. ئەمەش لەگەلّ پلانی مارشالّدا گونجاو بوو. لەبنچینەوە، یارمەتیيە ماددییەکانی پرۆژەی مارشالّ بۆ ئەم ولاتە، بۆ زیادکردنی بەروبوومی کشتوکالّیو کرینی مەکینەو کەلوپەلی کشتوکالّی بووە. بەهەمان بەلگەش بەرنامەی پێنج سالّەی پەرەپێدانی ئەم ولاتە کە لەسالّی ١٩٤٦دا لەلایەن حکومەتی بیروکراتەکانەوە رێك خرابوو، رووبەرووی نارەزاییی پسپۆرانی دارایيی ئەمریکا بوو، چونکە لەم بەرنامەیەدا ئەولەویەت بەدامەزراندنی کارخانەی نوێو زیادکردنی بەروبوومی پیشەسازی درابوو[48]، لەکاتێکدا ئەمریکا یارمەتیيە ماددییەکانی خۆی تایبەت کرد بوو بەپرۆژەی گەورەی کشتوکالّی. لەبەر ئەوە، لەدابەش کردنی کاری نوێی نێودەولّەتاندا کە دوای شەری دووەمی جیهان پێك هات، تورکیا ناچار بوو بایەخێکی تایبەت بە بەرهەم هێنانی بەروبوومی سەرەکی بدات. لەبەر ئەوە بەدەسپێکی جێگیر بوونی دیموکراسی، تورکیا لەرووی ئابوریشەوە لەلایەن ئەمریکاوە کۆنترۆلّ کرابوو. بۆ زۆرتر شارەزابوون لەچۆنیەتیو بایەخی ئەم کۆنترۆلّەو تەئسیری لەسەر تورکیا، بروانە تەرازووی پارەدان لەخشتەی ژمارە سێ. هەروەك دەبینرێ، ئەم ولاتە لەتەرازووی پارەداندا تەنیا لەسەردەمی رژێمی دەولّەتدا، تارادەیەك لەبارێکی باشدا بووە کەئەمەش خۆی لەخۆیدا تەئسیری رژێمی رۆژئاوا لەسەر ئابووریی ئەم ولاتە دەردەخا.

---

[47]Samui P.Huntington Political Development. Op. cit., p.82.

[48]Boratav, op. cit., p.272.

## خشتەی ژمارە (٣)

## ڕێژەی ناردەو هاوردە (بە پێی خولە بنچینەیی‌یەکان)

| تایبەتمەندی‌یە بنچینەیی‌یەکانی خول | % | ســاڵ |
|---|---|---|
| * داهێنانی هەلو مەرجی ئابووری‌ی کراوە | ٠,٧٣ | ١٩٢٩-١٩٢٣ |
| * دەوڵەت-پشتیوانی | ١,١٢ | ١٩٣٩-١٩٣٠ |
| * شەڕو کۆتایی هاتنی | ١,٥٣ | ١٩٤٦-١٩٤٠ |
| * یارمەتی‌یەکانی پرۆژەی مارشاڵو سیاسەتی لیبڕال | ٠,٨ | ١٩٥٣-١٩٤٧ |
| * پەرەپێدانی بەرنامەدار | ٠,٦٨ | ١٩٧٠-١٩٦٢ |
| * گەشەسەندن بە لەبەر چاوگرتنی شکست لەقەرزدانەوە | ٠,٤٧ | ١٩٧٦-١٩٧١ |
| تەنگژە | ٠,٤٢ | ١٩٨١-١٩٧٧ |

سەرچاوە:

T. Bulutay T. S. Tezel, N. Yildirim, Turkiye Milli Gerliri 1923-1948 Ankara 1974: 1948-1981 Icin Resmi Statisikler.

## ئه نجام

بێگومـــان هۆکـــانی گۆڕانـــی ســـتراتیجی سیاســـی ولاتێـــك لـــەدوا لێکۆڵینـەوەدا لەپێویستییەکانی ئـەو کۆمەڵـەوە سـەرچاوە دەگـرن. سـەربار، لەهەر گۆڕانێکی سیاسیدا (چ لەرێگای شۆڕش‌و چ لەرێگای ئاشتیانەوە بێ) کارنامەی سیاسی یەکسانە، چونکە ئەگەر رێگای سیاسەت بەگوتەی ئێستۆن بە ((تایبەتمەندبوونی دەسەلاتدارانەی بەهاکان بۆ تێکرای کۆمەڵ))[49] پێناسـە بکەین، ئەو دەم شان بەشانی گۆڕانی ستراتیجی سیاسـی، لـە تایبەتمـەندبوونی بەهاکانیش چەند گۆڕانکارییەك روو دەدەن. لەم وەزعەدا، لەولاتانی وابەستـە، واتـە ئـەو ولاتانـەی تیایـاندا بەرهـەم هێنانـەوە پـەیوەندیی بەهـەڵ‌و مـەرجی تایبەتیی ولاتی ناوەندەوە هەیە، ئەو ستراتیجەی سەرەوە زۆرتـر دەکەوێتـە ژێـر تەئسیری گۆڕانکارییـەکانی ولاتـی نـاوەندەوە. نموونـەی هـەرە دیـاری ئەمـەش تورکیایـە. ئـەم ولاتـە بـەدرێژایی بنیـات نانـەوەی ئـەورووپا، بەشـێوەیەکی ناراستەوخۆ دەبوایە پێداویستییە کشت‌و کاڵییـەکانی ئـەو ولاتانـە بەرهـەم بهێنێ. نـاوەندیش، لـەم ولاتـەدا لـەرێگای حزبـی دیموکراتـەوە پارێزگـاریی لەموڵکدارە گـەورەکان‌و کۆمپانیـا ئـاژەڵداری‌و کشـت‌و کاڵییـەکان کـردووە. لەبەر ئەوە، ئەم دەستەیەی چینەکان لەهەمووان زیاتر سوودی لەسـەرچاوەکانی کۆمەڵ وەرگرت. هەڵبەت، پشتیوانیی نـاوەند لـەحزبی دیموکـرات‌و سیاسـەتە ئابوورییەکانی تا ساڵی ١٩٦٠ بەردەوام بوو، چونکـە بەدەستپێکی تـەنگژەی ئابووری، ستراتیجی سیاسی لەولاتی وابەسـتەدا گـۆڕا. کودەتـای عەسـکەریی ١٩٦١ی تورکیاو پشـتیوانیی ئـەمریکا لـەخاوەن پیشەسـازییەکان، بایـەخی

[49]David Baston, "The Current Meaning of Behavioralism", Comemportan Political Analysis, in (New York lomes C. Charlesworth, the Free Press, 1907). Pp. 1132.

ناوەند لەدیاریکردنی ستراتیجی سیاسیی ولاّتانی وابەستەدا روون دەکاتەوە. سادەترین رووی روونکردنەوەی بایەخی ناوەند لەدیاریکردنی ستراتیجی سیاسیی تورکیا لەلایەن موڕایەوە Muray خراوەتە روو کەوتویەتی: ((لەکۆماری تورکیا کۆنەپەرستی هەمیشە لەسندوقەکانی دەنگدانەوە دێتە دەرێ)) [50]، چونکە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لەڕێگای کۆنەپەرستانەوە دابین دەکرێ.

[50] Jemes Murray in Dogan. Aven glu, Turkiyenin Dun-Rugun-Yarn. H.C. (Istanbul Tekin. Yay. 1975) p. 994.

# تەوەری سێیەم

# پێکهاتەی حزبایەتی لەتورکیا

عەباس خۆشناو

هەر لەسەرەتاوە دەردەکەوێ کەدیاریکردنی رەوتی ژیانی حزبایەتیی تورکیا کارێکی دژوارە، ئەگەرچی تورکیا لەنێو ئەو وڵاتە گەشەکردووانەی کەپێڕەوی لەسیستمی فرە حزبی دەکەن لەریزی پێشەوە دایەو سیستمە حزبییەکەشی سیمایەکی دینامیکیی پێوە دیارە. بەڵام ئەو توێژینەوانەی بۆ تاوتوێ کردنی حزبە سیاسییەکانی تورکیا تەرخان کراون، هیچ کامێکیان بەوردی نەچونەتە سەر باسکردنی گیروگرفتەکانی پەرەسەندنی هەیکەلی حزبی بەتایبەتی لەو روانگەیەوە کەئەو هەیکەلە بەشێوەیەکی توندوتۆڵ بەپرۆسەی مۆدێرنیزەکردنی ئابوری- کۆمەڵایەتییەوە بەستراوەتەوە. جگە لەمە لێکۆڵینەوەکان گیروگرفتەکانی سیستمی حزبایەتی رون ناکەنەوەو لەم روەوە هەندێکیان پێی باش نیە سیستمی تاك حزبیی جاران لەگەڵ ئەو سیستمە حزبییانەدا بەراورد بکا کەکۆمەڵە سیاسییەکانی تر ئاشنایەتییان لەگەڵدا پەیدا کردووە، هەندێکیشیان پەردە لەرووی سروشتی جوت حزبیی سیستمی حزبایەتیی تورکیا هەڵدەماڵن‌و هی تر پێ لەسەر سروشتی فرە لایەنیی سیستمە حزبییەکە دادەگرن. لێرەدا بۆ راماڵینی هەر تەمومژییەك‌و بۆ قوڵ کردنەوەی هەموو مەسەلە سادەو ساکارەکان، ئێمە وای بۆ دەچین کەپێکهاتەی سەرتاپاگیریی کۆمەڵی تورکیا کار دەکاتە سەر پێکهاتەی حزبی‌و لەهەمان کاتیشدا ئەو پێکهاتە حزبییە، بەو پەیوەندییانەی هەیەتی‌و بەو رۆڵەی لەدەوڵەتدا دەیگێڕێ، ئەویش کار دەکاتە سەر پێکهاتەی سەرتاپاگیریی

کۆمەڵی تورکیاو لێرەدا جەخت لەسەر ئەوە دەکرێ کەبنەما کۆمەڵایەتییەکە ئەو هێزەیە کەبارودۆخی تورکیا کۆنترۆڵ دەکا.

بەم پێودانگە، ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵ دەدا ژمارەیەك لەو فاکتەرو هۆکارانە دیاری بکا کەکاریگەریی گرنگیان لەسەر پرۆسەی حزبایەتیی تورکیا هەیە. لەم دیدەوە، لەگەڵ رەوینەوەی تینو تاوی ئایدیۆلۆژیای کەمالیزمو باسك ئەستوربونی رۆڵی بیروکراسیو عەسکەرییەکانو گۆڕانکارییەکانی پێکهاتەی ئابوریدا، پێکهاتەی حزبایەتیش تارادەیەکی زۆر چەند دیاردەیەکی بەخۆوە بینی وەك جەمسەرگەریو پەراگەندەیی، بۆیە ئەم لێکۆڵینەوەیە بەسەر ئەم تەوەرانەدا دابەش کراوە: ئایدیۆلۆژیای کەمالیزم، ملیتارەکانو حزبایەتی، سیستمی هەڵبژاردن، بیرۆکراسیو پرۆسەی سیاسی، گەشەکردنی ئابوریو پێکهاتەی حزبایەتی، میکانیزمی سیستمی حزبایەتی.

## ئایدیۆلۆژیای کەمالیزم

زۆربەی ئەو توێژینەوانەی بۆ حزبە سیاسییەکان تەرخان کراون، نەخاسمە ئەوانەی لەمێژووی بیروباوەڕی سیاسییان دەکۆڵنەوە، زیاترینی بایەخ بەشیکردنەوەی بیروباوەڕیان دەدەن بۆ سەردەرکردن لەپێکهاتەی لەئارادابوی حزبەکان. لەم روەوە حزب گروپێکی ئایدیۆلۆژیو وەك لەساڵی ١٩١٦دا بەنجامین کۆنستان وتویەتی "کۆمەڵە کەسێکە یەك بیروباوەڕیان هەیە"[1]. رەنگە ئەمە تارادەیەك بۆ هەندێ حزبی سیاسیی هاوچەرخ کەبیروباوەڕەکەیان مۆرکێکی ئاینیی هەیە بگونجێ بەڵام لەبەرامبەردا لێکۆڵینەوە سۆسیۆلۆجییەکان کاریگەریی بیروباوەڕیان لەسەر پێکهاتەی حزبایەتی کەم کردۆتەوە چونکە لەلای هەندێ کەس(وەك دیڤد هیوم لەکتێبەکەیدا دەربارەی

---

[1] د. ثمران حمادي، الاحزاب السياسية والنظم الحزبية، ط٢، مطبعة الارشاد، بغداد، ١٩٧٥، ص٢٥.

حزبەکان)[2] ڕێکخستن لەپلەی یەکەمدایەو بیروباوەڕ شوێنێکی لاوەکی ی هەیەو لەلای هەندێ کەسی تریش(وەك کارل مارکس)[3] پێکهاتەی کۆمەلایەتی- ئاستی گوزەران و پیشە- پلەی یەکەم داگیر دەکا.

هەلومەرجی تورکیا زیاتر لەو هەلومەرجە دەچێ کەدێڤد هیوم ئاماژەی پێداوە. بەرنامەیەك کە شۆڕشی کەمالیستی دایهێنا، لەقۆناغی بەراییدا، بەتایبەتی لەسەردەمی حکومڕانیی سەرۆك عیسمەت ئینونودا(١٩٤١-١٩٤٩) ڕۆلێکی بنەڕەتیی گێڕاو چەردەیەك پرنسیپی بنچینەیی ی لەخۆ گرت کەبریتی بون لەعیلمانییەت، نەتەوایەتی، گەلپەرستی، شۆڕشگێری، میللییەت، کۆمارخوازی، خاوێن کردنەوەی زمانی تورکی، گۆڕینی جلوبەرگی ژنان و پیاوان، گۆڕینی سالنامە، گۆڕینی ئەلفوبێ، مافەکانی ژن و گۆڕینی ڕێوشوێنی پەروەردە[4].

ئەمە بەڕونی لەخشتەی ژمارە (١)دا دەردەکەوێ کەتێیدا جەخت لەسەر بیروباوەڕە ناوبراوەکان لەو سەردەمەدا کراوە کەسیستمی تاك حزبی لەتورکیادا زاڵ بوو، واتە ماوەی نێوان(١٩٢٣-١٩٥٠)، لەکاتێکدا لەقۆناغی سیستمی فرە حزبیی لەساڵی ١٩٥٠ بەدواوە بایەخدان بەو پرنسیپانە کاڵ بۆتەوە.

---

[2] موريس ديفرجيه، الاحزاب السياسية، ترجمة علي مقلد وعبدالحسن سعد، ط٣، دار النهار للنشر، بيروت ١٩٨٠، ص ص٢-٣.

[3] اوستي رني، سياسة الحكم، ترجمة حسن علي الدبون، ج٢، المكتبة الاهلية، بغداد ١٩٦٦، ص ص ٣٦-٣٧.

[4] دەربارەی کەمالیزم بڕوانە:

سليم الصويص، اتاتورك منقذ تركيا وباني نهضتها الحديثة، ط١، مطبعة شنلر، عمان، ١٩٧٠، ص ص: ٢٢٩-٢٨٠.

عماد احمد الجواهري، الاتاتوركية والعمل الحزبي فى تركيا، مجلة دراسات عربية، العدد ٨-١٢ ( حزيران- تشرين الاول ١٩٨٢).

ئامارەکـان بەپشـت بەسـتن بـەرێکخراوە رەسمییـەکانی پـەروەردە، بەتایبـەتی سیستمی خوێندنگەکان، دەری دەخەن کەپـەیڕەو کردنـی سیسـتمی خوێندنـی مـەدەنی لـەتورکیا لـەماوەی نێـوان ١٩٢٤-١٩٦٩دا بـۆ گۆشـکردنی لاوانـی تورکیا بووە[5].

بـەپێی خشـتەی ژمـارە ١، چـەند لەقۆناغـە بەرایی‌یـەکانی شۆڕشـی کەمالیستی دورکەوینەوە، ئەوەندەش کـەمتر هانـا بـۆ ئایدیۆلۆژیـا دەبـرێ، چ لەئاشکراکردنی ئەو یاسـا بابەتییانـەی کەگۆڕانکارییـەکانی ژیـانی سیاسـی‌ی تورکیایان کۆنترۆڵ کردوەو چ لەپرۆسەی ئافراندنی بنەمای تازە بۆ شـەرعیەت لەکۆمـەڵدا[6]. لەهەندێ نمونەی وڵاتە گەشە سەندووەکاندا- وەك تورکیـا- کاتێك بـەرە بـەرە بیروبـاوەڕە شۆڕشـگێڕییەکان پێشـێل دەکرێـن، شـەرعیەت پشـت بەسەرۆکەکان دەبەستێ‌و بۆ بـەرەوا ناسـاندنی سیاسـەتە تازەکـان وەك کۆڵەکـە پشتیان پێ دەبەستێ. لەم بوارەدا مستەفا کەمال وەکو کـەس لـەقۆناغی فـرە حزبی‌دا(١٩٥٣-١٩٥٧) نمرەی زۆرتری بەدەست هێناوە(٠,١٨٣)، لەکاتێکدا لەسـەردەمی عیسـمەت ئینونـودا(١٩٤١-١٩٤٩) تەنهـا ٠,١٥٠ی بەدەسـت هێناو لەماوەی ١٩٣٤-١٩٣٧دا کەمتریشی بەدەست هێنا ٠,١٠٠[7].

بەهـەر حـاڵ، پرنسـیپە بنەڕەتییـەکانی شۆڕشـی کەمالیسـتی لەسـاڵی ١٩٤٩دا(لەدوایین سـاڵی سـستمی تـاك حزبـی‌دا) گەیشـتبونە لوتکـە کـەچی لەسـەردەمی فـرە حزبـی‌دا دابەزینـە ئاسـتێکی فـرە نـزم. وەك سـەرەنجامێکی یەکلاکراوە، سستمی فرە حزبی بۆ بەردەوام بونی پرۆسەکانی، بەقەدەر سستمی تاك حزبی هانا بۆ ئایدیۆلۆژیایەکی ناوەندی نابا. بەرامبەر بەوە، دەبینـین لـەو

---

5-F.W. Frey, Education and political Development in Turkey (Cambridge: MIT, 1963), 35-36.
6-M.Turker Alkan, Turkey; Rise and Decline of political Legistmsey in a Revolutionary Regime, Journal of South Asian and Middle Eastrn studies Vol. Iv, No.2 winter 1980, p-40.
7-Ibid , p- 41.

ماوەیەدا دروشمە رەمزییەکان فرە گەشەیان کردووە(رۆژانی پشوی نیشتمانی، ڕێورەسم، ئاڵا، سرودی نیشتمانی، مارشی سوپایی، پەیماننامە، پەیکەری بیرەوەرییە نیشتمانییەکان). هۆی زیادبونی ئەو دروشمانە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە، بەتایبەتی لەسەردەمی حزبی دیموکراتدا، هەوڵ دراوە ئەو هەمو دروشمە بکرێن بەئالتەرناتیڤ بۆ ئایدیۆلۆژیای کەمالیزم بۆ خرۆشاندنی گەل. لەم سەروبەندەدا سالانی پەنجا سالانی گۆڕانی بنیاتنانی شەرعیەتی سیاسین لەتورکیا.

دەکرێ بوترێ، زیادبونی دروشم لەقۆناغی فرە حزبیدا بەو واتایە دێ کەرژێمە فرە حزبییەکانی خاوەنی هەڵبژاردنی ئازاد سود لەدیاردە عاتیفیو ناماقوڵەکانی دەرونی جەماوەر وەردەگرن.

بەڵام سەرەڕای باڵادەستیی دروشمەکان، دو توخم لەتوخمە سەرەکییەکانی ئایدیۆلۆژیای کەمالیزم چالاکیی خۆیان پاراست، واتە پرنسیپەکانی "نەتەوایەتی" و"کۆمارخوازی" کە بەهۆی پەرەسەندنی پیشەسازیو دیموکراتیزەی کۆمەڵەوە زۆر بەڕونی دەرکەوتن. ئیتر شان بەشانی وردە وردە تەنگەبەربوونی پێکهاتەکانی ئایدیۆلۆژیا، کەمالیزمیش باقو بریقی خۆی لەدەستدا. ئەوەش جێی سەرنجە کەهەر سێ دەستێوەردانەکەی سوپا لەسالانی ١٩٦٠، ١٩٧١، ١٩٨٠ لەپرۆگرامو بەیاننامەکانیاندا چونە سەر ئەوەی کەپێویستە کەمالیزم بگەڕێتەوەو ببێ بەو چوارچێوەیەی کەهەمو گۆڕانکارییە دیموکراتیو کۆمەڵایەتیو سیاسیو تەنانەت ئابورییەکانی کۆمەڵیش دەگرێتەوە.

## سوپاو چالاکی حزبی

رژێمی سیاسیی تورکیا پاش هەر دەستێوەردانێکی سوپا مشتومڕی زۆری لەسەر کراوە، بەتایبەتی سەبارەت بەتەرازوی نێوان ئازادیو رژێم، مافی مرۆڤو ئاسایش، دیموکراسیی نمونە رۆژئاوایی- بەتوخمە بنەڕەتییەکانی پەرلەمان، هەڵبژاردن، حزبە سیاسییەکانو مافی مرۆڤەوە-و فەرمانڕەوایی. هاوکات جەنراڵەکان هەمو جار بەرنامەی خۆیان هەڵڕشتوەو جەختیان لەسەر

ئەوە كردۆتەوە كە دەبێ رژێمی سیاسی گرەنتیی ئەوەی هەبێ كەبۆ نمونە كۆنەكەی بێ سەروبەریو پەككەوتویی ناگەڕێتەوە، بەتایبەتی لەو روانگەیەوە كە هەر دە ساڵ جارێك پشێویو ئاشوبو پاشاگەردانی رویداوە. پێدەچێ دەستێوەردانی جەنەراڵەكان رەزامەندییەكی سەرەتاییی گشتیی لەسەر بووبێ ئەویش لەو دیدەوە كەجەنەراڵەكانی توركیا بەردەوام ئەو بڕوایەیان هەبوە كەئەوەی ئەوان دەیكەن گەل زۆر پشتیوانیی لێ دەكا گوایە مەبەستی ئەوان پاراستنی دیموكراسییە لەتوركیا. ئەم رەزامەندییەش فرێدرێك ئەلبەرت ستیف تونگ، دامەزرێنەری سیاسیی حزبی دیموكراتی كۆمەڵایەتیی ئەڵمانیای رۆژئاوا لەساڵی ١٩٨٠دا وا گوزارشتی لێ كردبو كە"سەنگی نائاساییی سوپا تەنها ناوەستێتە سەر دابو نەریتی سەدە ناوەڕاستەكانی فەرماندەییی سوپا، بەڵكو دەوەستێتە سەر هێزو یەكپارچەییو سامو شەوكەوتی دامودەزگا سوپاییەكانی توركیاش"[٨]. سەبارەت بەشێوەی دیموكراسی، جەنەراڵەكان دەیانگوت دیموكراسی چەندین روخساری هەیەو هەر وڵاتێك دەبێ ئەو رژێمە بۆ خۆی هەڵبژێرێ كە بەكەڵكی دێ. بەواتایەكی دی، رژێمی لەبار ئەو رژێمەیە كەسروشتی تایبەتی ملیتاریزمی توركیاییو ئامانجی دیموكراتیی پێشكەوتوی گەلی توركو دامەزراوە سیاسییەكان پێكەوە دەگونجێنێ. ئەمەش لەسەرەنجامی ریفراندۆمە دەستورییەكەی ٧ی تشرینی یەكەمی ١٩٨٢ی تایبەت بەدەستورە تازەكەو سەرۆكایەتیی كینان ئیڤریندا دەردەكەوێ.

سەرەڕای گەشەكردنی هۆشیاریی دیموكراتیی تورك، زۆربەیان پشتیوانییان لەرژێمی بەهێزو پتەو كرد، بەتایبەتی ئەگەر رژێمەكە وڵاتی گەیاندە جێگیریی سیاسیو كۆمەڵایەتی[٩]. لەبەرامبەریشدا جەنەراڵەكان

8-Nicholas S. Ludington and james W.Spain, Dateline turkey: the case for patience, foreign policy, Number 50, spring 1983, p-156.
9-Ibid, p - 162.

کـاتێك لیسـتی مەسـەلە گرنگـەکانیان دەستنیشـان دەکـرد، مەسـەلەی کۆمەڵایەتی سەرنجێکی جددیی ئەوانی رانەدەکیشاو لەم روەوە سوپا لەهـەردو دەسـتیوەردانەکەی ۱۹٦۰و۱۹۷۱دا تەنـها بایـەخێکی کـەمی بـەئابوری داو دەسـتێوەردانەکەی ۱۹۸۰ش بـوە هـۆی ئـەوەی کەجەنەراڵـەکان بچنـە سـەر ئابورییەکی کلۆرو خەریکی روخان، بۆیە ناچار بون بایەخێکی دیـار بـەپلانی بازاڕی ئازادی* تورگـوت ئـوزالی راوێژکـاری سـلێمان دمـیرێل بـۆ کاروبـاری ئابوری بدەن[10].

بەگشتی، جەنەراڵەکان لەدەستێوەردانەکانیاندا زیاتر بایەخیان بەمەسەلەی سیاسی دەدا بەرادەیەك کەدەسـتێوەردانەکان هاوزەمـان بـون لەگـەڵ خواسـتی سـەرلەنوێ دروسـتکردنەوەی پێکهاتـەی سیاسـیی تورکیـا. ئەگـەرچی ئـەم مەسەلەیە زۆر هۆی هەبو بەڵام ئەو بەرنامە کاتییەی کەخزمەتی ریفۆرمەکانی دەکـردن، هەمیشـە بـەرەو سـڕکردن یـان قەدەغـەکردنی چالاکیی سیاسـیی دەبـردن‌و ئـەوان ئـەم ئسـلوبەیان بەڕێوشـوێنێکی گونجـاو بـۆ ئاشـکراکردنی ناوبـەناوی کەموکوڕیـەکانی رژێمـی سیاسـی دادەنـا. سـاڵی ۱۹٦۰ هۆیـە راگەیەنراوەکانی دەسـتێوەردانەکە بریتـی بـون لەپـەك خسـتنی ریفۆرمـەکانی مسـتەفا کـەمال لەبـەرخاتری بـەرژەوەندیی تایبـەت‌و پێشـێلکردنی مافـە سـەرەتاییەکانی نەتـەوە. هۆیـە ناڕاگەیـەنراوەکانیش بریتـی بـوون لەترسـی ئەفسەران لەپـەیدابونی دیکتـاتۆریی تـاك حزبـی لـەناو پەرلـەماندا، کـاتێك دەرکەوت کەحزبی دیموکرات خەریکە حزبەکەی عیسمەت ئینونو(حزبـی گـەلی کۆمـارخوازی بەرهەڵسـتکار) هەڵدەوەشـێنێتەوە. بـێ لـەوەی کەئەفسـەرەکان

---

* پلانەکە لەسەر ئەوە دامەزرا بوو کەبەرە بەرە بەهای لیرەی تورکی کەم بکرێتەوە، رێژەی سوو بەرەهایی بهێڵدرێتەوە، قەرزەکان رێك بخرێنەوەو جەخت لەسەر ناردنی کاڵاو شمەك بۆ دەرەوەی وڵات بکرێ.

10-See Andrew Mango, The Third Turkish Republic, The world Today , January 1983.

دەیانویست هێزی خۆیان بپارێزن، بەتایبەتی پاش ئەوەی عەدنان مەندرێسی سەرەك وەزیرانی ئەوسا دەستی کرد بەدەستوەردان لەلیستی بەرزکردنەوەی پلەو پایەی ئەفسەرەکان بۆ راکێشانیان بەلای خۆیدا بەجۆرێك کە خەریك بوو ئەم کارە ئەفسەرەکانی دەکردە چەند گروپێك کەهەر یەکێکیان دڵسۆزی لایەنێك بوو.

ئەم هۆیانە بونە کۆڵەکەی سەرەکیی خواستی دروست کردنەوەی پێکهاتەی سیاسیی تورکیا کەئەفسەرەکان داوایان دەکرد. لەئاکامدا ئەفسەرەکان بۆ رێ نەدان بەدروستبوونی دکتاتۆریی تاك حزبی، ناچار بون کار بۆ فراوان کردنی پەراوێزی چالاکیی حزبایەتی بکەن. لەم سەروبەندەدا پاراستنی دیموکراسی، وەك فەرماندەی سوپا جەمال گۆرسێل گوزارشتی لیّ کرد، کارێکە دەبێ بەکۆمەڵ بێتە دی، چونکە ئەم کارە ئەرکی یەك هێز یان یەك حزب نیە.

لەسۆنگەی ئەمەوە زۆر حزب دروست بوون وەك پارتی عەدالەت و پارتی یەنی تورکیا (تورکیای نوێ) و پارتی جوتیاریی کۆمارخواز. لەم سەروبەندەشدا دو حزبەکەی یەکەم لەهەڵبژاردنی ١٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٦١ی پەرلەماندا سەرکەوتنی بەرچاویان بەدەستهێنا. بەڵام کاتێك پێکهاتەی سیاسی ژمارەیەکی زیاد لەپێویست حزبی تێدەکەوێ، دەبێ ئەم مەسەلەیە لەچوارچێوەی چەند بنەمایەکی دەستووریی نوێدا رێك بخرێتەوە. لەئاکامدا دەستورێکی نوێ پەسەند کراو یاسایەکی تازەش بۆ هەڵبژاردن لەلایەن پەرلەمانەوە (کە لە ٦ی کانونی دوەمی ١٩٦١ دەستی بەکارکردن کرد) ئامادە کرا.

ئەگەرچی دیکۆمنتە تازەکە دیکۆمنتێکی لیبراڵ بوو و بۆ یەکەمین جار ئازادیی کاری سیاسیی بۆ بزاڤە چەپەکان، بەتایبەتی پارتی کاری تورکیا*

---

* ئەم حزبە لەشوباتی ١٩٦٩دا لەسەر دەستی محەمەد عەلی کیدار دامەزراو ئەندامەکانی لەرابەرە مارکسیی و سەندیکالیستییەکان بون و لەگەوهەردا رەنگدانەوەی

سەلماند بەلاّم لەھەمان کاتدا کۆمەڵە مەرجو کۆتو زنجیرێکیشی بۆ دەسەلاّتی ناوەندی دانا بەجۆرێك کە بەکردەوە هیچ حکومەتێك نەیدەتوانی بەشێوەیەکی کاریگەر هەڵسوکەوت بۆچارە سەرکردنی تەنگژەکان بکا. سلێمان دیمیریل کەسالّی ۱۹٦٥بوو بەسەرەك وەزیران لەم بارەیەوە راستی وتووە کەدەستوری بە شتێکی پڕ کۆسپو لەمپەر نەك بەفەرهەنگێکی کارئاسانی شوبهاندوە[11].

سیستمە تازەکەی هەڵبژاردن کە لەسەر بنەمای هەڵبژاردنی رێژەیی دانرابوو، بەوەی کە ئەو هەلەی بۆ حزبەکان کەم کردبۆوە کە هەر یەکەیان بەتەنها زۆرینەی کورسییەکانی پەرلەمان بەدەست بێنێو حکومەتی زۆرینە پێك بینێ، کاری کردبوە سەر دەسەلاّتی ناوەندیش. ئەمەش ئەو دەرفەتەی رەخساند کەحزبەکان هاوپەیمانی دروست بکەنو لەئەنجامدا حکومەتی فرە حزبی پێك بێنن(ئەم مەسەلەیە بەتێروتەسەلی لەبواری تەکنیکی هەڵبژاردندا باس دەکەین) ئەگەرچی هەڵبژاردنی تشرینی یەکەمی سالّی ۱۹٦۹ی پەرلەمان دەری خست کە دەشێ حکومەتی کەمینە دەسەلاّت بگرێتە دەست، ئەویش کاتێك پارتی عەدالەت بەسەرۆکایەتیی دیمیریل زۆربەی دەنگەکانی بەدەست هێنا.

لەئەنجامی هەڵبژاردنەکەدا دیمیریل راسپێردرا حکومەتێکی نوێ پێکەوە بنێ، ئەو حکومەتەش تەنها لەنوێنەرانی پارتی عەدالەت پێکهاتبو. ئەم حکومەتەی کەمینە پێش دەستێوەردانی سالّی ۱۹۸۰ی سوپاش دوبارە بۆوە. ئەمەش رمێن بۆ ئەو بۆچوونە پەیدا دەکا کەدیموکراتەکان پێش هەر دەستێوەردانێکی سوپا لەدەسەلاّتدان(یاخود هەوڵ دەدەن لەدەسەلاّتدا بن). ئەمەش بۆ عەسکەرییەکان بۆتە مەراق چونکە ئەوانە دەیانەوێ هیچ

---

هاوپەیمانێتیی کرێکارانی پیشەسازیو کشتوکاڵو روناکبیرانو هەندێ لەخاوەندارە بچوکەکانو خاوەن پیشە ئازادەکان بوو.

11-Nicholas S. Ludington, op-cit , p-155.

جەمسەرگەرییەکی فرە حزبی نەهێڵن و بەمەش هەوڵ دەدەن دەسەڵاتی خۆیان لەرژێمە سیاسییەکەدا تۆکمەتر بکەن.

بەگوزارەیەکی وردتر، فەرماندە سوپاییەکانی تورکیا ریزبەندییەکیان دەوێ لەبان حزبەکانەوە یاخود لەبان سیاسەتەکانی گروپەکانەوە بیانهێڵێتەوەو لەهەمان کاتدا رۆڵێکی دیاریان لەرژێمی سیاسیدا پێ بسپێرێ. لەم رەوتەدا دامەزراندنی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لەساڵی ١٩٦١دا پڕ بەپێستی فەرماندە سوپاییەکان و بەپێی دەستوری ١٩٦١بوو. مەبەست لەئەنجومەنی ئەمنی قەومی، ئاسانکردنی راوێژی نێوان فەرماندەکانی سوپاو وەزیرە مەدەنییەکانە بۆ بەرچاو رۆشنکردنی ئەنجومەنی وەزیران لەکاتی بڕیاردان سەبارەت بەکاروباری ئاسایشی نەتەوەیی.

پاش دەستێوەردانی ساڵی ١٩٧١ فەرماندەکانی سوپا لەکاتی گۆڕینی دەستوردا ئەوەیان سەپاند کە ئەنجومەنی ئەمنی قەومی ئامۆژگاریی پێویستی ئەنجومەنی وەزیران بکا بۆ بڕیاردان لەسەر ئاستی ئەمنی قەومیدا. یەکێ لەنوسەرەکان ئاماژەی بەوە کرد کەپێش دەستێوەردانی ساڵی ١٩٨٠ سەرەک وەزیران لەبەردەم ئەندامە سوپاییەکانی ئەنجومەنی ئەمنی قەومیدا پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کەئەنجومەنەکە تەنها مافی ئامۆژگاری کردنی هەیە بەڵام ئەوەشی خستە سەر کە"ئەگەر ئامۆژگارییەکە قبوڵ نەکرێ، مەسەلەکە بەرەو قڵیشانەوە دەچێ"[١٢].

پاش دەستێوەردانە سوپاییەکەی ساڵی ١٩٨٠ دەستورە تازەکە بایەخێکی زۆرتری بەهێزەکانی ناو ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەییداو ئیتر بۆچون و تێڕوانین و ئامۆژگارییەکانی ئەنجومەنەکە بۆڕی ئەو بڕیارانەشیاندا کە نەک هەر بۆ پاراستنی وڵات پێویستن بەڵکو هەروا بۆ پاراستنی ئاسایش و ئارامیی کۆمەڵیش. لەدانیشتنێکی تایبەتدا جەنەراڵێک جەختی لەسەر ئەوە کرد کەئەنجومەنی ئەمنی قەومی"لێ دەگەڕێ فەرماندەکانی سوپا بەردەوام بن

---

12-Ibid, p - 159.

لەسەر کاریگەری خستنە سەر سیاسەت"[13]. دیارە یەکەم دەستێوەردانی ساڵی ١٩٦٠ی سوپاو دوەمی ١٩٧٠ بەو ئەندازەیە بەهێز نەبون کەجەمسەرگەری لەناو سیاسەتی تورکیا خاشەبڕ بکەنو لەم سەروبەندەدا مەیدانی سیاسەت لەساڵانی پاش ئەو دو دەستێوەردانە، جێیەکی دیاری بۆ راستڕەوەکان کردبۆوە. لەم روەوە ریفۆرمە رادیکاڵییەکان جێی رەزامەندنیی کاربەدەستان نەبون، بێ لەوەی کەدەست پێکردنەوەی چالاکیی سیاسی لەسێبەری گوشارو فشاری سوپادا پشتیوانیی لێ دەکرا، بەتایبەتی لەلایەن روناکبیرەکانەوە، لەکاتێکدا رادیکاڵەکان دژی دەستێوەردانی سوپا بون لەکاروباری حکومەتدا.

لاوازیی جەمسەرگەری لەهەشتاکانی سەدەی بیستەمدا کارێکی وای کرد دوبەرەکیی ساڵانی پەنجاو شەستی نێوان پارتی گەلی کۆماریو پارتی دیموکرات، ئەمجارە لەنێوان پارتی دیموکراتی کۆمەڵایەتیو پارتی تورکیای مەزندا سەر هەڵبداتەوە.

## تەکنیکی هەڵبژاردن

جۆری حزبەکانو سیستمی هەڵبژاردن دو دیاردەی هاوتەریبی یەکترینو لەو سەروبەندەدا سیستمی هەڵبژاردن توخمێکە لەتوخمە پێکهێنەرەکانی جۆری حزبەکان چونکە شێوەی دەنگدانەکە رەوتی سیستمەکە دیاری دەکا. بەم پێیە دەنگدانی زۆرینەیی یەك خولی دەبێتە هۆی ئەوەی کەسیستمێکی دولایەنی پێکبێو حزبە گەورەکانیش یەك لەدوای یەك بێن. لێرەشدا دەبێ ئەوە بخەینەوە بیر کە شێوەکانی دەنگدان رۆڵێکی سەرتاپا بزوێنەر ناگێڕن چونکە وردەکاریی ژیانی نەتەوەییو قەوارە کۆمەڵایەتییە سیاسییەکان لەم بوارەدا دەورو تەئسیری خۆیان هەیە.

جۆری حزبەکانی تورکیا سازانی حزبەکانو سیستمی هەڵبژاردن دەردەخاو بەم پێیە پێکەوە گونجانێکی نیمچە گشتی لەنێوان دەنگدانی زۆرینەیی یەك خولیو سیستمی دو حزبیدا دەبینرێ. لەم سەروبەندەدا پاش ٢٠ ساڵ کارکردن

---

13-Ibid , p -160.

بەسیستمی یەك حزبیو وردتر لەساڵی ١٩٤٦ بەدواوە، لوانـی سـەردەرهێنانی سیسـتمی فـرە حزبـی هەسـتی پـێ کـرا، ئـەویش کاتـێ پـارتی گـەل لەسـاڵی ١٩٤٨دا لـەپارتی دیموکراتـی بەرهەڵسـتکار جیـابۆوە. بــەڵام سیســتمی زۆرینەییی یەك خولی ( بەپێی پرنسیپی بەلیسـت دابـەزین) کـە لەسیسـتمی حزبایەتیی بەریتانیا وەرگیرا بو، لەساڵی ١٩٥٠ داسیستمی جوت حزبـیی لێ کەوتەوە بەم پێودانگە لەسەرجەمی ٤٨٧ پەرلەمانتار لەئەنجومەنی نیشتمانیی گـەورەدا تەنـها ١٠ کەسـیان سـەر بــە دو حزبــە ســەرەکییەکەی دیموکــراتو کۆمـارخواز نـەبونو لـەو دە کەسـەدا نۆیـان سـەربەخۆ بـونو یـەکێکیان سـەر بەپارتی گـەل بـوو. بـەپێی خشـتەی ژمـارە دوو[١٤]، پـارتی دیموکـرات لەسـاڵی ١٩٥٠دا، ٥٣,٣٪ی دەنگی دەنگدەرانو ٨٣,٨٪ی کورسییەکانی پەرلـەمانی بەدەسـت هێنـا، لـەکاتێکدا پـارتی گـەلی کۆمـار لەهـەمان سـاڵدا ٣٩،٨٪ی دەنگـی دەنگـدەرانو ١٤,٢٪ی کورسـییەکانی پەرلـەمانی بەدەسـت هێنـا. خشـتەکە دەریدەخـا کەهـەردو حزبـە سـەرەکییەکە لەسـاڵانی ١٩٥٠-١٩٦٠دا پێکــەوە ٩٠٪ی ســەرجەمی دەنگــی دەنگــدەرانو ٩٨٪ی ســەرجەمی کورسییەکانی پەرلەمانیان بەدەست هێنـاوە، لـەکاتێکدا حزبـەکانی تـر، واتـە پارتی گەل(کە دواتر ناوی خۆی کردە پارتی نیشتمانیی کۆمارو دواتر پـارتی نیشـتمانیی جوتیـاریی کۆمـار)و پـارتی ئـازادی، هـەم لـەدەنگداو هـەم لەکورسیی پەرلەماندا بایەخێکی ئەوتۆیان نەبوو.

ئەو دەسـکارییانەی کـەپارتی دیموکـرات پێش هـەڵبژاردنی سـاڵی ١٩٥٧ لەسیسـتمی هـەڵبژاردندا ئـەنجامی دان، کاریـان کـردە سـەر ئـەنجامی هەڵبژاردنەکە. بۆ نمونە، دەسـکاری کردنـی قـانونی هـەڵبژاردن کـە بەهۆیـەوە قەدەغە کرا حزبە سیاسییەکان هاوپەیمانی دروسـت بکـەن، هۆکـەی ئـەوە بـوو

14-Ergun ozbudun, the Turkish party system: Institutionalization, polarization, And Pragmentation, Middle Eastern studies, Volume seventeen, April 1981, Number 2, p-229.

کەپارتی دیموکرات دەیویست رێ لەهاوپەیمانێتی‌ی سێ حزبە بەرهەڵستکارەکە بگرێ بۆ ئەوەی بەیەك لیست دانەبەزن. بەمەش پارتی دیموکرات خۆی لە دۆرانێکی چاوەڕانکراو پاراست.

بەڵام بەگۆڕینی سیستمی هەڵبژاردن لەسیستمی زۆرینەیی‌ی یەك خولەوە بۆ سیستمی رێژەیی لەساڵی ۱۹٦۱دا، هیچ یەکێ لەحزبە بەشدارەکانی هەڵبژاردنی ساڵی ۱۹٦۱ نەیانتوانی زۆرینەی رەها لەپەرلەماندا بەدەست بێنن. لەگەڵ دورخستنەوەی پارتی دیموکراتدا کە بەهۆی گوشارو فشاری سوپاوە لە ساڵی ۱۹٦۰ هەڵوەشێنرایەوە، حزبەکانی تر(حزبی عەدالەت، حزبی کۆماری‌ی نیشتمان کەجاران ناوی پارتی نیشتمانی بوو، پارتی تورکیای نوێ) کە پێشبڕکێیان بوو لەسەر دەنگی لایەنگرانی پارتی دیموکرات، لەپارتی گەلی کۆمار زیاتر دەنگ‌و کورسی‌یان بەدەست هێنابوو (بڕوانە خشتەی ژمارە دو)، ئەگەرچی هەمو ئەو حزبە پارێزگارانە وا خۆیان نیشان دەدا کەمیراتگری راستەقینەی پارتی دیموکراتی هەڵوەشاوەن بەڵام لەسایەی هەڵبژاردنی رێژەیی‌دا هیچ شتێك حزبە هاوشێوەکان هان نادا تێك هەڵکێشی یەکتری بن. لەسەرێکی ترەوە سیستمی رێژەیی‌ی ساڵی ۱۹٦۱ تین‌و تاوێکی وای هەبو کە لەسیستمەکانی تری هەڵبژاردن زیاتر توانای بچوك کردنی حزبەکانی هەبو چونکە دەیتوانی مەیلی تاکڕەوی پەرە پێ بدا بەجۆرێك کەوا لەحزبەکان بکا بەشێوەیەکی بەهێزتر بەسەر خۆیاندا دابەش بن چونکە ئەو دابەشبونە زیانیان پێ ناگەیەنێ، سەرباری ئەوەی کەدەنگدان بەکردەوە کار ناکاتە سەر نوێنەرایەتی‌ی گشتلایی. ئەوەندەی مەسەلەکە کاری بەسەر مەیلی فرە حزبی‌یەوە هەیە، دەبینین ژمارەی حزبەکان لەچاو سەردەمی سیستمی زۆرینەیی‌ی یەك خول بەرەو زیادبون دەچێ. بەم پێودانگە، ژمارەی حزبەکان لە ۳ حزبەوە لەساڵانی پەنجادا بوو بە ۷ لەشەستەکاندا(خشتەی ژمارە۳).

سەبارەت بەپەراگەندەبونی حزبەکانیش، ئەوا لەسالآنی شەستدا حزبەکان ۳ لەتبونیان بەخۆوە بینیو لەهەفتاکاندا یەك. واتـە ژمـارەی لـەتبونی حزبـەکان لەسێبەری سیستمی رێژەییدا ٤ لەتبون بوو(خشتەی ژمارە۳).

فرە حزبایەتیی ئەو رژێمە ئەوەندەی لەپەیدابونی حزبی نـوێدا دەردەکـەوێ ئەوەندە لە لەتبونی حزبە کۆنەکاندا دەرناکـەوێ، لـەکاتێکدا ئـەو حزبـە تازانـە حزبی بچوك دەبن بەلآم وەك سارتۆری وتویـەتی، هـەر حزبێکـی لاوەکـی هـەر چـەند بچـوك بـێ دەبـێ حیسـابی خـۆی بکـا[15]. ئەمــەش لــەو کاریگەرییــە دەردەکـەوێ کەتاکتیکـەکانی پێشبڕکێی حزبایـەتیی پـارتی کـاری تورکیـا ئـەنجامیان داوە، کـاتێك ئـەو حزبـە رەوتـی پێشـبڕکێکەی لــە پێشــبڕکێیەکی راکێشـراو بــەلای نـاوەندەوە کــردە پێشــبڕکێیەکی دورکــەوتو لــەناوەند، چ لەنوێنەرایەتی کردنی چەپدا چ لە نوێنەرایەتی کردنی راستڕەویدا چ لە هـەردو رەهەنددا. لەئاکامدا ئەو حزبـە، سـەرەڕای بچوکـیی، توانـی کـار بکاتـە سـەر کلیلی پێشبڕکێ لەناوەندەوە بۆ هەرێمەکان.

ئەمـە راسـتییەك دەردەخـا ئـەویش ئەوەیـە کەحزبـە لاوەکییـەکان لــە هــەڵبژاردنی ۱۹٦٥و ۱۹٦۹دا کــەیفیان بــەحوکمڕانیی پــارتی عەدالـــەت نەدەهاتو لەسەرەنجامدا هیچ کوالیسیۆن(ائتـلاف)ێکـی کـارا لـەئارادا نـەبو. رەنگە ئەوەش دروست بـێ کەسیسـتمی رێژەیـی بەسیسـتمێکی نایەکلاکـەرەوە بژمێردرێ چونکە لەکاتێکدا سـەربەخۆییەکی تـەواو لەهـەڵبژاردندا بـۆ هـەر حزبێك دابین دەکا، بەدەگمەن زۆرینـەی رەهـا دەنـگ بـۆ یـەك حـزب مسـۆگەر دەکا، ئەمـەش سەرەڕای هەمو شتێك پێڕو گروپی پەرلەمانیی لێ دەکەوێتـەوە. نسـازانی نێـوان هاوپـەیمانیی پەرلـەمانیو هاوپـەیمانیی کـاتی هــەڵبژاردن بەڵگەیەکی رۆشن بوو لەسەر ناجێگیریی زۆرینە حکومیەکانی تورکیـا، هـۆی ئەم دیاردەیەش لەو یاداشــتەدا دەردەکـەوێ کـە فـەرماندەیی سـوپا لـە ۱۲ی

15-Sartori, Giovanni, parties and [party systems: Aframe work for Analysis, (cambridge: cambridge university press), 1976, pp. 121-2.

مـارتی ١٩٧١ دابـوی بەسـەرۆك جـەودەت سـۆنای كـەتێیدا هـاتبو ((بـەهۆی هەڵویستو بۆچونو چالاكییـەكانی حكومـەتو پەرلەمانـەوە، وڵات كەوتۆتـە گێژەنگی پاشاگەردانیو شەڕی براكوژیو ئاشوبی كۆمەڵایەتی))[١٦].

بەوردبونـەوە لەخشـتەی ژمـارە-٣- ئـەو هاوپەیمانییـە ئالتەرناتیڤانـە دەردەكەون كەهانایان بۆ براوە. لەساڵانی شەسـتدا چـەند هاوپەیمانییـەك هاتـە گۆڕێ، وەك هاوپەیمانیی پارتی گـەل لەگـەڵ پـارتی عەدالـەتدا، هاوپـەیمانیی پـارتی گـەلی كۆمـار لەگـەڵ پـارتی توركیـای نـوێدا، هاوپـەیمانیی پـارتی نیشتمانی لەگەڵ پارتی كۆماریدا، هاوپەیمانیی پارتی توركیـای نـوێ لەگـەڵ پارتی عەدالەتو هاوپەیمانیی پارتی نیشتمانی لەگەڵ پارتی كۆماریدا. لـەو سەروبەندەدا دەردەكەوێ كەبونی پارتی گەلی كۆمار وەك لایەنێكی گەورەتر لە دو هاوپەیمانییەكەی هـەوەڵو حكومـەتی كەمایـەتیدا (بەهاوپـەیمانیی چـەند كەسێكی بێلایەن لەساڵی ١٩٦٣دا) ئەوەندەی هۆكەی دەچێتەوە سەر هەوڵدان بۆ دورخستنەوەی سوپا لەگەیشتن بەدەسەڵات بۆ جاری دوەم، ئەوەندە ناچێتـەوە سەر پێویستیی ئاساییی سیستمی پەرلەمانی.

حەفتاكانیش چەند هاوپەیمانییەكی گرتـە خـۆ لەوانـە هاوپـەیمانیی نێـوان پارتی گەلی كۆمارو پـارتی رزگـاریی نیشـتمان، هاوپـەیمانیی نێـوان پـارتی عەدالەتو پـارتی رزگـاریی نیشـتمانو پـارتی هاوپـەیمانیی كۆمـارو پـارتی چـالاكی نەتـەوەیی(بڕوانـە خشـتەی ژمـارە ٣). لـێرەدا سـەرنجی ئـەوە دەدرێ كـەپارتی رزگـاریی نیشـتمان بـوو بەشـەریك لـە دو هاوپـەیمانیی جیـاوازدا. بەبـەراورد لەگـەڵ ئـەم سـەرو ئـەو سـەركردنی پـارتی كـاری توركیـا، پـارتی رزگاریی نیشتمانیش، بەوەی كەهەوڵی دەدا ئیلتیزاماتی ئاینیی خۆی بـەجێ بێنێ، بەشێوەیەكی ئازادانە بەدرێژاییی هێڵی راست- چەپ مـانۆری دەكـرد، بـەبێ گوێدانـە ئـەو رێبـازەی كەهاوپەیمانەكـەی بەلایـەوە پـاڵی پێـوە دەنـا[١٧].

---

[١٦] عبدالجبار قادر غفور، تاريخ تركيا المعاصر ١٩١٨-١٩٨٠، بحث منشور من قبل مركـز الدراسات التركية، جامعة الموصل، ١٩٨٧.

17-See Landu Jacob M, The national salvation party in Turkey, Asian and African studies, 11(No-1), 1976, pp-1-57.

بەهەمان شێوە پارتی عەدالەتیش لەناوەراستی حەفتاکاندا بوو بەلایەنێك لەسیاسەتی سات وسەوداکاری[18].

## بیروکراسی و پرۆسەی سیاسەت

ئەو بیروکراسییەی کە لەهەندێ قۆناغی دەولەتی عوسمانیدا سەری دەرهێنا، چەند رەهەندێکی سیاسیی جیاوازی هەبو، هەندێ جار وا دەهاتە بەرچاو کەهەم خزمەتی کاربەدەستان دەکاو هەم خزمەتی گەل دەکاو هەندێ جار ئامرازێك بوو بەدەستی کاربەدەستانەوە یاخود لەرێکخستنێکی خۆیی هەلئاوساو بەولاوە هیچی دی نەبو. بەلام بەشێوەیەکی گشتی، رەهەندی سیاسیی بیروکراسی لەقۆناغە بەراییەکانی مۆدێرنیزەکردندا هەر دەمێنێ، سەرەرای ئەو هەولە گرنگانەی کەبۆ داپینکردنی گەشەکردن دەدرێن[19].

لەتورکیا رەهەندی سیاسیی بیروکراسی زۆر بەپتەوی بەشێوەی دروست کردنی رژێمەوە بەسترابۆوە، ئەمانەش هەردوکیان بەبەردەوامی گۆرانیان بەسەردا هاتوە. بەلام سەرەرای ئەمە بیروکراسی دەشێ وەك چامبەرس وتویەتی "ببێ بەسەرچاوەی تەگەرەدان لەهەر بەرنامەیەکی ریفۆرم"[20].

بەهەرحال، بیروکراتەکانی تورکیا بەپێچەوانەی ئەو بۆچونەی کەفرێد رگس لەتوێژینەوەیەکدا دەربارەی بیروکراسیو پەرەسەندنی سیاسی بەدەستی هێنا بوو، توانیبویان پەرە بەهێزی خۆیان بدەن. رگس لەتوێژینەوەکەیدا پێی لەسەر ئەوە داگرتبو کەپەیوەندیی نێوان هێزی سیاسیو هێزی بیروکراسی پەیوەندییەکی پێچەوانەیە. لەم بوارەدا دەبینین لەسەردەمی حوکمرانیی مەندرس(١٩٥٠-١٩٦٠) کە بەسەردەمی پشتیوانی کردن لەبازرگانەکانو

18-Sayari, sabri, The Turkish party syster in Transition, Government opposition, 13 (wintor 1978, pp, 39-57).

19-S.N.E isen stadt, Bureaucracy and political Development: in Joseph La Palombara,(Eds), Bureaucracy and political Development, Princeton, 1963, p-117.

20-See Richard Chambers, Turkey, Bureaucracy, in R.E ward and D.A Rustow (Eds) political Modernization in Japan and Turkey, Princeton, 1964, p. 319.

هەڵتەکاندنی بیروکراسی ناسراوە، دەوڵەت لەساڵانی پێشو زیاتر پرۆژەی ئابوریی داهێناوە[21] بەڵام نەك تا ئەندازەی کۆنترۆڵ کردنی رژێم چونکە چەندەها هێزی دەسرۆی تری کۆمەڵ وەك سوپاو رێکخستنە دینیی‌یەکان‌و گەورە پیاوانی هەرێمەکان بەرپەرچی رژێمیان دایەوە. ئەم رۆڵە مێژوییی‌یانە کاریگەریی گرنگیان لەسەر هەمو ئەو هەوڵانە هەبو کە بۆ سەپاندنی دەسەڵاتێکی ناوەندی بەسەر کۆمەڵدا دران، بەتایبەتی کاتێك ئەو رۆڵانە وەك ژۆزێف سایلیۆویز Joseph Szyliowicz وتویەتی گوشاریان دەخستە سەر ریشەی دیموکراتیی گەل‌و لق‌و پۆپیان لێ دەبۆوە[22].

لەتوانادا هەیە رۆڵی بیروکراسی لەکۆمەڵی تورك رونتر هەڵبسەنگێنین. تا سەردەمی دەسپێکی فرە حزبی لەپەنجاکاندا، دەسەڵاتی کاربەدەستانی هەرێم‌و گوندەکان خۆی بەسەر ناوچە لادێ نشینەکاندا سەپاندبوو. لەم روەوە گوندنشینەکان بەرونی ئەوەیان لەیادە کەکارمەندانی دەوڵەت هەوڵیان دەدا گەورەی گوند هاندەن تا لەپرۆسەی بازرگانی، بەرامبەر بەچەند بازرگانێکی تر، بەشداری بکا. کاتێك دیموکراتەکان رێکخستنیان لەناوچە لادێ نشینەکاندا دامەزراند، ئەم پرۆسەیە گۆڕانی بەسەردا هات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەدەکرا ناکۆکیی‌و دوبەرەکی لەنێوان سیاسییە ناوچەیی‌یەکان‌و کاربەدەستانی هەرێمەکان رو نەدا سەرەنجام ئەو ناکۆکیی‌و دوبەرەکیی‌یە بەوە چارەسەر دەکرا کەکاربەدەستانی هەرێمەکان سیاسییەکانیان بۆ ناوچەی تر دور دەخستەوە.

لەراپرسیی‌یەکدا کە ساڵی ١٩٥٦ بۆ پێوانی یەکێ لەو رەهەندانەدا بەرێوە چوە کە لەچوارچێوەی گوشارە سیاسییەکانی کاربەدەستە خۆماڵییەکاندا هەڵدەسوڕێن، یەکێ لەو پرسیارانەی کەئاراستەی فەرمانبەرە رەسمییەکان کران

---

21-See S.N Eisen atad, op –sit .P, p 120, 167.
22-Joseph Szyliowicz , political change in Rural, Erdemli, The Hague, Netherland, 1966.

ئەوە بوو کەئایا تۆ لەڕێی ئەو دەستێوەردانە سیاسییانەوە هاتوی کەرەنگە بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری گشتی زیانبەخش بن. وەڵامەکان بەمجۆرە بون: ١٤٪ وتیان زۆر پێدەچێ وابێ، ٣٨٪ وتیان هەندێ جار وایە، ٤٠٪ وتیان ئەمە شتێکی بەدەگمەنەو تەنها ٨٪ وەڵامیان نەدایەوە. پرسیارێکی دیکەش ئاراستەی کاربەدەستە خۆماڵییەکان کرا دەربارەی ئەو دانیشتوانەی کەوەك میانکار(وسیط) خواستەو داواکانی هاوڵاتییانیان پێ گەیاندون. زۆرتر لەدو لەسەر سێی کاربەدەستانی هەرێمەکان(٦٥٪) ئەندامانی حزبە سیاسییەکانیان وەك میانکار یاداشت کرد[٢٣]. ئەو وەڵامانە ئەو گوشارە دەردەخەن کە کەوتبوە ئەستۆی بیرۆکراسییەوەو گرنگیی ئەو گوشارە لەو کاتەدا دەردەکەوێ کە لادێ نشینە تازەکان بەدەروازەی دادەنێن بۆ خۆ گەیاندن بەحکومەت بۆ ئەوەی دەستی کۆمەکیان بۆ درێژ بکات تا هەلومەرج و بارودۆخی خۆیانی پێ چاك بکەن. لەسۆنگەی ئەمەوە، ئەو زانیارییانەی کەلێکۆڵینەوەکەی ئەردەملی لەساڵی ١٩٥٧دا هەڵی رشتوە، دەری دەخەن کەجوتیارانی تورکیا کاریگەرییەکی ئیداری و سیاسیی دیاریان هەیەو بەهۆی ئەمەوە کاربەدەستە خۆماڵییەکان نەك هەر رۆڵی بوژێنەری ژینگە لادێیەکەیان دیوە بەڵکو فرە هەوڵیشیان داوە وا لەدانیشتوان بکەن هەست بەقازانجە هاوبەشە گشتییەکانی پرۆژەکان بکەن و لەم روەوە لەسیاسەتمەدارە خۆماڵییەکان سەرکەوتوتر بون. دەشێ ئەم دیاردەیە لەسەر ئاستێکی تیۆریکی گفتوگۆی تری لەسەر بکرێ. دیارە بۆ حکومەتەکانی وڵاتە گەشەکردوەکان زۆر هاندەر هەیە بۆ ئەوەی ئەو حکومەتانە دەست بەهەڵسوڕاندنی پرۆژەکانی پەرەپێدانی لادێ بکەن یاخود بەواتەیەکی راستتر دەسپێشخەریی ناوچەیی پەرە پێ بدەن. ئەم دەسپێشخەرییەش ئەگەر لەگەڵ هەندێ نمونەی تری گەشەکردندا بەراورد بکرێ، هاوتەریبە لەگەڵ بەشداریی سیاسیی هاوڵاتیی

23-See T. Feyzovlu Q others, survey of District and provincial Admin: strators, Ankara, 1957.

خۆماڵیو زۆرجاریش ئەو دەسپێشخەریە تێدەپەڕێنێ. لەبەر ئەوە رگس وای بۆ دەچێ کەبیرۆکراسیی ناوەندی لەناو کۆمەڵدا لەسەر حیسابی هێزی هێزە سیاسییەکان پەرەی سەندوەو باسکی ئەستور بوەو سەرەنجام لەسەر حیسابی هێزی حزبە سیاسییەکانی ناو کۆمەڵ پەرەی سەندوە[24].

ئامارەکانی تورکیا ئاماژە بەوە دەکەن کەدەشێ بەسیاسەت کردنی کۆمەڵ نەبێتە هۆی باڵادەستیی دەسپێشخەریی خۆماڵی بەڵام بیرۆکراسی بۆ ئەم کارە بەشایستە دادەنرێ چونکە زانیارییەکانی سەبارەت بەچالاکیی کاربەدەستە خۆماڵییەکان لەساڵی ١٩٥٦دا- بەپێی ئاستی سەرکەوتنی بەدەستهاتوی وەزارەتی ناوخۆ لەساڵی ١٩٦٥دا-دەریدەخەن کە کاربەدەستە خۆماڵییەکان بەوەی کەتوانیویانە بگەن بەپۆستی حوکمڕانی هەرێم(خشتەی ژمارە٥) سەرکەوتنی باشتریان بەدەست هێناوە. بەدەست هێنانی ئەم پۆستە ئەوەندەی پشت ئەستورە بەهەوڵو کۆششیان بۆ رمێن پەیداکردن بۆ پرۆژەکانی کاری گشتی ئەوەندە پشت ئەستور نیە بە بەشداریی خۆماڵی. لەبەر ئەوە گەیشتن بەو پۆستە ئەوەندەی وەك پۆستێکی سیاسیی ئاست باڵا دێتە بەرچاو ئەوەندە وەك پلە بەپلە گەیشتن بەپۆستێکی دیاریکراو دەرناکەوێ.

ئەمە بەو مانایە دێ کەئەو کاربەدەستانەی بانگەشە بۆ جێبەجێ کردنی پرۆژە گشتییەکانی کار دەکەنو لەگەڵ ئەوەدا نین کەهانا ببرێتە بەر بەکارهێنانی هێزی کارکەری خۆماڵی، ئەو توانایەشیان هەیە کەسەرکەوتنی سیاسیو ئیداری تێکهەڵکێشی یەکتری بکەن[25]. بەم ئاستە، دیموکراسی وەك فاکتەرێکی گۆڕاو دێتە بەرچاو کەبەشدارە لەکار کردنە سەر پرۆسەی سیاسیو سەرەنجام کاریگەریش دەخاتە سەر رژێمی سیاسیی تورکیا. بەڵام لەبەرامبەردا ئایا رژێمە سیاسییەکە کەپشت ئەستورە بەفرە حزبایەتی، دەتوانێ کاریگەری

24-S.N. Eisenstadi, op- cit. Pp.132.135.
25-Noralou P. Roos and Leslis L. Roos, Jr, changing patterns of Turkish public Admin: stration, Middle Eastern stubues, volume 4, No.3, April 1968, pp 282-283.

بخاته سەر رۆڵی بیرۆکراسی لەتورکیا؟ لەم روەوە دەبێ ئەوە بزانرێ کە لەوەتەی بەرفراوانبونی گرژیی سیاسەتەکانی تورکیا کەوتۆتە پشت بەستن بەنوخبەی سیاسیو بیروکرات، ئەم نوخبەیە وەك لایەنێك لەهاوکێشەکەدا دەستی بەدەرکەوتن کردو بەم پێیە نوخبەی بیروکرات لەنەبەردایە بۆ پاراستنی رژێمە کۆنەکەی هێز لەدژی پەرەسەندنی ناوچەگەرێتیی سیاسی[26] *

سیاسەتەکانی تایبەت بەفرە حزبی، تارادەیەك، کاریگەرییان هەبو لەسەر ورووژاندنی بیرۆکراسی لەتورکیا. لەم روەوە خشتەی ژمارە -٥- زیادبونی رێژەی نوێنەرایەتی کردنی نەوەی کشتیارانو زەویداران لەخزمەتی مەدەنیدا بەبەراورد لەگەڵ دابەزینی رێژەی نوێنەرایەتی کردنی نەوەی کارمەندە رەسمییەکان لەهەمان خزمەتدا دەردەخا[27].

## پەرەسەندنی ئابوریو پێکهاتەی حزبایەتی

لەسالآنی پەنجادا کاتێك حزبی دیموکرات لەسەرکار بوو، بەرادەیەك هەوڵ درا پەرە بەکشتوکاڵ بدرێ کەلەئەنجامدا کشتوکاڵ هەمو سەرچاوە سەرەکییەکانی گەشەی خۆی لەدەستدا، بەتایبەتی لەروی مەکینەکانی کێلآنی زەوییەوە. لەهەمان کاتیشدا پیشەسازیی کەرتی تایبەت تا ئەندازەیەکی زۆر نێونجی سەرمایەگوزاریی خۆی لەکشتوکاڵدا کەم کردەوە. لەئاکامدا کشتوکاڵ جەزرەبەی بەرکەوت.

لەسایەی ئاماری تازەدا، حکومەتی تورك ئەوەی بەسەر هەندێ کۆمپانیادا سەپاند کەئاڵوگۆڕی دەرەکی، بەمەبەستی سەرمایەگوزاری، زیاتر لەکالآکانی بەکاربردن پەرە پێ بدەن.

---

26-See Kemal Karpat, society,Economics and politics in contemporary Turkey, in world politics, xv, 1 October 1964.

* لەتورکیا وشەی ناوچەگەرێتی زیاتر دانیشتوانی لەدایکبوی دەرەوەی ناوچەی رۆژئاوا دەگرێتەوە.

27-T. Feyzioglu a others, op-cit, p-112.

تـا سـالآنی سـەرەتای شەسـتەکان، تورکیـا لـەناو ولآتـە خـاوەن ئابوریـیـە گەشـەکردوەکاندا دوا ولآت بــوو کــە لەبــەرێوەبردنی ئــابوریی تێکــەلآودا پــەیڕەویی لەسیســتمی نەخشــەدانانی ســەرتاپاگیر دەکــردو لــەم رەوتــەدا دامودەزگایەکی بۆ نەخشەکێشان دروست کردبو کەئـەرکی سەرشـانی بـوو دو نەخشـەی یـەك لـەدوای یـەك دارێـژێ، کەهـەر یـەکێکیان بـۆ ۱۰ سـالّ بـوو، بەمەبەستی بەدی هێنانی گەشەیەکی ئابوری بەرێژەی ۷٪ لەساڵێکدا لەماوەی نێــوان ۱۹٦۳-۱۹۷۷دا. ئەگــەرچی نەخشــەدارێژەکان دانیــان بــەوەدا نــابو کەچەندان فاکتەر بۆ گەشەکردنی نەتەوە گرنگن بەلآم زیــاتر جـەختیان لەسـەر ئـەوە کـرد کـەنێونجی پاشـەکەوتکردن‌و بـەردەوام بەگەرکـەوتنی سـەرمایەکانی داهاتی نەتەوەیی‌ی گشتلایی پەرە پێ بدەن[28].

لەیەکەم نەخشەی پێنج ساڵەی ۱۹٦۳-۱۹٦۷دا جەخت لەسەر پێشخستنی کشتوکاڵ کرا لەرێی گرنگیدان بەپێشخستنی ئامرازەکانی. بەلآم زۆری نـەبرد نەخشەدارێژەکان بیری خۆیان گۆڕی‌و لەبـەر دژواریـی مسـۆگەرکردنی گۆڕانـی خێرای کەرتی کشـتوکاڵ رویـان کـردە پیشەسـازی‌و بایـەخێکی زۆریـان پێـدا. لەئاکامدا دەبینین لەلیسـتی مەسـەلە گرنگـەکاندا پیشەسـازی لـەچوارچێوەی هــەردو نەخشــە ســەرکەوتوەکەی ســالآنی ۱۹٦۸-۱۹۷۳و ۱۹۷۳-۱۹۷۷دا جێیەکی شایستەی هەیە. هەمان شت لەنەخشـەی چوارەمـی سـالآنی ۱۹۷۸-۱۹۸۲دا سەرنجی دەدرێتێ کەتێیدا هەمدیس جـەخت کرایـە سـەر پاشـەکەوت کردن، سەرمایەگوزاری‌و فراوانکردنی پیشەسازی.

ئـەو نەخشـانە بـەزۆر بەسـەر کـەرتی گشـتیدا سـەپێنران بـەلآم بـۆ کـەرتی تایبەت لەئامـاژە بەولاوە هیچی دی نەبون، ئەگـەرچی هـەردو حزبـە سیاسـییە سەرەکی‌یەکە(پارتی گەلی کۆمارو پارتی عـەدالـەت) لەرێوشـوێنی وروژاندنـی کەرتی پیشە ئازادەکانیان کۆڵی بۆوە کەدەسەلآتێکی فرەی پەیدا کردبو. بۆیـە

---

28-Morris singer, The Economic Performance of the Turkish Republic, Middle Eastern studies, volume 20 Number 9, October 1989, pp, 150-159.

پارتی گەلی کۆمار لەبەرنامەی ساڵی ١٩٦١دا پشتیوانیی لەکەرتی تایبەت کردو کاتێك ئەو حزبە رابەری هاوپەیمانیی حکومیی سالانی ١٩٦١-١٩٦٥ بوو، هەم لەرووی دارایی‌یەوە پیشەسازیی تایبەتی هاندا هەم لەرووی دراوەوە.

بەهەمان پێودانگ، پارتی عەدالەت کە لەکۆتاییی ساڵی ١٩٦٥ـەوە تا مانگەکانی هەوەڵی ساڵی ١٩٧١ دەسەلاتی بەدەستەوە بوو، رۆڵێکی تارادەیەك فراوانی بۆ پیشەسازیی تایبەت تەرخانکردو بەکردەوە پەرەی بەبەکارهێنانی حافزی باج دابو. ئەمە بەو واتایە نایە کەهەردو حزبە سەرەکییەکە نوێنەرەوەی بەرژەوەندیی گروپی تایبەت بون چونکە تۆکمەییی سیاسیی ئەو دو حزبە لەچاو حزبەکانی دی بەوە بەسترابۆوە کەتوانیبویان بەرژەوەندیی چەندەها گروپی کۆمەلایەتی پێکەوە گرێ بدەن[٢٩].

لەبەر ئەوە دروستە بەئیجابی بڕوانینە پەیوەندیی نێوان رێژەی خۆماڵیی هاوبەشی دەنگەکانی هەردوو حزبە سەرەکییەکەو نێوان چەندەها ئاماژەی خۆماڵیی پەرەسەندو(وەك شارنشینی، فێرکردن، رێژەی ئەو دانیشتوانەی کەگرەنتی(زەمانە)ی کۆمەلایەتییان هەبو، هی تر) چونکە رێژەی دەنگی بەدەستهاتوی هەردو حزبەکە بەشێوەیەکی ئیجابییانە بەتوخمە خۆماڵییەکانی هەر ناوچەیەکەوە بەسترابۆوە(وەك گەشەی رێکخراویی و کەلتوری، شارنشینی، پیشەسازی). ئەمەش دەشێ لەنەخشەی ژمارە ٦دا تێبینی بکرێ[٣٠].

لەخشتەکەدا دەردەکەوێ کەمەیل بەلای دو حزبەکەدا بەڕونی لەناوچە پێشکەوتوەکانی هەرێمەکەدا بەهێزترە. بەدارشتنەوەی سەرلەنوێی واژەکە، دەردەکەوێ کەمۆدێرنیزەکردنی ئابوری- کۆمەلایەتیی تورکیا بەشێوەیەکی ئیجابی بەپەیدابونی سیستەمی حزبایەتییەوە بەستراوەتەوە.

---

29-Huntington, Samuel pi political order in changing societies. (New Haven and London: Yale university press), 1968, p-20.
30-Ozubudun, Ergun voting behavior: Turkey, pp.107-143 in jacob M. Londan, Ergun Ozbudun, and Frank Tachau (eds) Electoral politics in the Middle East: Issues, voters, and Elites (London: croom Heln).

بەهەر حاڵ، کردنی سیستمی حزبایەتیی تورکیا بەدینەمۆی هێزی سیاسی، بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانە هاوکات بوو لەگەڵ ئاستی ناوخۆیی مۆدێرنیزەی ئابوری- کۆمەڵایەتیداو لەم روەوە دەبینین کێشی فاکتەری یەکەم(واتە گەشەی رێکخراوەییو کەلتوری) لەساڵی ١٩٦٩دا(٥٠٨) بوو و لەساڵی ١٩٧٣دا(٢٦٨)، لەکاتێکدا کێشی فاکتەری دوەم(پێشکەوتنو پیشەسازی) لەساڵی ١٩٦٩دا(١٨٠)و لەساڵی ١٩٧٣دا(١١٣)بوو[٣١]. ئەمە بەو مانایە دێ کەجەمسەرگەری لەڕوی رێژە حزبییەکانەوە لەگەڵ پەرەسەندنی داهاتو قازانجدا پەرە دەسێنێو لەگەڵ کەمبونەوەی داهاتدا لاواز دەبێ.

## میکانیزمی سیستمی حزبایەتی

تورکیا پاش شۆڕشی کەمالی لەساڵی ١٩٢٣دا سیستمی تاك حزبیی پیادە کرد بەبێ ئەوەی ئەو سیستمە بکاتە مۆدێلو رمێنی بۆ پەیدا بکا چونکە ریالیزمێك کەشۆڕشەکە پێی ناسرابوو و هەوڵی دەدا تورکیایەکی ئەوروپاییی پێشکەوتو پێك بێنێ، کاری کردبوە سەر ئایدیۆلۆژیا دیموکراتە- عیلمانییەکەی پارتی گەلی کۆماریش کە لەساڵی ١٩٣٢ـەوە تا ١٩٤٦ وەك تاکە حزب چلاکیی نواند. ئەو حزبە نەڕواڵەتو روخسارەکانی رژێمی هەڵگرتو نەبیروباوەڕو دەروێشگەریی بەسەر ئەندامەکانیدا سەپاند. شەرعیەتی حزبەکە لەوەوە نەهاتبو کەنوێنەری چینێکی دیاریکراوە بەڵکو لەوەوە هاتبو کە لەهەڵبژاردندا زۆرینەی دەنگی بەدەست هێناوە. بەپێچەوانەی ئەزمونەکانی تری سیستمە تاك حزبییەکانەوە کە زۆرجار دروستکردنی کۆمەڵێکی بێ چین یان نەهێشتنی بۆچونە پەرلەمانیو دیموکراتییە لبرالەکان دەکەنە بیانوو بۆ سەپاندنی یەك حزب، رژێمی سیاسیی تورکیا هیچ پاساوێکی لەو جۆرەی بۆ پیادەکردنی ئەو چەشنە سیستمە نەهێنایەوە.

دەبێ ئێمە لەلای خۆمانەوە بتوانین لەم مەسەلەیە بکۆڵینەوەو هۆکاری سەردەرهێنانی ئەو سیستمە دیاری بکەین. سەرەتا، ئەو مەسەلانە لەتورکیا

31-Ibid, pp , 129. 135.

دەستنیشـان کرابـون کەپرۆسـەی بنیاتنانـەوەی تورکیـا پێویسـتی‌یەکی زۆری پێیان بوو، بەجۆرێك کەچالاکیی کۆمەلایەتی خرابوە پێش چـالاکیی سیاسـی. مستەفا کەمال لەیـەکێ لـەوتارەکانیدا ئـەم مەسـەلەیە بـەجۆرە گوزارشـت لێ دەکا: "ئەگەر بمانەوێ لەم بـوارەدا سـەرکەوتو بـین، دەبـێ چالاکیمـان لـەبواری کۆمەلایـەتیدا زیـاتر بـێ لـەچالاکیمان لـەبواری سیاسـەتدا"[32]. جگـە لـەوەی کەرژێمـە سیاسـییەکە بۆچونێکـی جیـاوازی دەربـارەی رۆڵو سروشـتی ئۆپۆزیسیۆن‌و بەرهەڵسـتکاری هـەبو. لـەم روەوە عیسـمەت ئینونـو کەسـاڵی ١٩٢٥ حکومەتێکی دیکەی لـەجێی حکومەتەکـەی عـەلی فوئـاد پێکـهێنا، وتویەتی کە"لای ئێمە ئۆپۆزیسیۆن بەمانای شۆڕش یان یاخیبون دێ"[33]. بـەم پێودانگە هەڵوەشاندنەوەی پارتی لیبرال کەساڵی ١٩٣٠ لەلایەن فەتحی بەگەوە دامـەزرابوو، لەسـەر داوای خـودی مسـتەفا کـەمال، لـەو سـۆنگەیەوە بـوو کەحزبەکە ببوە شوێنی کۆبونەوەی ئۆپۆزیسیون بەتایبـەتی لایـەنگرانی ئـاین. بەهەمان پێودانگ رەخنە لەوەش گیرا کـەپارتی گـەلی کۆمـار هـەندێ کەسـی سەربەخۆی هەڵبژاردبوو چونکە بۆچونێکی وا هەبو کەهەڵبژاردنی ئەو کەسانە دەبێتە مایەی پەیدابونی ئۆپۆزیسیون.

پێکهاتەی پارتی گەلی کۆمـار بـوە هـۆی پـەیدابونی چـەندەها فراکسـیون لەناخیدا کەهەر یەکێکیان بەسەرکردایەتی‌ی کەسانی دەسـڕۆی وەك عیسـمەت ئینونـو و جـەلال بایـار بـوو، لـەئاکامدا حزبەکـە بـوو بەچوارچێوەیـەك بـۆ خەفەکردنی ناکۆکییە سیاسییەکان نەك بۆ نەهێشتنی ئەو ناکۆکییانـە، بـەلام خـودی ئـەو فراکسـیونانە بەسـەرەتای هەڵوەشـانەوەی سیسـتمی تـاك حزبـی‌ی تورکیـا دادەنرێـن. کـاتێك جـەلال بایـار لەسـاڵی ١٩٤٥دا پـارتی دیموکراتـی دامـەزراند کـە لەهـەڵبژاردنی سـاڵی ١٩٥٠دا بـە بەدەسـت هێنـانی ٥٥٪ی

[32] سلیم الصویص، مصدر سابق، ص: ٢٣٧.

[33] هەمان سەرچاوە، ل٢٧١.

دەنگی دەنگدەران سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناو ٤٠٨ کورسی‌ی لەپەرلەماندا بۆ خۆی مسۆگەر کرد بەرامبەر بە٣٩ کورسی بۆ پارتی گەلی کۆمار، سیستمی تاك حزبی لەبەر یەك هەڵوەشاو تورکیا ملی بۆ سیستمی جوت حزبی دانەواند. رازی بونی تاکە حزب بەفرە حزبی شتێکی جێی گومانە بەڵام پەرەسەندنی تورکیا لەساڵی ١٩٢٣ بەدواوە کەبەهەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٠ دوایی‌ی هات‌و پاشان بەسەرکەوتنی ئۆپۆزیسیون بەبێ سەرهەڵدانی پاشاگەردانی‌و شێواوی‌و پشێوی، مایەی رەواندنەوەی ئەو گومانە بوو. ئەمەش رێ بۆ سەردەرهێنانی ئەو بۆچونە خۆش دەکا کەئەگەر تەکنیکی تاکە حزب هۆشیارانە پەیرەوی لێ بکرێ، وردە وردە دەبێتە مایەی سەرهەڵدانی چینێکی دەسەڵاتداری نوێ‌و نوخبەیەکی سیاسی‌ی سەربەخۆ. لەلایەکی ترەوە، سیستمی جوت حزبی کەتورکیا تاقی‌ی کردۆتەوە، لەچەشنی جوت جەمسەرە تەکنیکەکانە، واتە بەپێچەوانەی سیستمی جوت جەمسەری میتافیزیکی‌یەوە، پشت ئەستورە بەوەی کەهەردولا فەلسەفە سیاسییە گشتییەکەو بنچینە بنەڕەتییەکانی رژێمەکە قبوڵ دەکەن‌و ململانێکانیان لەچوارچێوەی مەسەلە لاوەکییەکان ناترازێ.

ئەم جوت جەمسەری‌یە تارادەیەك لێڵ‌و تەمومژاوی بوو و زۆر پرسیار لەبارەیەوە هەبو، بەتایبەتی لەماوەی ساڵانی ١٩٥٠-١٩٧٣دا. لەم جوت جەمسەرییەدا رون نەبو ئایا ئەو سیستمە حزبییە گوزارشت لەرواڵەت‌و مەرجەکانی سیستمی دو حزبی دەکا یان رژێمی حزبی دەسەڵاتدار. لەم مەسەلەیەدا دەبینین سارتۆری جەختی لەسەر ئەوە کردوە کەماوەی نێوان ١٩٥٠-١٩٧٣ی تورکیا بەرونی گوزارشت لەسیستمی حزبی دەسەڵاتدار دەکا[٣٤]. بەپشت بەستن بەخشتەی ژمارە ٢ کە لەمەوبەر ئاماژەمان بۆ کردووە، دەردەکەوێ کەپارتی دیموکرات‌و پارتی عەدالەت(کەخۆی بەمیراتگری راستەقینەی پارتی دیموکرات دادەنا)توانیویانە، یەك جاری لێ دەرچێ ئەویش

34-See sartori giovanni, and sayari sabri op. cit.

لەماوەی ١٩٦١-١٩٦٥دا. پێنج جاری یەك لەدوای یەك زۆرینەی رەهای پەرلەمان بەدەست بێنن. بەلآم بەدەست هێنانی زۆرینەی کورسییەکانی پەرلەمان جار لەدوای جار راستیی سیستمی حزبی زاڵ دەرناخا چونکە رێژەی کورسییەکان لەماوەی نێوان ١٩٥٠-١٩٦٠دا شێواوییەکی فرەی بەخۆوە دیوە، ئەویش لەسۆنگەی سیستمی پەیڕەوکراوی هەڵبژاردن. سیستمی دەنگدان بەزۆرینەی یەك خول بەوەی کەناوەندێکی فرە فراوانی دەنگدان دەگرێتە خۆ، رێ بەبراوە دەدا زۆرینە گەلی یە بەرێژە مامناوەنجی یەکان بکاتە زۆرینەی پەرلەمانیی ئەوتۆ کەتای تەرازوی یەك لایەن قورس دەکا. بۆ نمونە، لەهەڵبژاردنی ١٩٥٧دا پارتی گەلی کۆمار توانی پەرە بەسەرجەمی دەنگە بەدەستهێنراوەکانی بداو لە ٣٤,٨٪ ـەوە بیکا بە ٤٠,٨٪ و کورسییەکانی پەرلەمانیش لە٧,٥٪ ـەوە بکاتە٢٩,٢٪ کەچی ئەوەی پارتی دیموکرات بەدەستی هێنا ٥٠٪کەمتر بوو[٣٥].

سەربار، دەسکاری کردنی یاسای هەڵبژاردن لەو کاتەدا کەپارتی دیموکرات پێش هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٧ پەرلەمانی کۆنترۆڵ کردبوو، رێی نەدا حزبە سیاسییەکان ببنە هاوپەیمانی یەکتری. بەبێ ئەو دەسکاری کردنە، پارتی دیموکرات نەیدەتوانی باری خۆی لەهەڵبژاردندا پتەو بکا، بۆیە ماوەی نێوان ١٩٥٠-١٩٦٠ ئەوەندەی دەرخەری سیماو رواڵەتەکانی سیستمی دو حزبی بوو ئەوەندە نمونەی دەسەلآتی رونی تاکە حزبێك نەبو.

لەهەڵبژاردنی ١٩٦٥-١٩٦٩دا مەسەلەکە جیاواز دێتە پێش چاو چونکە پارتی عەدالەت نەك هەر زۆرینەی رەهای کورسییەکانی پەرلەمانی بەدەست هێنابو بەڵکو بەڕونی تێکڕای دەنگەکانیشی کۆنترۆڵ کردبو لەرێی دورخستنەوەی دەنگی لایەنگرانی پارتی گەلی کۆمار. هەر ئەمەشە کەوامان لێ دەکا بتوانین سیستمەکە بەسیستمی حزبی زاڵ بناسێنین بەلآم ئەم زاڵی یە هێندەی پێ نەچو لەهەڵبژاردنی ساڵی ١٩٧٣و١٩٧٧دا هەرەسی هێناو ئاسەواری رەوییەوە.

---

35-Ernu Ozbudun , op - cit.

بەگشتی، پێکهاتەی حزبیی تورکیا دو جۆری جیاوازی جەمسەرگەریی نیشان داوە، جۆری جەمسەرگەریی سنوردار لەماوەی نێوان ١٩٦١-١٩٧٧داو جۆری جەمسەرگەریی فرە لایەن و(تاڕادەیەك) ئایدیۆلۆژی لەساڵی ١٩٧٧دا.

لەجۆری جەمسەرگەریی سنورداردا دەکرێ بگوترێ کەسیستمی حزبایەتی پشت ئەستور بوو بەچەند پێکهاتەیەکی حزبیی بنچینەیی، ئەگەرچی هەندێ حزبی بچوکیش هەبو. ئەو پێکهاتە حزبییە بنچینەییانەش توانی بویان هاوسەنگیی رادەی جەمسەرگەری تا ئەندازەیەك راگرن، ئەگەرچی هەوڵێکی زۆریش لەئارادا بوو بۆ دورخستنەوەی ئەو پێکهاتانە لەناوەند لەسۆنگەی پەیدابونی حزبی تازەوە. لەم روەوە راکێشان بەلای دەرەوەدا کە لەشەستەکانی سەدەی رابردودا لەتاو پەیدابونی پارتی کاری تورکیا سەری هەڵدا، لەپارتی گەلی کۆمارەوە دەستی پێکردو وای لەو حزبە کرد هەڵسوکەوتێکی بەئاشکرا میانڕەوو هێدی رەوت بنوێنێ.

بەڵام هەندێ رەهەندی تایبەت بە بەرهەڵستی کردنی میکانیزمی فرە حزبیی میانڕەو تاڕادەیەکی زۆر بوە هۆی نەشونماکردنی ئایدیۆلۆژیای جەمسەرگەریی و بەم پێیە لەبری"هەنگاونان بەرەو ناوەند"(ناوەندێك کەزۆربەی کات بەتاڵ بوو) دەست بەوە کرا کەسیستمی حزبایەتی لەناوەند دور بخرێتەوە. هاوکات لەگەڵ گەشەکردنی جەمسەرگەریدا، زەبروزەنگی سیاسیش پەرەی سەندو تێوەگلان لەو تیرۆریزمە رویدا کەهەندێ گروپی بچوکی خاوەن ریکخستنی تۆکمە پشتیوانییان لێ کردو کردیان بەرێبازی خۆیان[٣٦]. لەم سەروبەندەدا، بەپێچەوانەی مەیلی جەمسەرگەرییانەی پارتی کاری تورکیاوە، پارتی چالاکیی نەتەوەیی زیاتر بەلای دورکەوتنەوە لەناوەنددا، بەرەو دەستە راستی پارتی عەدالەت، دایشکاند. بەڵام لەباتی ئەوەی پارتی عەدالەت رادەی

36-Sayavi sabri , op- cit, pp, 49-52.

جەمسەرگەری خەفە بکا، لەماوەی نێوان ١٩٧٣-١٩٧٧دا بەرەو ڕاستڕەوییەکی توندڕەو، دور لەناوەند، ڕێگای گرتەبەر[٣٧]. ئەوی ڕاستی بێ لێرەدا دەردەکەوێ کەچەند جەمسەرگەری لەناوەند دور کەوتبێتەوە، بەتایبەتی لەنێو باڵی ڕاستڕەودا، هێندەش بەرەنگاری کردنی سیستمی حزبیی تورکیا توندوتۆڵتر بوە.

37- Ibid, p - 50.

## کۆبەند

- دینامیکیزمی سیستمی حزبیی تورکیا چەند روخسارێکی پێشبینیکراوی گۆڕانی پێکهاتەی سیستمەکە دەردەخا، بەلایەنی کەمەوە لەمەودای نزیك. زیادبونی رادەی جەمسەرگەری یەکێکە لەو روخسارانەو لەم روەوە دەبینین دورکەوتنەوە لەناوەند، چ بەلای راستداو چ بەلای چەپدا، دیاردەیەکی توندوتۆڵە. بەم پێیە، نوێنەری سەرەکیی راستڕەوەکان ( پارتی عەدالەت) لەماوەی ١٩٧٣-١٩٧٧دا پەرەی بەرێژەی دەنگە بەدەستهێنراوەکانی خۆی داو لە ٩.٨٪ ەوە کردی بە ٣٦,٩٪ و رێژەی کورسییەکانی لە ٣٣,١٪ ەوە کرد بە ٤٢٪ میراتگران‌و پشتیوانانی پارتی عەدالەتیش ( واتە پارتی نیشتمانی دایك‌و پارتی ریی راست) لەهەشتاکاندا، لەهەر سێ هەڵبژاردنەکەی ١٩٨٣، ١٩٨٤، ١٩٨٦دا یەك لەدوای یەك رێژەی ٥٣٪ و ١٣,٣٥٪ و ٢٣,٥٪ یان بەدەست هێنا. نوێنەری سەرەکیی چەپەکانیش ( پارتی گەلی کۆمار) بایی ١٤٪ی دەنگە یاسایییە تێکڕاکان رێژەی دەنگەکانی خۆی پەرە پێدا. ئەو رێژەیەش بەسەر ماوەی نێوان ١٩٦٩-١٩٧٧دا دابەش بوە. بەڵام ئەو حزبانەی کەبە میراتگری سیاسیی پارتی گەلی کۆمار دەژمێردرێن، واتە پارتی گەل ( پێکهێنراوی ساڵی ١٩٨٣ )و پارتی سۆسیال دیموکرات ( پێکهێنراوی ساڵی ١٩٨٤) و پارتی چەپی دیموکرات (پێکهێنراوی ساڵی ١٩٨٥)، لەهەڵبژاردنی ساڵی ١٩٨٦دا تەنها ٢٢,٧٪ی دەنگەکانیان بەدەست هێنا، لەکاتێکدا لەدوا هەڵبژاردندا پارتی چەپی دیموکرات تەنها ٨,٧٪ ی بەدەست هێنا. ئەمەش هانمان دەدا ئەو بۆچونە لەلای خۆمان گەڵاڵە بکەین کەڕاستڕەوەکان (بەهەموو گروپ‌و لایەنەکانەوە) لەساڵانی هەشتای سەدەی بیستەمدا لەچەپەکان زیاتر دەنگی قانونییان بەدەست هێناوە.

-ئەو حزبانەی کەپشتیوانییان لەوە دەکرد کەسوپا بۆی هەیە خۆی لەژیانی سیاسی بگەیەنێ، لەپاشەکشەدان. بە بەراورد لەگەڵ ئەو کاتەی کەبۆلەند

ئەجەویت (پشتیوانی دەستێوەردانی سوپا) لەهەڵبژاردنی ١٩٦٩دا ڕێژەی ٢٧,٤٪ی دەنگەکانی بەدەست هێنا، دەبینین پارتی دیموکراتی نیشتمانی (پشتیوانی کودەتای ١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠) لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٨٣دا تەنها ١٧,٨٪ی دەنگەکانی بەدەست هێنا، لەکاتێکدا پارتی چەپی دیموکرات ( کە ئەجەویت سەرکردە روحی یەکەی بوو) تەنها ٨,٧٪ی بەدەست هێنا کەرێژەیەکە کەمترە لەرێژەی ١٠٪ی پێویست بۆ چونە ناو پەرلەمان. ئەمەش شتێکی گونجاو بوو لەگەڵ بۆچونەکانی حکومەتی کینان ئیڤرین کەدەیویست تورکیا تا ساڵی ١٩٩٠، بەبێ دەستێوەردانی سوپا، بگاتەوە بەدیموکراسییەکی پتەو.

-سەرەڕای پەرەسەندنی مەترسیی دیاردەی ئیسلامی سیاسی لەتورکیای ساڵانی حەفتاو هەشتای سەدەی رابردودا، رەهەندی عیلمانیی سیاسەتی تورکیا توانی ئیسلامی سیاسی بپوکێنێتەوە. کزبونی رۆڵی حزبە دینییەکان لە ژیانی سیاسیدا لەرێژەی ئەو دەنگانە دەردەکەوێ کەئەو حزبانە لەهەڵبژاردنی پەرلەماندا بەدەستیان هێناوە. لەم سەروبەندەدا پارتی رزگاریی نیشتمان ( کەرەهەندێکی ئیسلامیی هەیە) لەهەڵبژاردنی تشرینی یەکەمی ١٩٧٣دا ١١,٩٪ی دەنگەکانی بەدەست هێنا، لەکاتێکدا پارتی رەفا کەبەمیراتگری پارتی رزگاریی نیشتمان دەژمێردرێ لەهەڵبژاردنی ١٩٨٤دا تەنها ٤,٧٦٪ی دەنگەکانی بەدەست هێنا.

-حزبە سیاسییەکان، دو حزبە سەرەکییەکەی پارتی عەدالەتو پارتی گەلی کۆماریان لێ بترازێ، حزبی فشوڵو پڕو پوچن بەجۆرێك کە لەهەلومەرجی جیا جیادا زۆر ئاسان بوو هەڵبوەشێنرێنەوە بەڵام سەرەڕای ئەمە هەندێ لەو حزبانە توانییان خۆیان بگەیەنە ناو پەرلەمانو هەڵوێستەکانیشیان کاریگەریی دیاری لەسەر زیادکردنی داشکاندن بەلای راستڕەویدا یان بەلای چەپڕەویدا هەبو، وەك لەپارتی چالاکیی نەتەوەییو پارتی کاری تورکیادا دەردەکەوێ. بەڵام حزبە سەرەکییەکان لەکاتی هەڵبژاردنی پەرلەماندا توانییان بەلای

خۆیاندا رایانکێشن بەجۆرێك کسیستمی حزبایەتیی تورکیا وادەهاتە بەرچاو کسیستمێکی جوت جەمسەرەو هەر جەمسەرێکی لەتوانایدایە کۆمەڵە حزبێك بەلای خۆیدا راکێشێ، هەندێکی بەلای راستڕەویداو هەندێکی دیکەی بەلای چەپدا.

-یەکەم کودەتای ساڵی ۱۹٦۰و دووەم کودەتای ساڵی ۱۹۷۰و سێیەمی ساڵی ۱۹۸۰ دەستێوەردان بون بۆ رێ گرتن لەڕەودانی جەمسەرگەری لەسیاسەتەکانی تورکیاداو کەم کردنەوەی ناتەباییی نێوان هێزە سیاسییەکان چونکە ناتەباییی ساڵانی پەنجای نێوان پارتی گەلی کۆمارو پارتی دیموکرات تا ساڵانی شەستیش درێژەی کێشا، کاتێك پارتی عەدالەت چوە جێی پارتی دیموکراتو تاڕادەیەك تا هەشتاکانیش درێژەی کێشاو خۆی لەململانێو ناتەباییی نێوان پارتی دیموکراتی سۆسیالیستو پارتی رێی راستدا نواند.

خشتەی ژمارە-١-

| قۆناغ | پرنسیپە بنەڕەتییەکانی شۆڕشی کەمالیستی | کەمالیزم | تورکیزم | ئەتاتورک |
|---|---|---|---|---|
| سیستمی تاك حزبی | ١,١٥٨ | هیچ | ٠,١٨٣ | ٠,١٢١ |
| سیستمی فرە حزبی | ٠,٩٢٧ | هیچ | ٠,٠٧٢ | ٠,١٢٦ |

## خشتەی ژمارە-٢-

## رێژەی دەنگەکان و رێژەی کورسییەکان لەپەرلەمانی تورکیا (١٩٥٠-١٩٧٧)

| ساڵی هەڵبژاردن | دیموکرات و عەدالەت | گەلی کۆمار | نەتەوە | ئازادی |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٥٠ | ٥٣,٣ (٨٣,٨) | ٣٩,٨ (١٤,٢) | ٣ (٠,٢) | |
| ١٩٥٤ | ٥٦,٦ (٩٣) | ٣٤,٨ (٥,٧) | ٤,٧ (٠,٩) | |
| ١٩٥٧ | ٤٧,٧ (٦٩,٥) | ٤٠,٨ (٢٩,٢) | ٧,٢ (٠,٧) | ٣,٨ (٠,٧) |
| ١٩٦١ | ٣٤,٨ (٣٥,١) | ٣٦,٧ (٣٨,٤) | ١٤ (١٢) | |
| ١٩٦٥ | ٥٣,٩ (٥٣,٣) | ٢٨,٧ (٢٩,٨) | ٦,٣ (٦,٩) | |
| ١٩٦٩ | ٤٦,٥ (٥٩,٩) | ٢٧,٤ (٣١.٨) | ٣,٢ (١,٣) | |
| ١٩٧٣ | ٣٩,٨ (٣٢,١) | ٣٣,٣ (٤١,١) | ١,٥ - | |
| ١٩٧٧ | ٣٦,٥٩ (٤٢) | ٤١,٤ (٤٧,٣) | | |

| تورکیای نوێ | کار | چالاکیی نەتەوەیی | یەکبون | هاوپەیمانیی کۆمار | دیموکرات (١٩٧٠) | ڕزگاری نیشتمانی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | | |
| | | | | | | |
| | | | | | | |
| ١٣,٧(١٤,٤) | | | | | | |
| ٣,٧ (٤,٣) | ٣ (٣,٣) | ٢.٢ (٢,٤) | | | | |
| ١,٣ (١,٣) | ٢,٧ (٠,٤) | ٣ (٠,٢) | ٢,٨ (١,٨) | ٦,٦ (٣,٣) | | |
| | | ٣,٤ (٠,٧) | ١,١ (٠,٢) | ٥,٣ (٢,٩) | ١١,٩(١٠,٥) | ١١,٨ (٠,٧) |
| | ٥,١ - | ٦,٤ (٣,٦) | ٠,٤ - | ١,٩ (٠,٧) | ١,٩ (٠,٢) | ٠,٦ (٠,٣) |

تیبینی:

ژمارەی یەکەم ڕێژەی دەنگەکان و هی دوەم ڕێژەی کورسییەکان دەردەخا.

## خشتەی ژمارە-٣-

### أ-حزبە سیاسییەکانو حکومەتە فرە لایەنەکان(١٩٦٠-١٩٧٠)

| کودەتا | حزبە سیاسییەکان | حکومەتە فرە لایەنەکان |
|---|---|---|
| ١٩٦٠ | پارتی گەلی کۆمار<br>پارتی عەدالەت<br>پارتی تورکیای نوێ<br>پارتی جوتیاریی کۆمار<br>پارتی جوتیاریی نیشتمانی<br>پارتی بڕوایی‌ی کۆمار | *١٩٦١: پارتی عەدالەتو پارتی گەلی کۆمار.<br>*١٩٦٢: پارتی گەل، پارتی تورکیای نوێو پارتی جوتیاریی کۆمار.<br>*١٩٦٣: پارتی گەلی کۆمارو بێلایەنەکان.<br>*١٩٦٥: پارتی عەدالەت، پارتی تورکیای نوێو پارتی جوتیاریی نیشتمانی |

### ب-حزبە سیاسییەکانو حکومەتە فرە لایەنەکان(١٩٧١-١٩٨٠)

| کودەتا | حزبە سیاسییەکان | حکومەتە فرە لایەنەکان |
|---|---|---|
| ١٩٧١ | پارتی عەدالەت<br>پارتی گەلی کۆمار<br>پارتی بڕوایی‌ی کۆمار<br>پارتی پارێزگاری کۆمار<br>پارتی رزگاریی نیشتمان<br>پارتی چالاکیی نەتەوەیی<br>پارتی دیموکرات | *١٩٧١: پارتی عەدالەت، پارتی گەلی کۆمار، پارتی بڕوایی‌ی کۆمار، ئەفسەری بێلایەنی خانەنشین، پەرلەمانتاران.<br>*١٩٧٢: بەهەمان شێوە.<br>*١٩٧٤: پارتی گەلی کۆمارو پارتی رزگاریی نیشتمان.<br>*١٩٧٧: پارتی عەدالەت، پارتی رزگاریی نیشتمانو پارتی چالاکیی نەتەوەیی.<br>*١٩٧٨: پارتی دیموکرات، پارتی بڕوایی کۆمارو بێلایەنەکان. |

ج-حزبه سیاسییه‌کان‌و حکومه‌ته فره لایه‌نه‌کان له‌١٩٨٠ به‌دواوه

| کوده‌تا | حزبه سیاسییه‌کان | حکومه‌ته فره لایه‌نه‌کان |
|---|---|---|
| ١٩٨٠ | پارتی نیشتمانی دایك<br>پارتی گه‌ل<br>پارتی دیموکراتی نیشتمانی<br>پارتی سۆشیال دیموکرات<br>پارتی ره‌فا<br>پارتی چه‌پی دیموکرات | *١٩٨٤: هه‌موو حزبه‌کان جگه له‌پارتی ره‌فا.<br>*١٩٨٦: هه‌موو حزبه‌کان جگه له‌پارتی ره‌فاو پارتی چه‌پی دیموکرات. |

## خشتەی ژمارە -٤-

## دیاردەی لەتبونی حزبەکان

أ-لەماوەی نێوان ١٩٦٠-١٩٧٠دا

| حزب | حکومەتی فرە لایەن | لەتبون | جیابونەوەکان |
|---|---|---|---|
| ٦ | ٤ | ٣ | *١٩٦١: جیابونەوەی پارتی عەدالەت لەپارتی دیموکرات.<br>*١٩٦٥:جیابونەوەی پارتی نیشتمانی لەپارتی جوتیاریی کۆمار.<br>*١٩٦٧: جیابونەوەی پارتی بڕوایی‌ی کۆمار لەپارتی گەلی کۆمار. |

ب-لەماوەی نێوان ١٩٧١-١٩٨٠دا

| حزب | حکومەتی فرە لایەن | لەتبون | جیابونەوەکان |
|---|---|---|---|
| ٧ | ٥ | ١ | *١٩٧٢: جیابونەوەی پارتی پارێزگاری کۆمار لەپارتی گەلی کۆمار. |

ج-لەماوەی ١٩٨٠ بەدواوە

| حزب | حکومەتی فرە لایەن | لەتبون | جیابونەوە |
|---|---|---|---|
| ٧ | ٣ | نیە | نیە |

## خشتەی ژمارە ٥

### مەزەنەکردنی نێونجی لادان لەلای کاربەدەستانی هەرێمەکان لەگەڵ پێشینەی کۆمەلاّیەتیی جیاجیایان

| نموە | ڕێژەی دەرچووان لەوەزارەت ١٩٥٦-١٩٦٥ | ڕێژەی گوێزراوان لەشوێنی جیاجیاوە ١٩٥٦-١٩٦٥ | نێونجەکانی لادانی تەواو ١٩٥٦-١٩٦٥ |
|---|---|---|---|
| نموەی کارمەندە رەسمییەکان (ژمارە: ١٣٤) | ٪٣٣ | ٪٢٧ | ٪٦٠ |
| نموەی کشتیاران‌و زەویداران (ژمارە: ٦٤) | ٪١٧ | ٪٣٥ | ٪٥٢ |

## خشتەی ژمارە -٦-

| ساڵ | کێشی فاکتەرەکان | |
|---|---|---|
| | گەشەی ڕێکخراوەیی | شارنشینی‌و پیشەسازی |
| ١٩٦٩ | ٦٥٩ | ٢٦٦ |
| ١٩٧٣ | ٥٠٢ | ٢٢٥ |

# تەوەری یەکەم

## پێکهاتەو دەسەڵاتی دامەزراوی سوپا لەتورکیا

د. ئەحمەد نوری نعیمی[*]

دەوڵەتی عوسمانی بەوە لەدەوڵەتانی تر جیا دەکرێتەوە کە دەوڵەتێکی جەنگاوەر بوە چونکە ئەو دەوڵەتە بەردەوام لە جەنگدا بوەو هەمو تواناکانی بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ پتەوکردنی هێزە سوپاییەکانی تەرخان کردبوو. رەگی ئەم مەیلە دەچێتەوە سەر گروپە خێڵەکییەکانی تورك لە ناوەڕاستی ئاسیا لەسەدەی شەشەمەوە[1].

لەم بارەیەوە مێژونوسی ئینگلیز ئارنۆڵد تۆینبی وتویە((رێوشوێنی عوسمانییەکان لە حوکم کردنی گەلانی بندەستدا دەچێتەوە سەر ئەو ژینگەیەی کە عوسمانییەکانی تێدا هەڵکەوتون، واتە ژینگەی چۆڵەوانیی ناوەڕاستی ئاسیا کە بەستێپس لاند ناوزەد دەکرێ. سوڵتانی عوسمانی هەم حوکمی ئەو گەلانەی دەکرد هەم گاو گۆتاڵی لەچۆڵەوانیدا دەلەوەڕاند))[2].

---

[*] ئوستادی یاریدەدەری سیاسەتی دەرەوە لەکۆلیجی زانستی سیاسەت لەزانکۆی بەغدا.

[1] الخربوطلي، أميرة محمد كامل، الدور السياسي للعسكريين في توركيا، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الأقتصاد والعلوم السياسية، جامعة القاهرة، ١٩٧٢، ص١٦. وكذلك: الشناوي، عبدالعزيز محمد، الدولة العثمانية دولة مفترى عليها، ج١، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة، ١٩٨٠، ص٤٩. وايضاً:

Bahram Pour, Firouz, Turkey: Political and social Transformation, Brooklyn N., y, 1967, p. 36.

[2] الشناوي، عبدالعزيز محمد، المصدر السابق، ص٥١.

بەگوتەی تۆینبی، لەوەڕاندن لەسێ توخم پێك هاتوە((شوان، مێگەل و سەگی پاسەوانی. سولتان شوانەکەیە، گەلانی بندەستی دەوڵەتیش مێگەلەکەن و لەشکری عوسمانیش سەگی پاسەوانی‌یەکەیە))[3].

مێژو ئاماژە بەوە دەکا کەئەم گروپانە کۆمەڵ کۆمەڵ دەژیان، هەر کۆمەڵێك کۆمەڵێکی شێلگیر بوو، مەیلێکی سروشتی‌ی بەلای شەڕ هەبوو و لەهونەری شۆڕەسواری‌دا وەستاو جەربەزە بوو، ئەمەش لەو پێشکەوتنەدا دەردەکەوێ کە لەبواری جەنگدا بەدەستیان هێناو بەهۆیەوە توانی‌یان لە سەدەی ١١دا داکشێنە سەر نیمچە دورگەی ئەناتۆلیا[4].

شوێنی جوگرافی‌ی مێرنشینەکەیان لە نیمچە دورگەی ئەناتۆلیا ئەم وازە جەنگی‌یەی پایەدارتر کرد، چونکە دەوروبەری عوسمانی‌یەکان بەچەند قەوارەیەکی سیاسی تەنرا بوو کەهەندێکی مەسیحی بوو و هەندێکی ئیسلامی. زۆربەی کاتیش پەیوەندیی عوسمانی‌یەکان لەگەڵ ئەم قەوارە سیاسی‌یانەدا پەیوەندیی دوژمنانە بوە[5].

لەم بارەیەوە دەبینین H. A. R. Glbb ئەو قسەیەی لەغەزالی وەرگرتوە کە لەکۆتایی‌ی سەدەی یانزەهەمدا نوسیویەتی((ئەمڕۆ حکومەت تەنها زادەی هێزی عەسکەری‌یە، ئەوەی وتیشمان هەر وابوو، هەرچیش پشتیوانی‌ی خاوەنی هێزی عەسکەری مسۆگەر دەکا دەبێ بەخەلیفە))[6].

مێژونوس Lybyer نوسیویەتی((حکومەتی عوسمانی بەر لەوەی هەر شتێکی تر بێ، سوپایە. لەڕاستیشدا حکومەت و سوپا یەك شتن. جەنگ بۆ

---

[3] هەمان، ل٥١.

[4] الخربوطلي، المصدر السابق، ص١٦-١٧.

[5] الشناوي، المصدر السابق، ص٤٩.

6-Romison, Richard, The Turkish Republic,Harvard University Presss, Massachusetts.1963, P. 235.

ئامانجی دەرەکی‌یەو حکومەتیش بۆ ئامانجی ناوخۆیی‌ی دامەزراوێکی چەند کەسی‌یە))[7].

بەهۆی ئەم مۆرکە سوپایی‌یەوە، عوسمانی‌یەکان بایەخیان بەپێشخستنی هێزی دەریایی‌ی دەوڵەتەکەیان داو لەم بوارەدا هەندێ نوسەر وای بۆ دەچن کەهێزی دەریایی‌ی دەوڵەتی عوسمانی بۆ سەدەی هەشتەم دەگەڕێتەوەو هێزی دەریایی‌ی ئەو کاتە ئەو بنەمایە بوە کەدەوڵەت لەسەدەی ١٥و١٦دا، کاتێك بوە گەورەترین هێزی دەریایی لەجیهاندا، پشتی پێ بەست[8].

پەیدابونی دەوڵەتی عوسمانی لەسەدەی١٣دا سەرەتای دەستپێکی ئەو قۆناغە بوو کەتێیدا سوپا ڕۆڵێکی دیاری وەك ئامرازێکی سیاسی بۆ جێبەجێ کردنی سیاسەتی دەوڵەت گێڕا[9].

شتێکی ئاسایی بوو کە هەڵومەرجی ناوخۆو دەرەوەی دەوڵەت ببێتە هۆی بایەخدان بەکاروباری عەسکەری‌و دانی ئەفزەلیەت پێی. بەم پێودانگە هەندێ وای بۆ دەچن کەدەوڵەتی عوسمانی وەك ئۆردوگایەکی گەورە وابوە[10].

خەمی سەرەکی‌ی زۆربەی فەرمانڕەوا عوسمانی‌یەکان لەکاتی هاتنە سەرکاردا مشورخواردنی کاروباری سوپایی‌ی دەوڵەت بوە. بەرابیترین ڕواڵەتە دیارەکانی ئەم بایەخە، پێکەوەنانی تیمەکانی یەنیچەری‌یە. ساڵی ١٨٢٦ سوڵتان محەمەدی دوەم تیمی یەنیچەریی هەڵوەشاندەوەو کادیری

---

7-Ibid.

[8] الخربوطلي، المصدر السابق، ص١٧.

[9] هەمان، ل٢٠.

10-Coles, paul, ottoman Imact on Europe, Thames and Hudson, London, 1968, P. 340.

بیرۆکراسیی مۆدێل ڕۆژئاواییی لەجێی دانا. ئەوی ڕاستیش بێ بریتانیە پشتیوانیی لەم گۆڕانکارییانەی دەوڵەتی عوسمانی کرد[11].

---

[11] یەنیچەری گروپێکی سەربازیی پیادەیە کەسەربازەکانی ڕێکخستنێکی تایبەتیان پێك دەهێنا، ئۆردوگاو نیشانەو لیکۆڵینەوەو ئیمتیازاتی خۆیان هەبو، زۆرترین ژمارەی سەربازیان هەبو، دەستیان زۆر دەڕۆیی‌و هێزێکی زۆریان هەبو. دەوڵەت ڕێی دابونێ بگەنە بەرزترین پۆستی سوپاییی‌و مەدەنی. ئەگەرچی دەوڵەت لەسەردەمی زێڕینیدا سودی لێ وەرگرتن‌و نەبەردی باشی پێ کردن، بەڵام دواتر زیانیان بەدەوڵەت گەیاند چونکە زۆر جار یاخی بون‌و توخنی سیاسەت کەوتن، بەتایبەتی کاتێك هێزو توانای جارانی خۆیان لەدەسدا، ئەمەش وای کرد ببنە بارێکی قورس بەسەر ملی دەوڵەتەوە. ئەوەی هەڵوێستی ئەوانی پایەدار کرد، نەبونی سوڵتانی بەتواناو سەدری دەسڕۆ بوو. بڕوانە: شنناوی، سەرچاوەی ناوبراو، ل٤٧٢ . مێژونوسان لەسەر مێژوی پەیدابونی تیپە یەنیچەرییەکان، ئەوانەی بەتورکی پێیان وتراوە ئۆجاق یەنیچەری، یەکڕا نین. بەگوتەی هەندێ سەرچاوە، یەنیچەری لەسەدەی پانزەهەم داو وردتر لەسەردەمی ئورخان(١٤٠٦-١٤٤١) دامەزراوە. بڕوانە:
سرهنك، أسماعيل، من حقائق الاخبار الى دول البحار، الجزء الاول، المطبعة الاميرية، القاهرة، ١٩١٢، ص٤٨٨.
هەروا:
هاملتون جب وهارولد بودن، المجتمع الاسلامي والغرب، الجزء الاول، ترجمة د. أحمد عبدالرحيم مصطفى، دار المعارف بمصر،١٩٧١، ص٨٥.
بەگوتەی هەندێ نوسەری تر، مێژوی دامەزراندنی یەنیچەری بۆ چارەکی سێیەمی سەدەی ١٤ دەگەڕێتەوە. بڕوانە:
أنيس، محمد، الدولة العثمانية والشرق العربي (١٥١٤-١٩١٤)، مكتبة الانجلو المصرية القاهرة، بلا تأريخ، ص٧٧.
هەروا لەلاپەڕە ٢٤ی ماستەرنامەکەی خەربوتلیدا هاتوە کەزۆربەی هەرە زۆری یەنیچەرییەکان لەسەردەمی زێڕینی دەوڵەتدا، لەسەدەی ١٥و١٦دا، لەنێو هاوڵاتییە مەسیحییە ئەرتۆدۆکسەکان هەڵدەبژێردران، بەواتەیەکی‌تر یەنیچەرییەکان خزمەتکاری کۆشکی سوڵتان بون. لەم بارەیەوە بڕوانە:
هاملتون جب وهارولد بودن، المصدر السابق، ص٨٢.
ئەو خزمەتکارانە بەمناڵی دەبران‌و مەشقێکی توندو تۆڵیان پێ دەکرا. دواتر دەبرانە کۆشکی سوڵتان‌و لەوێ بەپێی لێوەشاوەیی‌یان پلە پلە گەشەیان دەکرد. ئەوانە نەك هەر فێری هونەری پیاوانی دەربار دەکران بەڵکو فێری هونەری ئیدارەو سەرکردایەتیش

لەقۆناغەکانی هەوەڵی دەوڵەتدا، دەوڵەت پێویستی بەتیپی پیادە بوو چونکە ئەو تیپانە ئاستێکی بالآی مەشق و راهێنانیان هەبو بەرادەیەك کەدەیانتوانی کەموکوڕییەکانی تیپەکانی تر پڕ بکەنەوە کە تیپی دەرەبەگی بون و لەبەر ئەوەی بەزەویی کشتوکاڵییەوە بەسترابونەوە دژوار بوو لەهەرێمە دوردەستەکان بەکار بهێنرێن[١٢].

لەسەردەمی سوڵتان سەلیمدا کەعەرەب و فارسەکانی بەزاند، چەکی ئاگرین بەپێودانگی رۆژئاوا بەکار هات. لەراستیشدا بەکارهێنانی چەکی رۆژئاوایی بۆ ستراتیجی عوسمانی شتێکی گرنگ بوو. ئەوەی ئەم رایەشی پایەدار کرد، باری جوگرافیی دەوڵەت بوو. بۆیە سوپا داوای کرد پەیڕەوی لە ئاستێکی بالآی خوێندن بکرێ[١٣].

لە راستیدا سوپا لەسەدەی رابردودا توخمی سەرەکیی بەرنامەکانی پێك دەهێنا و ئەفسەرە عوسمانییەکان سیما و روخساری دیاریان هەبو لەوانە

---

دەکران چونکە چاکترینیان بۆ بالآترین پۆستی حکومەت دەنێردران. لەم بارەیەوە بە سەرچاوەی پێشودا بچۆرە، لل٨٢-٨٣.
لەوەی باس کرا دەردەکەوێ کەتیپی یەنیچەری وەك پاسەوانی تایبەتی سوڵتان دامەزراوە(سەرچاوەی پێشو، ل٩١). لەم سەروبەندەدا دەبێ تەئکید بکەینە سەر نەخشی گرنگی هێزە یەنیچەرییەکان و دەوری سوپا لەساڵی١٨٢٦ بەدواوە و مەسەلەی خۆهەڵقورتاندن لەسیاسەت. ئەم خۆهەڵقورتاندنە شتێکە بەزەحمەت چارەسەر دەکرێ.
بڕوانە: Robinson, op. cit., p. 235.

12-Abadan- unat,"Patterns of Political Modernizaion and Turkish Democracy", op. cit., the Turkish Yearbook of International Relations, x111, S.B.F. Ue Basim- yuksek okulu basimcui, Ankara, 1983.p.4.

[١٣] دەوڵەتی عوسمانی لەبەرنامەکانیدا پەیڕەوی لەخوێندنی بالآ نەکردوە بەلآم ئەمە مامۆستاکان و خوێندکارانی ئەکادیمیای سەربازی ناگرێتەوە. بڕوانە: Ed. John.J.Johnson, the Role Military in underdeveloped Countries, prineceton university prss,1962,p. 53.

خوێنــەواری، زانســتو تەکنــەلۆژیای مۆدێــرن[١٤]. لەشــکری کلاســـیکیی عوسمانییەکان لەم ڕووەوە ناوبانگێکی باشی هەبو. ئەوی ڕاستیش بێ ســوپا مەڵبەندێکی گرنگی فێرکاریو مەشقی تــەکنیکی بــوو، نــەك تەنــها بــۆ ئەفســەرەکان بــەڵکو بــۆ ســەربازەکانیش، چونکــە پێویســت بــوو لەســەر سەربازەکان فێری خوێندەواری بن[١٥].

لەسۆنگەی ئەمەوە دەبینین سوڵتانە عوسمانییەکان لەچارەکی یەکــەمی سەدەی حەڤدەهەمدا هەوڵیاندا هێزە سوپاییە عوسمانییەکان تازە بکەنەوە. مەیل بەلای مۆدێرنیزەکردنی سوپادا زیاتر پاش بەزینی ئابڕووبەرەی ســوپای عوسمانی لەبەردەم نەمساو ڕوســـیا ســەری دەرهێنــا، کــاتێك ئــەو بەزینــە بەمۆرکردنی پەیمانی ساڵی ١٦٩٩ی کــارلۆڤیتزو پــەیمانی ســاڵی ١٧١٨ی پاسارۆڤیتز گەیشتە پۆپە. ئەم گرفتانەی ملیتاریزمی عوسمانی بونــە هــۆی ئەنجامدانی ریفۆرم لەناو سوپاو هێزی دەریاییدا[١٦].

---

[14]Hans E.Tutsch, from Ankara to marrakesh: Turk and Arabs in A changing World, London,1969,p.310[14]

[15]Ibid

[١٦]-لەهەمان کاتدا ئیدارەی عوسمــانی هــەوڵیدا هــەندێ ریفــۆرم بکــاو لــەم بارەیــەوە لەساڵی ١٧٧٤دا یەکەم چاپخانە لەلایەن ئیبراهیم کاینارجاوە دامەزرا کە بێجگــە لــەم نازناوە پێی وتراوە Muterrika. بڕوانە..B.Lewis, op cit., p50.

ئیــبراهیم هاوولاتییــەکی هــەنگاری بــوو، لــەSeminary Kolosvar خوێندکــار بـــوو، بەیارمەتیی سەعید چەلەبی چاپخانەیەکی هێناو پێشکەش بەســەردی ئــەعزەم دامــاد ئیبراهیم پاشای کردو فەتوایەکیشیان بەشەیخولئیسلام عەبدوڵلا ئەفــەندی دەرکــرد کــە ئەمە شتێکی باشە، بەمەرجێك هیـــچ شــتێکی دینــی لەچاپخانەکــەدا چــاپ نــەکرێ. ئەمەش لە ٥ی تەموزیی ١٧٢٧دا ڕویدا. بڕوانە ســەرچاوەی پێشــو، ل ل٥١-٥٢. دواتــر ئیبراهیم کە بەدامەزرێنەری ڕاستەوخۆی چاپخانــەی عوسمــانی دادەنــرێ، وازی لــەدینی خۆی هێناوە بوە بەموسڵمان. بڕوانە: Feroze, Muhamad Rashid, op.Cit.,p. 30.

شایەنی باســە کەئــەوەی چاپخانــەی بــۆ ئیســتانبول هێنــا، جولەکــە ئیســپانییە پەنابــەرەکان بــون کــە لەســاڵی١٤٩٣دا ڕویــان کـــردە دەوڵـــەتی عوسمـــانی. بـــەڵام

دەوڵەتی عوسمانی ویستی لەڕێی فەرەنساوە ریفۆرم لەناو سوپای تورك جێبەجێ بکا. لەم سەروبەندەدا فەرەنسا لەمارتی ١٧٨٤دا کەوتە پەرەدان بەهێزی چەکداری عوسمانی[17]. لەماوەی نێوان ١٧٨٣-١٧٨٤دا دەوڵەتی عوسمانی نزیکەی ٣٠٠ ئەفسەرو ئەندازیاری فەرەنسی‌ی خستە کار[18].

ئەوی راستی بێ، هەندێ لەپسپۆڕە فەرەنسی‌یەکان ئاستەنگیان لەم کارە تازەیەو لەهەلومەرجی کارکردندا هاتە بەر رێ. بۆ نمونە دەبینین کاپتن سانت رێمی‌ی مشورخۆری یەکەی تۆپخانە بانگ کرایەوە چونکە لەگەڵ ستادی عوسمانی‌دا توشی گێرمەو کێشە بوو[19].

شایستەی ئاماژەیە کە دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی ١٧٨٧دا بەهۆی جەنگی دژی روسیاوە رێی‌دا شاندە فەرەنسی‌یەکە لەدەوڵەتی عوسمانی‌دا بکەوێتە کار بەڵام بەبێ خەلیل حەمید[20]. پاش برانەوەی ئەم جەنگە جەنگێکی دی هەڵگیرسا. بەڵام کاتێك دەرکەوت بنەماڵەی هایبۆرگ(کەپاشای فەرەنسا لەرێی ژنو ژنخوازی‌یەوە مەیانەی لەگەڵدا پەیدا کردبو) بەنیازن پەیوەندی بەروسیاوە بکەن، حکومەتی فەرەنسا شاندەکەی خۆی لەدەوڵەتی عوسمانی کێشایەوە[21].

لێرە دەبێ سەرنج بۆ ئەوە راکێشین کە ئەو ریفۆرمانەی لەسەرەتای سەدەی ١٨دا لەبەشێکی تیپە عەسکەری‌یەکاندا ئەنجام دران، تا نیوەی

---

نزیکەی٣٠٠ ساڵ بوو چاپ کردنی کتێب لە دەوڵەتی عوسمانی بەحەرام دادەنرا. دواتر ئەم تەحریمە بەفتواکەی شەیخولئیسلام لەساڵی ١٧٢٧دا هەڵوەشێنرایەوە. بڕوانە: .Ibid.,

[17]-Levy, Avigdor, Military Reform and the eproblem of centralization in the ottoman Empire in the Eighteenth centuray, vol.18, No. 3, July. 1982,p.239.

[18]-Ibid.,p.236.

[19]-Ibid.,.

[20] خەلیل حەمید ئەو فەرمانده دەسڕۆیە بوو کەریفۆرمی لەناو سوپادا جێبەجێ کرد. بڕوانە: Ibid.,p.2380

[21]-Ibid.,

دوەمی ئەو سەدەیە نەبوە هۆی لاسایی کردنەوەی ڕێوشوێنە پراتیکییەکانی ئەورووپا[22].

لەم بوارەدا دەبێ سەرنج بۆ ئەوە ڕاکێشین کەدوای کەوتنەوە کاری دەستوری ساڵی ١٩٠٨ هەوڵدرا لەڕێی پەیڕەوی کردنی بیرو ئەندێشە ئەورووپایی‌یەکانەوە (بەهۆی ناردنی خوێندکار بۆ ئەورووپا) شێوەکاری ئەورووپایی لەناو هێزە چەکدارەکانی تورکدا پیادە بکرێ[23].

گەلی عوسمانی لەسەر جەنگو شەڕوشۆڕ ڕاهاتبوو، هەمیشە گوێڕایەڵی سوڵتانەکان بوو، ئاواش دەیڕوانی‌یە جەنگ کەئەرکی یەکەمێتی. سوپا جێی بایەخی سوڵتانەکان بوو، لەبەر ئەوە بەهرەی زۆری تێدابوو وەك دیسپلینی پتەو، مەشقو ڕاهێنانی وردو درێژخایەن، تەقەمەنیی زۆر، پۆلی هەمە جۆری لەبابەتی پیادە، سوارەو تۆپخانە. چەکی تۆپخانە هێندە وێرانکەرو سامناك بوو سەرکەوتنی سەرتاپاگیری بۆ عوسمانی‌یەکان دابین کرد، بەتایبەتی کەدوژمنەکان بەشێوەیەکی سەرەکی پشتیان بەسوارە بەستبو[24].

سەربار، سوپا دو ئەرکی هەبو کە بریتی بون لەجەنگو حوکم. دەوڵەت هەم لەکاتی ئاشتیدا پشتی بەسوپا بەستبو هەم لەکاتی شەڕدا. لەم بارەیەوە سوپای عوسمانی بەچەرخێك دەشوبهێنرا کەدیوێکی لەسەری هەڵکۆڵرابوو جەنگو دیوەکەی تری حوکم. لەبەر ڕۆشنایی‌ی ئەمەدا ئەفسەرانی سوپای عوسمانی نەك هەر پۆستی سوپایی‌یان بەڕێوە دەبرد بەڵکو زۆربەی هەرە زۆری پۆستە مەدەنی‌یە سەرکردەیی‌یەکانیشیان بێجگە لەداوەریو پۆستە دینی‌یەکان داگیر کردبوو[25].

---

[22] جب، هاملتون، المصدر السابق ص٣١.

[23]-Allen, Henry Elisha, the Turkish Transformation astudy in Social and Religions Development, New York,1968, p.13.

[24] الشناوي، المصدر السابق، ص٥٠.

[25] هەمان، ل٥٠.

لەسێبەری ئەم تیۆرییەدا، سوپا بووە بەڕێوەبەری ویلایەتە عوسمانییەکانی دەوڵەتو ئەم دو ئەرکەی- واتە جەنگو حوکم- بەتوندی بەیەکەوە گرێدا[26]. لێرەوە سوپا دەستی بەسەر دەزگاکانی دەسەڵاتو زۆربەی کەرتەکاندا گرت. ئەمەش دیاردەیەکی رونی مێژوی دەوڵەتی عوسمانییە[27].

سوپا خۆی بەدڵسۆزی سوڵتان دەزانی. لەم روەوە مێژونوسی ئەمریکایی Lybyer وتویە((خۆ بەدڵسۆز زانیی سوپای عوسمانی بۆ سوڵتان باڵی بەسەر هەمو ئەندامەکانیدا کێشا بوو. لە بەرێ کەوتنی سوپاو جێگیربونی لەئۆردوداو لەکاتی جەنگدا هەر ئەندامێکی تیمەکانی سوپا لەلایەن سوڵتانەوە فەرمانی پێ دەدرا. بێ لەوە سوڵتان تەوەری سەرەکیی بەڕێوەبردنی سەرتاسەری ئۆپەراسیۆنەکانی شەڕ بوو، هەموانیش بەگیانو ئەقڵو رۆحەوە سەریان بۆ دادەنەواند))[28].

سەبارەت بەباری کۆمەڵایەتیی سوپای دەوڵەتی عوسمانیش، دەبینین یەکەم سوپای تورك لەو شۆڕەسوارانە پێکهاتوە کەپێیان وتراوە سپاهیی دەرەبەگ، واتە سوارە دەرەبەگەکان. هۆی ئەم ناوە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەسوڵتانە سەرەتاییەکان بۆ ئەوەی وا لەسەربازەکانیان بکەن بە گەرمو گوڕیو بەپەرۆشەوە بچنە جەنگەوەو قەڵەمڕەوی روبەری دەوڵەت بەرینتر بکەن، پارچە زەوییەکیان بەناوی تیمارەوە پێشکەش بەسوارە شایستەکان دەکرد لەبری ئامادەکردنی ٢تا ٤سەربازی لێوەشاوەو بەدەنگەوەچونی بانگەوازەکەی سوڵتان بۆ جەنگ[29].

نیوەی یەکەمی سەدەی ١٩ بەوە جیا دەکرێتەوە کەتێیدا ئەفسەرانی سوپای عوسمانی وەك یەکەم توێژی روناکبیرانی مۆدێل رۆژئاوایی و

---

[26] هەمان، ل٥٠.
[27] هەمان، ل٥٠-٥١.
[28] هەمان، ل٥٣.
[29] الخربوطلي، المصدر السابق، ص٤٤.

سەردەرکردو لەفیکرو روداوەکانی رۆژئاوا هەڵکەوتن. ئەمەش لەهەمان کاتدا بوە هۆی کەمکردنەوەی بایەخی خوێندن[٣٠].

شیاوی باسکردنە کە پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵی عوسمانی بەردەوامو بەشێوەیەکی سەرەکی پشت ئەستور بوو بەلێوەشاوەییی تەکنیکیو زانستی، بەبێ گوێدانە ژینگەو ریشەی کۆمەڵایەتی[٣١].

بەڵام لەسەردەمی حوکمی ئیتیحادو تەرەقیدا ئەفسەرو فەرماندەکانی سوپا بەریشە دەچونەوە سەر چینی ناوەڕاستو چینی خوارەوەی کۆمەڵ وەك، بۆ نمونە، ئەنوەر پاشا، ئەحمەد پاشاو تەلعەت پاشا. سەرکردەکانی جەنگی سەربەخۆییو سەرکردایەتیی ئەتاتورکیش سەر بەهەمان چین بون[٣٢].

پاش نەهێشتنی ئیمتیازاتە چینایەتییەکانی ئەفسەران لەسەردەمی عوسمانییەکاندا، دەرفەت درایە هەمو توێژەکانی کۆمەڵ بۆ چونە ناو سوپا. خێزانە مام ناوەنجییەکان کەیفیان بەچونە ناو سوپا دەهات چونکە خوێندکار ماوەیەکی کەمی لەکۆلیجە ملیتارییەکان دەخوێند، لەبەرئەوە خێزانەکانیان دەیانتوانی مەسرەفیان بکێشن[٣٣].

بەکورتی، دەبینین ریشەی ئەفسەران لەهەردوو سەردەمی عوسمانیو کۆماریدا دەچێتەوە سەر چینە خوێنەوارەکانو ئەم نەریتە تا ئەمڕۆ لەتورکیای مۆدێرن باوە بەجۆرێك کە سوپا بۆتە نوێنەری نوخبەی خوێنەوار کە زۆربەیان رۆڵەی فەرمانبەرانو دەسکورتەکانن[٣٤]. لەم بارەیەوە هەرڤیتز لەکتێبی((سیاسەتەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست))دا دەڵێ((لەسەردەمی کۆماردا، هەروا لەسەردەمی عوسمانیدا، ئەفسەران لەچینی مام ناوەنجیی

---

[٣٠] هەمان، ل٥٣.
[٣١] هەمان، ل٥٣.

[32]-Fisher, Sydney, op. Cit.,p.172.

[٣٣]-الحسن، داود أحمد، الاوضاع السياسية في تركيا خلال السبعينات، كلية الدفاع الوطني، جامعة البكر، ١٩٨٠-١٩٨١، ص٨٢-٨٣.
[٣٤] هەمان، ل٨٣.

سەنتەرەکانی شارو چینە خوێنەوارەکانی کەرتی خزمەتگوزاری هەڵدەبژێردران چونکە ئەو چینانە پشتو پەنای شۆڕشەکەی مستەفا کەمال بون))[٣٥].

ئەمە بەو مانایە دێ کە ئەفسەرەکانی سوپای تورك بەشێوەیەکی سەرەکی لەریزی چینە مام ناوەنجی‌یە دەسکورتەکان هەڵدەبژێردران. ئەوی راستیش بێ بەدەستهێنانی پۆستی عەسکەری بۆ ئەو چینانە لەپۆستەکانی تر ئاسانتر بوو. گومانیش لەوەدا نیە کە زۆر ئەفسەر لە خوێندنگە ملیتاری‌یەکانیان خوێندوە. خێزانی ئەو ئەفسەرانەش حەزیان نەکردوە رۆڵەکانیان بچنە زانکۆ چونکە دەرۆستی خەرجی‌ی زانکۆ نەدەهاتن[٣٦]. لەم بارەیەوە جۆنسۆن وتویەتی((لەرۆژهەلاتی ناوەراستدا پادشاکانو زەویدارەکانو بورژوازی‌ی چینی ناوەراستو بازرگانەکان شوێنی دیاریان لەناو سوپا بۆ خۆیان داگیر دەکردو تەنها کرێکارانو جوتیاران بون کە خەریکی ژیانی سیاسی بون. بەلام ئەمرۆ سوپا لەم چەشنە دەوڵەتانەدا نەخشێکی کارا لەسیاسەتدا دەگێرێو دەسکەلای چینی مام ناوەنجی‌ی نوێشە. ئەمەش بەو واتایە دێ کە سوپاکانی رۆژهەلاتی ناوەراست لەم سەدەیەدا گوزارشت لەهێزی کۆمەلایەتی‌ی بەرینتر دەکەن، واتە چینی مام ناوەنجی‌ی نوێ))[٣٧].

سەبارەت بەخۆتێکەیاندنی سوپا لە سیاسەت، بۆمان دەرکەوتوە کە سوپا هەم لە سیاسەتی ناوخۆدا دەستێکی بالای هەیە هەم لەسیاسەتی دەرەوەدا. بەلام لەهەندێ قۆناغی مێژوی تورکیا دەبینین هەوڵ دراوە سوپا

---

[35].c. Hurewitz, Middle East polities: The in Military Dimeusion, New York, 1974,p.215.

[36]-C.H Dodd, Democracy and devlopment in Turkey, University of Hull, 1970, p . 58.

[37]-Ed. Jone J.Johnson, the Role of Military in underdeloped Countries, op. Cit.,p.291.

لەسیاسەت دور بخرێتەوە. ئەمەش بەڕونی لەماوەی نێوان ١٩٠٨-١٩٠٩-١٩١ دەردەکەوێ، کاتێك ئیتیحادو تەرەقی لەکۆبونەوەی سالآنەی هاوینی سالّی ١٩٠٩ی سالانیکدا لە دەستێوەردانی راستەوخۆی ئەفسەرانی تورکی لە کاروباری سیاسەت کۆلّییەوە. لەو کۆبونەوەیەدا مستەفا کەمال وتی(ئەگەر ئەفسەران بۆ ماوەیەکی زۆر لەناو حیزبدا(واتە حیزبی ئیتیحادو تەرەقی) بمێننەوە، ناتوانین حیزبێکی تۆکمەو سوپایەکی پتەو دروست بکەین. زۆربەی ئەفسەرانی لەشکری سێ ئەندامی حیزبن بەلآم ناکرێ ئەمە بەپلەی یەکەم بزانین. لێگەڕێن با چاری ئەم مەسەلەیە بکەین. ئەگەر ئەفسەرەکان دەخوازن لەحیزب بمێننەوە، باواز لەسوپا بێنن. لەسەر ئەم بنچینەیە دەبێ قانونێك دارێژین لێ نەگەرێ ئەفسەران سیاسەت بکەن))[٣٨].

ئەوی راستی بێ چەمکی دورخستنەوەی سوپا لەسیاسەت بۆ ئەزمونی ١٩١٢-١٩١٣ی جەنگی بالکان دەگەڕێتەوە، کاتێك سوپا دەستی بەسەر دەسەلآتدا گرتبو بەلآم شارەزاییەکی کەمی لەحکومەتی دەستوریو حزبە سیاسییەکاندا هەبو، ئەمەش بوە هۆی ئەوەی سوپا پشتیوانی لەهەندێ گروپی سیاسی بکاو لەئەنجامدا چالاکیی دەولّەت بەبنبەست گەیشتو ناکۆکی کەوتە نێو کۆلۆنێلو جەنرالّەکانی سوپای عوسمانی، بێ لەوەی کەسوپا نەیتوانی سنوری دەولّەت لەبالّکان بپارێزێ[٣٩].

شیاوی ئاماژەیە کە لەکاتی جەنگی بالکاندا مستەفا کەمال ئەفسەرێکی لاو بوو، لەنزیکەوە سەیری روداوەکانی دەکرد. دوای شکستی تورکیا لەم جەنگە بەلّێنی بەخۆی دا کەچیدی نایەلّێ سوپا خۆی

---

[٣٨] مستەفا کەمال لەسالّی ١٩٠٩ وازی لەکۆمەلّەی ئیتیحادو تەرەقی هێنا. بڕوانە:
Robinson, op. Cit.,p 2360

[39]-Bahram pour, op.cit.,p.37.

لەسیاسەت بگەیەنێو لێ ناگەڕێ سیاسی یەکان هێزی چەکدار بۆ مەرامەکانی خۆیان بەکار بێنن.[40]

دواتر مستەفا کەمال بۆ تەگەرەدان لەپارچە پارچە کردنی ئەناتۆلیا لەلایەن هێزە بیانی یەکانەوە سیستمی هاوپەیمانی ی هێزە چەکدارەکانی داهێنا بەڵام ئەم هاوپەیمانی یە لەدەرەوەی چەمکی ململانێ لەپێناوی سەربەخۆییدا لەئارادا نەبوو. هاوپەیمانی ی نێوان ئەفسەرانی سوپاو کارمەندەکانی دەوڵەتو پارێزەرەکانو رۆژنامەوانەکانو مامۆستاکان نوێنەری ئەهلی فیکرو بازرگانەکانو کارمەندانو زەویدارانو گەورە پیاوانی لادێ بوو. بەڵام دوای ساڵی ١٩٢٣ رژێم لەوە بەلێبوردنتر بوو. هەر ئەم هاوپەیمانی یە نارەسمی یە بوو کەبوە هۆی پەیدابونی دەوڵەتە تازەکەو پارتی گەلو دەستەبەرکردنی ئارامی ی رژێمە تازەکە[41].

لەم روەوە دەبێ تەئکید لەسەر ئەوە بکەینەوە کەفەرماندەکانی هێزی چەکدار دەورێکی گرنگیان لەپەیداکردنی ئەم جۆرە هاوپەیمانی یەدا هەبوو، سوپاش نەخشێکی دیاری لەدامەزراندنی کۆماردا هەبوو. لەسەر ئەم بنچینەیە دەبینین مستەفا کەمالو بەشێك لەهەڤاڵە ئەفسەرەکانی جلی مەدەنی یان کردە بەر بۆ ئەوەی جلەکە ببێتە ئاماژەیەك بۆ ملکەچ بوونی سەربازان بۆ مەدەنی یەکان. ئەمەش لەلایەکی دیکەوە بەو مانایە دێ کەلەو ماوەیەدا هیچ گێچەڵێك لەنێوان عەسکەری یەکانو مەدەنی یەکان نەبوو[42]. سەربازەکان هەم لەحزب بەهرەوەر بون هەم لەحکومەتو هەم لەئەنجومەنی نیشتمانی ی گەورەی تورك[43].

---

[40]-Ibid.,
[41]-Feroz, Ahmad, op.cit.,p.v.
[42]-Ibid.,
[43]-Ibid.,

لەسەر ئەم بناغەیە، مستەفا کەمال لەساڵی ١٩٢٤دا داوای لەفەرماندە دیارەکانی سوپا کرد دەستبەرداری کورسییەکانی خۆیان بن لەئەنجومەنی نیشتمانیی گەورەی تورکو پێی وتن((ئێستاش دەچمە سەر کاکڵەی باسەکە بۆ درێژەدان بە دیسپلین یا بۆ پایەدارکردنی رژێم بەئیجرائاتی پێویست لەسوپادا، بەڵام ئەمە ئەو فەرماندانە ناگرێتەوە کەئەندامن لەئەنجومەنی نیشتمانیی گەورەی تورک))[٤٤]. ئەگەرچی لەساڵی ١٩٢٤ەوە سەرۆکی ستادی سوپا لەئەندامەتیی ئەنجومەنی وەزیران دور خرایەوە بەڵام تەنها لەبەردەم سەرکۆماردا بە بەرپرسیاری مایەوە.

لەم سەروبەندەدا مارشاڵ چاقماق کەسەرۆکی ستادی سوپا بوو رازی نەبو سوپا بخرێتە بن دەستی مەدەنییەکانەوە. لەراستیشدا بودجەی بەرگری لەلایەن مەڵبەندی سەرکردایەتیی ستادی گشتییەوە دادەنراو وەزیری بەرگریی نەتەوەییو کارمەندانی وەزارەت تەنها دەورێکی لاوەکییان هەبو[٤٥].

لەبەر ئەوە لەتشرینی یەکەمی ١٩٢٤دا پێشبینی دەکرا سوپا لەدژی دەسەڵاتی سیاسی جموجوڵ بکات. ساڵی ١٩٢٦یش روداوێکی تەمومژاوی قەوما ئەویش پیلانگێڕانە لەدژی مستەفا کەمال کەتێیدا چەند ئەفسەرێك بەشدار بون. لەئەنجامدا رژێم چەندان ئەفسەری پلە بەرزی دەسگیر کرد لەوانە ئەو دو جەنەراڵەی کە لەساڵی١٩٢٤دا رازی نەبون دەست لەئەندامەتیی ئەنجومەنی نیشتمانیی گەورەی تورك بکێشنەوە. رژێم داوای لەو دو جەنەراڵە کرد دەست لەسوپا بکێشنەوەو دواتر ئازاد کران بەڵام رژێم هیچ ئیمتیازێکی سیاسیی بۆ نەهێشتنەوە[٤٦].

---

44-Robinson, op., cit.,p 238.
45-Feroz, Ahmad, op. Cit.,p. 7.
46-Robinson, op.cit.,p.239.

مستەفا کەمال داهێنەری ئەم سیاسەتە تازەیە بوو، هەر ئـەویش وتـی ئەفسەران بۆیان نیە بـەبێ ئـیزنو لەخۆیانـەوە بچنـە ئۆفیسـەکانیانو رێ نادرێ سوپا بەشداری لەهەڵبژاردندا بکاو تەنانـەت بـۆی نیـە رۆژنامـەش بخوێنێتـەوە. ئەمـە بـەو مانایـە دێ کـەهێزە چەکدارەکان پشـتیوانی‌یان لەحکومەت دەکردو رازی بون ئەرکەکەیان بریتی بێ لەپاراستنی نەتـەوەو بەرپەرچ دانەوەی هەر دەسدرێژی‌یەکی ناوخۆ و دەرەوە. ئەمەش بـەو مانایـە دێ کەسوپا وەك پارێزەری شۆڕشی کەمالیستو دەسـتور مایـەوە. شـایانی باسیشـە کەمارشـاڵ فـەوزی چاقمـاقی سـەرۆکی سـتاد بەحەماسـەتەوە پشتیوانی‌ی لەمستەفا کەمالو ئینونو کردوە[٤٧].

ئەوی راسـتی بـێ، لەنـەریتی عەسـکەری‌ی تورکـدا هەمیشـە جـۆرە خەرۆیی‌و لەخۆبایی بونێك هەبوە چونکە سوپا بـوو کـە بەسـەرکردایەتی‌ی مستەفا کەمال تورکیای پاراستو بەرپەرچی سـوپا بیانی‌یـەکانی دایـەوەو دواتر خـۆی بـەهێز کـرد بـۆ بەرپـەرچ دانـەوەی هەڕەشـەکانی یـەکێتی‌ی سۆڤێت[٤٨].

بـەلام وەك بینیمـان سـوپا دوای سـاڵی ١٩٢٤ ململانـێو پێشـبڕکێی سیاسـی‌ی وەلانـاو چـوە سـەر ئـەو بڕوایـەی کەئەفسـەرەکانی، داهێنـەری دەسەڵاتی راپەڕاندنو ئەنجومەنی نیشتمانی‌ی گـەورەی تورکیـان، بـێ لـەوە قانونەکانی دوایی، دەرچوەکانی ئامۆژگە باڵاکانیان ناچار کرد هەژدە مانگ وەك ئەفسەری یەدەك خزمەت بکەن. ئەوانەش بونە پردێك لەنێوان مەدەنی‌و عەسکەری‌یەکان[٤٩].

---

47-Bahrahm pour, op.cit.,p.37.
48-Johnson, op.Cit ., p.291.
49-IbId.,

لەسەر ئەو بنچینەیە دەبینین مستەفا کەمال‌و عیسمەت ئینونو پاش برانەوەی جەنگی سەربەخۆیی جلی سەربازی‌یان نەکردە بەر[50].

کەواتە بۆمان هەیە بێژین کەمستەفا کەمال لەبارەی دامەزراوی سوپاوە ستراتیجێکی دولایەنەی پەیڕەو کردوە: نەخشەی یەکەم دەستەبەر کردنی گەرانەوەی سوپا بوو بۆ ئۆردوگانی پاش برانەوەی جەنگی سەربەخۆیی[51] چونکە ئەو دژی ئەوە بوو سوپا توخنی سیاسەت بکەوێ[52]. لەسەر ئەم بنچینەیە دامەزراوی سوپا لەحیزبایەتی دورکەوتەوەو دڵسۆزی‌ی خۆی بۆ شەش پرنسیپەکەی ئەتاتورك دەربڕی. بێ لەوە سوپا بڕوایەکی وای پەیدا کرد کە کەمالیزم بوژانەوەی کۆمار مسۆگەر دەکا، بەتایبەتی ئەگەر ئەوەمان لەبەرچاو گرت کەمستەفا کەمال پێی وابوو سوپاو لاوان بەرپرسیارن لەپاراستنی دەسکەوت‌و سەربەخۆیی‌و سەروەری‌ی کۆمار. بەم پێودانگە ئەو کاتە سوپا دەست لەژیانی سیاسی وەردەدا کەهەست بکات لادان لەبیروباوەڕی کەمالیزم هەیە. ئەم خاڵەش لەرەفتاری ساڵانی ئەم دوایی‌یەی دامەزراوی سوپادا دەردەکەوێ[53].

نەخشەی دوەمیش لەوەدایە کەسوپا بەهێمای پێشکەوتن دەژمێردرێ. ئەوی راستیش بێ زۆر جار سوپا دامودەزگاکانی تورکیای تازە کردۆتەوە. نەخشەی دوەم ناوبانگێکی نوێی بۆ سوپا پەیداکرد. لەراستیشدا پرۆسەی مۆدێرنێزە دوای دوەم جەنگی جیهان‌و بەهاندانی ئەمریکا کەوتە گەڕ[54].

---

[50]-Haddad, George, Revoultions and Military Rule in the Middle East op. Cit.,p. 107.

[51]-Bahram pour, op.cit.,p.59.

پێمان وایە ئەوەی لەساڵی ١٩٠٨دا نەخشەی بۆ شۆڕشی لاوانی تورك‌و شۆڕشەکەی مستەفا کەمال کێشا، لەبنچینەدا ئەفسەرانی سوپا بون.

[52]-Ibid., p.37.

[53]الحسن، المصدر السابق، ص٤٨.

[54]-Bahram pour, op. Cit.,p .56.

ئەوی راستی بـــێ دپلۆماسـیەتی رۆژئـاوا هـەوڵیدا لەڕێگـەی بردنـی سیسـتمی رۆژئـاوایی بـۆ نـاو تـەکنیکی میلتـاریی تـورك بیرکردنـەوەی دامەزراوی سوپا بگۆڕێ. ئەمەش لەڕێگەی خوێندنـی فیکـری ئـەمریکیو رۆژئاوایی لەخوێندنگەو ئامۆژگە سەربازیەکانی تورکیا هاتە دی. ئەم خاڵە لەڕێگەی تەئکید کردنـە سـەر خوێندنـی زمانـە ئینگلـیزیو فەرەنسـیو ئەڵمانییەکانەوەو هەروا لەڕێگەی کردنەوەی خولو ناردنی خوێندکاران بـۆ دەرەوە لەڕێی پەیمانی ناتۆوە، جێبەجێ کرا[٥٥].

لەم بارەیەوە دەتوانین بڵێین کەقۆناغی یەکەمی خەباتی حکومەتی تورك کـەدوا بـەدوای جـەنگی سـەربەخۆییو راگـەیاندنی کۆمـاری تورکیـا لەدوماهیی تشرینی یەکەمی ١٩٢٣دا دەستی پـێ کـردوە، تـەواو بـوو و سەردەمی نوێی بیروکراسیی عەسکەری- مەدەنیی وردە بورژوازی دەسـتی پێ کرد. بەم پێودانگـە گرتنـی دەسـەڵات لەلایـەن ئەمـەی دواییانـەوە، ئاماژەیـەکی رۆشـنایە لەجوڵانـەوەدا بـەرەو پایـەدارکردنو دامـەزراندنی ناسیونالیزمێکی بورژوازی کە دواتر رێی بۆ پەرەسەندنی سـەرمایەداریی نیشتمانی بەرابـەریو لـەژێرکۆنترۆڵی دەوڵـەتو بیروکراسـیی سـەربازی- مەدەنی، خۆش کرد[٥٦].

لەڕاستیدا پاش مردنی مستەفا کەمال دامەزراوی سوپای تورك هەندێ گۆڕانی بەسەردا هات. مارشاڵ فەوزی چاقماق لەم بارەیەوە وتویـە((دەشـێ شێوەی کلیلی بڕیارەکەی ئینونو بەسەرکەوتن بگات))[٥٧]. کەچی لەلایـەکی ترەوە ئینونو لە١٢ی کانونی دوەمـی ١٩٤٤دا هـەواڵی خانەنشـین کردنـی مارشاڵ چاقماقی راگەیاندو وا پاکانەی بـۆ هێنایـەوە گوایـە ئـەم چەشـنە

---

[٥٥] زۆربەی پۆستە گەورەکانی دامەزراوی سـوپاییی تورکیـا لـەژێر کاریگـەیی رژێمـە رۆژئاواییەکاندان. بڕوانە:الحسن، المصدر السابق، ص٨٤-٨٦.

[56]-Berberoglu, Berch, Turkey in crisis from State Capitalism to neocolonialism, 2ed press, London,1982,p.11.

[57]-Feroz, Ahmad, op. Cit.,p.7.

کردەوانە بۆ لغاوکردنی سوپا لەلایەن دەسەلاتی مەدەنییەوە شتێکی پێویستن[٥٨].

بەجۆرە سوپا کەوتە ژێر دەسەلاتی راستەوخۆی مەدەنییەکان چونکە کارێکی وا کرا کەسەرۆکی ستادی سوپا بەرپرسیار بێ لەبەردەم سەرکۆمار(کەفەرماندەی گشتیی هێزە چەکدارەکانیشە)[٥٩]و ئەنجومەنی وەزیرانو سەرەك وەزیران[٦٠].

لەراستیدا زۆر جار لەکاروباری سەربازیدا پرس بەئەفسەرەکان کراوە. هەندێ لەئەفسەرەکان دوای تەواوکردنی خزمەتی سەربازییان، لەئەنجومەنی نیشتمانیی تورك هەڵبژێردراون یان پۆستی مەدەنیی گرنگیان پێ سپێردراوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم رێژەیە رۆژ بەرۆژ لەکزیی داوەو لەشەش یەکی ئەندامانەوە لەساڵی ١٩٢٠دا بوو بەهەشت یەك لەساڵی ١٩٤٣داو بۆ نیو لەساڵی ١٩٥٠دا[٦١].

سەبارەت بەقەوارەی لەشکری تورکیش پاش دامەزراندنی کۆمار، دەردەکەوێ کەئەو لەشکرە لەچاو ساڵی ١٩٢٢ نەختێك گەشەی کردوە. لەکۆتاییی ساڵی ١٩٣٢دا ژمارەی سەربازانی سوپا گەیشتە ٧٨ هەزار سەربازو لەکاتی جەنگی سارددا ئەو ئەرکە داهێنەرانەی کە لەسەدەی ١٩دا بەدەستەی یەدەکی عوسمانییەکان سپێردرا بوو، لەناو لەشکری تورك نەماو سڕایەوە[٦٢].

---

[58]-Ibid.,

[59]-Haddad, op.Cit.,p107.

[60]-Robinson.Op.Cit., p.238.

قانونی هەڵبژاردن لەوەش دورتر رۆیی، کاتێك رێی نەدا هیچ ئەفسەرو سەربازو خوێندکارێکی ملیتاریو پۆلیسێك بەشداری لەدەنگداندا بکا. بڕوانە: Ibid.

[61]-Haddad, op.cit.,p.107 Hurewitz,op.cit,p.215.

[62]-Robinson,op.cit.,p.241.

هۆی ئەم گۆڕانە بۆ ئەم چەند فاکتەرە دەگەڕێتەوە[٦٣]:

١-نەبونی هەڕەشە بۆ سەر بەرژەوەندی‌یە ناوخۆیی‌و دەرەکی‌یەکانی سوپا.

٢-پەیتا پەیتا دورکەوتنەوەی سوپا لەچالاکی‌ی سیاسی.

٣-ئەزمونی نوێی مەدەنی‌یەکان لەتازەکردنەوەی دامەزراوی سوپادا.

٤-پێداگرتنی هۆشمەندانەی فەرماندەکانی سوپا لەسەر پەرەدان بەسوپا.

٥-گەشەکردنی نوخبەی عەسکەری لەسەر بنچینەی لێوەشاوەیی.

تا ساڵی ١٩٤٨ سوپا هێزێکی سوارەی بەچەکی یەکەم جەنگی جیهان پڕچەککراو بوو.

لەتورکیا خوێندکاران لەتەمەنی ١٤-١٥ساڵی‌دا دەچنە فێرگە ناوەندی‌یە سوپایی‌یەکان‌و لەتەمەنی ١٩-٢٠ ساڵی‌دا داخیلی خوێندنگە جەنگی‌یەکان دەبن[٦٤]. ئەو خوێندکارانە بەو مەبەستە دەچنە خوێندنگە عەسکەری‌یەکان تا پێداویستی‌ی ڕۆژانەی خۆیان دابین بکەن‌و ڕزگاریان بێ لەهەژاری‌و پاشەڕۆژی خۆیشیان مسۆگەر بکەن[٦٥]. لەم ڕووەوە فەرماندەیەکی سوپای تورك وتویە((لاوان لەخۆشەویستی‌ی ملیتاریزم داخیلی سوپا نابن بەڵکو مەبەستیان کار دۆزینەوەو دەستەبەرکردنی خۆشگوزەرانی‌یە. بەڵام ئێمە لێرە فێریان دەکەین‌و ڕایاندەهێنین‌و وایان لێ دەکەین دڵیان

---

[63]-Ibid.,

لەم بارەیەوە شایەنی باسە کە لەماوەی نێوان ١٩٢٣-١٩٤٨دا لاوان هەوڵیان نەدا خۆیان لەدامەزراوی سوپا نزیك بکەنەوە. بڕوانە: Ibid.,p. 242.

[64]-M. Ali Birand, Emret Komutanism, Bukitap Teknografik Matbaocilik A.S. dedizilip basilmistir Dokuzncu Bask Mart 1987,p.25.

[٦٥]ژمارەی سەربازانی تورك ٨٠٠ هەزار سەربازە لەوانە ٧٠هەزار ئەفسەرو یاریدەدەری ئەفسەر. لەتورکیا وا باوە کەساڵانە لەهەر هەشت هەزار کەس نزیکەی ٩٠٠کەس وەردەگیرێن. بڕوانە: Ibid., p.13.

بەملیتاریزم بکرێتەوە ... لێرەش گیروگرفتەکانی تورکیا روبەڕومان دەبنەوە وەك گیروگرفتی داهاتو گیروگرفتی مرۆڤ. ئەگەر باری ئابوریی تورکیا راست کرایەوەو بێکاری کەم کرایەوە، لاوان بەپەرۆشەوە رو دەکەنە سوپاو ئێمەش زیاتر خزمەتمان پێ دەکرێ))[٦٦].

ئەوی راستی بێ لەتورکیا خوێندکارانی فێرگە ملیتاریەکان لەخوێندکارانی زانکۆ جیان چونکە فێرگە ملیتارییەکان ملکەچی سیستمێکی سوپایین. خوێندکاری فێرگە ملیتاریەکان بەپێچەوانەی خوێندکاری زانکۆوە کەدورە لە دیسپلین، بەدیسپلینێکی بەرزەوە کاروباری خۆی رێکدەخا. بێ لەوە خوێندکاری فێرگە ملیتاریەکان بەپێچەوانەی خوێندکاری زانکۆوە کەپاش تەواوکردنی خوێندن بەئەستەم کاری پێ دەدۆزرێتەوە، دوای ئەوەی خوێندنی خۆی تەواو دەکا، لەگەڵ هەڤاڵە ئەفسەرەکانی دیکەی دەچێتە یەکەی سەربازیی خۆیو لەڕوی موچەو

[٦٦] ئەوەی لەخوێندنگە سەربازییەکانی تورك وەردەگیرێ، لەماڵو خزمو کەسوکاری خۆی دوردەکەوێتەوە. ئەوانە لەڕوی پاكو تەمیزیو جلوبەرگو خواردنەوە بایەخی تایبەتیان پێ دەدرێو بۆ پەروەردەکردنیان قانونی توندوتۆڵو مکوم هەیە، بێ لەچەندەها ئەزمون لەرێی کۆمپیوتەرەوە بۆ سازکردنی سوپایەکی مەشق پێکراوو بەگیانی عەسکەرتاریا گۆشکراو.

هەرخوێندکارێك کەداخیلی خوێندنگەی جەنگی دەبێ، دەست لەسەر ئاڵای تورکو چەکێکی سەر مێز دادەنێو سوێند بەشەرەفی خۆی دەخوا کەبەرگری لەکۆمار بکا.

کاتێك لەئەفسەرێکی تورك دەپرسن ژیانی چۆن بەسەر بردوە دەڵێ((بەپلەی ملازمی دوو لەخوێندنگەی جەنگی دەرچومو دوای خزمەتێکی زۆر زانیم کە کراومەتە جەنەراڵو لێرە بەدوا خانەنشین کرام. کە پلەم بەرز دەکرایەوە، خەنی دەبومو رۆندك لەچاوانم دەهاتە خوار بەڵام کە کرامە جەنەراڵ، چاوم پڕ فرمێسك بوو بەڵام ئەو فرمێسکانە فرمێسکی خەمو پەژارە بوون)). بڕوانە: Ibid.,p. 215.

لەتورکیا وا باوە کە بەجەنەراڵ بوترێ((پاشا)). ئەو جەنەراڵانە هەندێکیان لە لەشکر دەسبەکار دەبنو هەندێکیان لەسەرکردایەتیی ستادی گشتیی سوپای تورك. بڕوانە: Ibid.,

لایەنەکانی تری گوزەرانەوە بەیەکسانی رەفتاری لەگەڵدا دەکرێو بەتەواوی لەژیانی مەدەنی دادەبڕێ[٦٧].

بێجگە لەمە، ئەفسەرەکە خۆی لەمەدەنی‌یەکان جودا دەکاتەوە چونکە سەربازانە پەروەردە کراوە، لێپرسراوەتی‌یەکی گەورەی لەسەر شانە، لەسەر سیستمێکی پلەداری راهاتوەو بەوردی لای رونە کە پێویستە چی بکاو بەپەندو زانیاریی ملیتاری‌یانە گۆش کراوە. لەبەر ئەوە بەسوکایەتی‌یەوە دەڕوانێتە ژیانی مەدەنی‌ی پڕ هەراو گێچەڵو بێ سەروبەرو خۆی بەگەورەتر لەمەدەنی‌یەکان دادەنێ، لەو بڕوایەدایە کەهێزی چەکدار هێزێکی موکم وپتەو و بەبیروباوەڕەو خۆیشی بەشێکی پێکدێنێ، هەست دەکا مەدەنی‌یەکان بەقەدەر ئەو بەرگری لەبیروباوەڕی ئەتاتورك ناکەنو لەسۆنگەی ئەمەوە بەتەواوی لەژیانی مەدەنی دادەبڕێ[٦٨].

لەنێوان ئەندامێکی هێزی زەمینی‌و ئەندامێکی هێزی دەریایی‌دا جیاوازی هەیە. ئەوانەی لەهێزی زەمینی‌دان لەهەمو شوێنێکی تورکیاوە دێن بەڵام ئەوانەی رو دەکەنە خوێندنگە ناوەندی‌یە دەریایی‌و خوێندنگە دەریایی‌یەکان٧٠٪ یان خەڵکی ناوچەکانی نزیك دەرياو بەندەرەکانن[٦٩].

هەلومەرجی هێزی ئاسمانیش لەهەلومەرجی هەمو رشتەکانی دی جیاوازترە چونکە هەر خوێندنگەیەکی جەنگی کەدواتر فڕۆکەیەکی بایی ٤٠ ملیون دۆلار دەخاتە بەر دەستی فڕۆکەوانەوە، حیسابی هەمو شتێك دەکاو لەوردو درشتی مەسەلەکان دەکۆڵێتەوە ئینجا بڕیار لەسەر وەرگرتنی فلانو فیسار دەدا. زوربەی ئەوانەی لەوێ وەردەگیرێن خەڵکی شارە گەورەکانن[٧٠].

---

67-Ibid., pp.155-173.

68-Ibid.,

69-Ibid.,p.176.

٧٠ئاشکرایە کە خەڵك ساڵ بەساڵ زیاتر ویستویانە بچنە هێزی ئاسمانی. بۆ نمونە لەهەر٧-٨ هەزار خوێندکار ساڵانە تەنها ٢٠٠ خوێندکار وەردەگیرێن. وەرگیران لەهێزی ئاسمانی لەهەمو رشتەکانی تر جیایەو مەرجی زۆر قورسی بۆ دانراوە. بڕوانە: Ibid.,p 77

بنەمای ستراتیجی سوپایی لەتورکیا دەوەستێتە سەر دو ستراتیج:
١-ستراتیجی پەیمانی باکوری ئەتلانتیك(ناتۆ).
٢-ستراتیجی نەتەوەیی.
دیارە پەیوەندییەك لەنێوان هێزە چەکدارەکانی تورك‌و ناتۆ هەیەو حکومەتی تورك‌و ناتۆ لەسەر چۆنێتیی بەکارهێنانی ئەو هێزە لەکاتی هەڵگیرسانی جەنگدا ڕێککەوتنیان لەنێواندایە[٧١].
بێگومان سەرۆکایەتیی ستادی گشتیش گرنگەو یەکێ لەئامانجە سەرەکییەکانی[٧٢] مۆرکردنی ڕێککەوتنی سوپایی‌و بەرگری کردنە لەبۆچونی خۆی سەبارەت بەمەسەلە سوپاییەکانی ناو پەیمانی ناتۆ[٧٣].

---

[71]-Ibid.,p.353-355.

بەگوتەی فەرماندەیەکی گەورەی هێزی زەمینیی تورك((هەر هاوڵاتییەکی تورك کە دەگاتە ٢٠ساڵی، دەبێ بۆ ماوەی ١٨ مانگ خزمەتی سوپا بکا. لەبەر ئەوەش کەژمارەی دانیشتوانی تورکیا تا دێ زیاتر دەبێ، کاربەدەستانی سوپا هەندێ جار ناچار دەبن قانونی نوێ دەرکەن بۆ ئەوەی ماوەی خزمەتی سەربازی کەم بکرێتەوە یاخود لەبری سەربازی، پارەیەکی دیاریکراو لەخوێندکار بسەنرێ. بێ لەوە سوپای تورك نوقستانیی لەزرێپۆشی تازە هەیە، لەبەر ئەوە هەر تانکێکی کۆن پێنج سەربازی بۆ تەرخان دەکرێ، لەکاتێکدا تانکی پێشکەوتوی سوپاکانی تر بەدو سەرباز هەڵدەسورێ چونکە ئامێری ئەلکترۆنیی تێدایە. هەڕەشەی بەردەوام کەلەو دیوی سنور لێمان دەکرێ، وامان لێ دەکا وریاو بەئاگا بین، هەوڵ بدەین ژمارەی سەربازان زیاد بکەین، چەکی پێشکەوتو بکڕین، پشت بەتەکنەلۆژیای نوێ ببەستین‌و چەکی کۆن فرێدەین)). بڕوانە:Ibid.,p. 209.

[72]-Ibid.,

[73]-Ibid.,

ئەرکی سەرۆکی ستادی گشتی، بێجگە لەچەسپاندنی سیاسەتی سوپا، کارکردنە سەر ژیانی سیاسیی تورکیایە. سەبارەت بەئەرکی یاساییش، سەرۆکی ستادی گشتی سیاسەتی سوپا دادەڕێژێ، مشوری کاروباری خۆسازدان بۆ جەنگ دەخوا، کادیر دابین دەکا، هەواڵگری ڕێکدەخا، نەخشە بۆ جموجوڵی سوپایی‌و ستراتیجی دادەنێ‌و مشوری کاروباری تری هێزە چەکدارەکانی تورکیا دەخوا. بڕوانە: Ibid.,.

سەرۆکایەتیی ستادی گشتی بەدەزگایەکی زۆر گرنگ دادەنرێ‌و بۆ ناتۆ گرنگییەکی تایبەتی هەیە. چاکترین ئەفسەرانی تورك لەم دەزگایە خزمەت دەکەن. بڕوانە: Ibid.,.

وەزارەتی هەندەرانی تورکیش لەسەر هەندێ مەسەلەی سوپایی‌ی گرنگ لەگەڵ سەرۆکایەتی‌ی ستادی گشتی‌دا یەکدەنگە[٧٤]. هێزی چەکداری تورک سێ کەناڵی هەواڵگریی هەیە کەبریتین لە:

١-هەواڵگری‌ی هێزی زەمینی‌و ئاسمانی‌و دەریایی.

٢-بەشی بیستن(الانصات) کەدەزگای ئەلکترونی‌ی پێشکەوتوی هەیە.

٣-هەواڵگری‌ی پاشکۆ سوپایی‌یەکانی باڵوێزخانەکان[٧٥].

لەخوێندنگە جەنگی‌یەکانی تورکدا وانەکان تەئکید لەسەر شەش پرنسیپەکەی ئەتاتورك دەکەنەوە کەبریتین لەکۆمار خوازی، نەتەوەپەرستی، گەلپەرستی، دەوڵەتپەرستی، عیلمانیەت‌و شۆڕشگێڕی. هەمو خوێندکارو ئەفسەرو فەرماندەیەك دەبێ پابەندی ئەم پرنسیپانە بێ‌و بەرگریشیان لێ بکا[٧٦]. پێویستە لەسەر هەر ئەفسەرێك بەپێی گوتەکانی ئەتاتورك خۆی لەسیاسەت دورەپەرێز راگرێ‌و ئاماژە بەوەش بکا کەنابێ حزبەکان توخنی کاروباری سوپا بکەون. لەروانگەی سوپاوە حیزبەکان دەبێ بۆ خۆشگوزەرانی‌ی گەل‌و چەسپاندنی دیموکراسی تێبکۆشن، گوایە سیاسەتمەداری راستەقینە ئەوەیە کەباوەڕی بەبیروباوەڕی ئەتاتورك هەیە. ئیتر تێڕوانینی ئەفسەری تورك بۆ سیاسی‌یەکان بوو بەتێڕوانینێکی نائیجابی چونکە سیاسی‌یەکان لەروانگەی ئەفسەرانەوە تەنها بیر لەقازانجی خۆیان دەکەن‌و بەرژەوەندی‌ی نەتەوەیان فەرامۆش کردوە[٧٧].

دامەزراوی سوپا دەڵێ گوایە کۆمۆنیستەکان‌و کوردو بزاڤە ئاینی‌یەکان هەرەشە لەرژێمی تورکیا دەکەن‌و بەم پێودانگە وای بۆ دەچێ کەحیزبەکان

---

74-Ibid.,

٧٥ دامەزراوی ئاسایشی نەتەوەیی یەکێکە لەسەرچاوەکانی هەواڵگری‌ی سەرۆکایەتی‌ی گشتی کەهەواڵ‌و دەنگوباس بۆ سەرۆکایەتی‌ی ستاد کۆدەکاتەوە بۆ ئەوەی سودی لێ وەرگرێ. ئەم دامەزراوە سەر بەسەرۆکایەتی‌ی وەزیرانە. بڕوانە: Ibid.,p. 402.

76-Ibid.,pp.108-113.

77-Ibid.,pp.114-134.

بۆ بەرژەوەندیی خۆیان دەستێکی بالآیان لەتەفرەدانی گەڵدا هەیە، کار دەکەنە سەر ورەیان و لەپرنسیپەکانی ئەتاتورك دوریان دەخەنەوەو لەم سەروبەندەدا گوایە سوپای دڵسۆزی گەل بۆ پوچەڵ کردنەوەی ئەو هەوڵانە ورياو هۆشیارەو لیّ ناگەڕیّ دەسکاریی دەستور بکرێو دیموکراسی پشت گویّ بخرێ. لەروانگەی سوپاوە هەرچی ئەو حزبانە هەوڵی بۆ دەدەن، لەبەردەم هێزو خۆڕاگریی سوپادا مایە پوچ دەردەچن[78].

لەسۆنگەی ئەمەوە خوێندکارانی فێرگە جەنگییەکان بڕوای تەواویان بەبیروباوەڕی ئەتاتورك هەیەو ئامادەن بەرگری لەرژێمی عیلمانی بکەن، ئەویش لەو حاڵەتانە:

١-ئەگەر بناغەکانی عیلمانیەت داڕزێن و حوکم بەرەو شەریعەتی ئیسلام رۆیی.

٢-ئەگەر مەترسیی کۆمۆنیزم سەری هەڵدا یاخود ئەگەر بزوتنەوە جیا خوازەکان کەوتنە هەڕەشە کردن، بەتایبەتی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی.

٣-ئەگەر سیاسییەکان نەیانتوانی بەرپەرچی ئەو هەڕەشانە بدەنەوە.

گوایە ئەوسا سوپا بۆ رزگار کردنی رژێم دەخالەت دەکا[79]. ئەمەش ئەرکی سەر شانی هەر خوێندکارێکی ملیتاریو هەر ئەفسەرو فەرماندەیەکە چونکە ئەوکتێبانەی لەخوێندنگە جەنگییەکان دەخوێنرێن ئەو کتێبانەن کەدەچنەوە سەر بیروباوەڕی ئەتاتورك و بانگەشە بۆ ئەوە دەکەن گوایە ئەرکی بنەڕەتیی هێزە چەکدارەکانی تورك بەرگری کردنە لەکۆماری تورکیا ئەگەر لەناوەوەو دەرەوە کەوتە بەر شالآوی هەڕەشە.

---

[78]-Ibid.,

[79]-Ibid.,p.149.

لەڕوانگەی سوپاوە بیروباوەڕی ئەتاتورك بۆ پاراستنی دەوڵەتی تورك داهاتوە[80].

لەم بارەیەوە فەرماندەیەکی سوپا وتویە((ئەتاتورك ئەم بیروباوەڕو ئەم نیشتمانەی وەك ئەمانەت بۆ هێشتوینەتەوە. بەرگری کردن لەو بیروباوەڕە بەرگری کردنە لەنیشتمان. هەم لەناوەوە هەڕەشە لەنیشتمانەکەم دەکرێ هەم لەدەرەوە، گەلەکەشمان گەلێکی نەخوێنەوارەو سیاسییەکان بەئاسانی لەخشتەی دەبەن. ئامانجی من ئەو دیموکراسییەیە کە ئەتاتورك دایناوەو هەر کات سەربەخۆیی و ئایندەی تورکیا کەوتە مەترسییەوە، دەبێ بەرگری لەتورکیا بکەم چونکە ئەم نیشتمانە بۆ من وەك سەربازگەیەك وایە))[81].

---

[80]-Ibid.,

[81]-Ibid.,p.152.

## تەوەری دووەم

# خەرجی‌یە سەربازییەکانی تورکیا *

سەلام سەزگین **

### پوختە

ئەم وتارە لەخەرجی‌یە سەربازییەکانی تورکیا دەکۆڵێتەوە. لەبەشی یەکەمی وتارەکەدا، بەکورتی باس لەپێکهاتەی ئابووری، هێزە چەکدارەکان، پیشەسازیی سەربازی، نوێکاری‌و رەوتی خەرجی‌یە سەربازییەکانی تورکیا دەکرێ. لەبەشەکەی دواتردا، تیشك دەخەینە سەر، پێوەندیی نێوان خەرجی‌یە سەربازییەکان‌و گەشەی ئابوری.

هەروەها لەگۆشەنیگای بەراوردی ئابورییەوە، ئاسەواری خەرجی‌یە سەربازییەکان لەسەر گەشەی ئابوری لێکدراوەتەوە.

لەم قۆناغەدا، هەم ئاکامە دەرەکی‌یەکان‌و هەم ئاسەواری بڕی خەرجی‌یە سەربازییەکانمان لێکداوەتەوە. ئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە ئەوە نیشان دەدەن کە لەتورکیا خەرجی‌یە سەربازییەکان، دەبنە ئەنگێزەی گەشەی ئابوری، لەکاتێکدا ئاکامە دەرەکییەکانی بەشی بەرگری لەسەر بەشەکانی تری ئابوریی تورکیا مەنفی بوە.

### سەرەتا

لەم توێژینەوەیەی هێزە چەکدارەکانی تورکیادا، دوا گەشەی پیشەسازیی سەربازی‌و نوێکارییەکانی، رەوتی خەرجی‌یە سەربازییەکان‌و

---

* -Sezgin, Selam. ((Country Surrey X: Defence Spending in Turkey)). In Defence and Peace Economics. Vol. 8, No. 4, 1997, PP. 381-409.

** سەلام سەزگین ئەندامی گروپی ئابورییە لەزانکۆی یۆرك لەبریتانیا.

پەیوەندیی نێوان خەرجییە سەربازییەکانو گەشەی ئابوری باس دەکرێ. خولی ساڵەکانی ١٩٥٠-١٩٩٣ دەخرێتە بەر لێکۆڵینەوە کەتیایدا پەرەسەندنی گرنگ لەبوارەکانی بەرگریو گەشەی ئابوریی تورکیا بەدی دەکرێ.

تورکیا بەزیاتر لە٦٠ ملیۆن دانیشتوانو روبەرێکی نزیک بە ٧٧٩ هەزار میلی چوارگۆشەو داگیرکردنی جێگایەکی جیۆستراتیجی، بوە بەیەکێ لەوڵاتە گرنگەکانی ناوچەکە. ئەم وڵاتە کەدەکەوێتە نێوان ئەوروپاو رۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە هاوسنورە لەگەڵ هەریەکە لەیەکێتی سۆڤێتی جاران (ئێستا جۆرجیاو ئەرمەنستان)، ئێران، عیراق، سوریا، یۆنانو بولگاریا.

سەرەڕای ئەوەی تورکیا خاوەن قورساییەکی بەرگریی باڵایە Defence Burden کەچی بە بەراورد لەگەڵ وڵاتە دراوسێکانیدا لەئاستێکی مام ناوەندایە. تورکیا ئەندامی رێکخراوی پەیمانی ئەتلەنتیکی باکور (ناتۆ)و رێکخراوی گەشەپێدانو هاوکاری ئابورییە (OEDC). ئەم وڵاتە خاوەن هێزێکی سەربازیی بەهێزە. هێزە چەکدارەکانی تورکیا بەپلەی حەوتەم دێن لەجیهانداو بەگەورەترین هێزی چەکداری بەشە ئەوروپاییەکەی ناتۆ دادەنرێ. لەڕوی ئابورییەوەو بە بەراورد لەگەڵ وڵاتە پیشەسازییەکانی رۆژئاوادا، تورکیا لەئاستێکی گەشەی ئابوریی نزمتردایە، بەڵام لەسەردەمی کۆماریدا، نێونجی گەشەی ئابوریی تورکیا ئاستێکی بەرزتری بەدەستهێناوەو بۆتە خاوەن بەشێکی سەنعەتیی پەرەسەندوو. پاش ساڵی ١٩٨٠ تورکیا بەئاراستەی گەشەی بنیاتنراو لەسەر ئارەزووی ناردنە دەرەوە بوەو ئابوریی ئەم وڵاتە لەنێوان ساڵەکانی ١٩٨٠و ١٩٩٣دا گەشەیەکی ئابوریی باڵای نیشانداوە.

لەدرێژەی وتارەکەداو لەبەشەکەی دواتردا، کورتەیەك لەڕەوتی گەشەی تورکیا، یەکە گشتییەکانی ئابوری گەورەی تورکیا، پێداچونەوەیەکی

خەرجی‌یە سەربازییەکان، رەوتی خەرجی‌یە سەربازییەکان‌و گرنگی‌یان بۆ ئابوری‌و هێزە چەکدارەکانی وڵات دەخرێتەڕو. ئەم بەشە، بەخستنەڕوی چەند رونکردنەوەیەك لەبارەی پیشەسازی سەربازی‌ی تورکیاو نوێکارییەکانی، کۆتایی دێ. بەشی سێهەمیش پێکهاتوە لەدو بەش، لەبەشی یەکەمدا، مۆدێلێك لەلایەنی خستنەڕوی جۆری ڤیدیر Feder Type Supply Side Model لێکدەدرێتەوەو دوەمین بەشیشی تایبەت دەبێ بە بەراوردی پەیوەندی‌ی نێوان خەرجی‌یە سەربازییەکانی تورکیاو گەشە ئابورییەکەی.

لەبەشی کۆتایی‌ی وتارەکەشدا، پوختەی بەدەستهاتوە بنەڕەتیەکەی لێکۆڵینەوەکەو ژمارەیەك لەئەنجامەکانی دەخرێنە روو.

## پرۆسەی پەرەسەندنی تورکیا

### زەمینەی پرۆسەکە

بۆ تێگەیشتن لەهەلومەرجی ئابوری‌ی ئێستای تورکیا، پێداچونەوەیەکی مێژوی ئەم دواییەی وڵاتەکە سودبەخش دەبێ. پاش جەنگی یەکەمی جیهان، ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەسەڵاتی بەسەر قەڵەمڕەوی خۆیدا نەماو کۆماری تازەی تورکیا لەساڵی ١٩٢٣دا لەدایکبو. دواتر ژمارەیەك گۆڕانکاری‌ی بنەڕەتی لەسستمە کۆمەڵایەتی، سیاسی‌و ئابورییەکانی وڵاتدا هاتنە دی. سەرکردەی بێ مونافسی ئەم گۆڕانکارییانە، ئەتاتورك بو. ئەو لەپاش پێکهێنانی کۆماری تورکیا لەساڵی ١٩٢٣دا، بوە یەکەمین سەرکۆماری ئەو وڵاتەو تاکاتی مردنی لەساڵی ١٩٣٨، سەرکردایەتی‌ی گەشەی تورکیای دەکرد.

هەر لەکاتی دامەزراندنی کۆمارەوە تا ساڵی ١٩٨٠، تورکیا سیاسەتی پیشەسازی کردنی لەناو ئابورییەکی داخراوو چاو لەدەر out ward Lookingو لەسەر بناغەی دەستێوەردانی دەوڵەت گرتبوە بەر.

پاش هاتنــە ســەرکاری عەســکەرتاریا لەئــەیلولی ۱۹۸۰دا، ئــەمانیش ســتراتیجی ئــابوریی چــاو لــەدەرەوەیان گرتــە بــەر. دەتوانــــرێ پرۆســــەی پەرەسەندنی تورکیا بۆ چەند ماوەیەك دابــەش بکــرێ. بــۆ نمونــە لەســالّی ۱۹۲۳ تــاکو ۱۹۳۹، ئــابوریی تورکیــا متمانــەی کردبــۆوە ســــەر ســەرمایەگوزاری لەپیشەسازی قــورس‌و تەرحــە پیشەســازییەکاندا. لــەم خولــەدا کــەتێرمی بەرنامــە دانــانی پیشەســازی Planning term industrial بو، یەکێتیی سۆڤێت رۆڵی دیاریکەری تێدا هــەبو. هــەروەها نێونجی بالاّی گەشەی ئابوری، بەشێوەیەکی مام ناوەند سالاّنە لەمیانی خولی ۱۹۲٤-۱۹٤۰دا بــەرێژەی ٦,٥٪ هاتــەدی. لەســالّەکانی جــەنگی دووەمــی جیــهانیدا (۱۹۳۹-۱۹٤٥)، ئــابوریی تورکیــا کەوتــە ژێــر کاریگــەری نیگەرانیی چونــە نــاو جەنگەکــەوە. لەتایبەتمەندێتییــەکانی خــولی پێنــج سالّەی ۱۹٤٥-۱۹٥۰ ئەوە بو کە ولاّت لەسستمی تاك حزبییەوە هــەنگاوی بــەرەو دیموکراســی نــا. لــەنێوان ســالّەکانی (۱۹۳۹-۱۹٥۰,۹٪. خــــولی سالّەکانی ۱۹٥۰-۱۹٦۰ بریتی بوو لەخولی هەلاّوسان‌و نەشونمای)، نێونجی گەشەی سالاّنەی تورکیا بەرادەیەك هاتە خوارەوە گەیشتە ئاستێکی خــراپ. جگە لەسالّی ۱۹٤٦ کەنێونجی گەشە گەیشــتە ئاســتی ۳۱خــێرای نــاردەو بەروبومە کشتوکالّییەکانی تورکیا. لــەخولی ســنورداری ۱۹٥۰-۱۹٥۳دا، هەولّێکی زۆر بۆ ئازاد کردنی ئابوری درا. لەهەردو بەرنامەی پێنج ســالّەی یەکەم (۱۹٦۳-۱۹۷۲)، بۆچونی رەسمی بەئاراستەی چــاو لــەناوەوە کــردن Inward-Oriented Approach بوو.

لەدەیەکانی ۱۹٦۰و سەرەتاکانی دەیەکانی ۱۹۷۰دا، ئــابوریی تورکیــا رێچکەی پیشەسازی بونی لەرێگای جێگرتنەوەی هــاوردەوە تــاقی کــردەوە، بەلاّم ئاکامەکانی بــەرزو نزمــیی نرخــی نــەوت‌و دەســتێوەردانی ســەربازی لەقوبرس لەسالّی ۱۹۷٤دا، پەرەسەندنی تورکیایان خستە ژێر کاریگەریی خۆیانەوە. ئابوریی ولاّت لەکۆتاییی دەیەی سالّی ۱۹۷۰دا، هاوکات لەگەلّ

قەیرانی سیاسیدا، کەوتە قەیرانەوە. لەسالّی ۱۹۸۰دا، گۆڕانێکی کتوپڕ لەئابوریی تورکیا دەستی پێکرد، لەساڵێك لەمەوبەریشەوە، بەروبومی ناپوختەی میللیی راستەقینە، بۆ یەکەمین جار بەدرێژاییی یەك دەیە، هاتە خوارەوەو نێونجی هەڵاوسانی ساڵانە گەیشتە ئاستی ۱٦٪. لەگەڵ هەمو ئەمانەشدا، حکومەتی نوێ لەساڵی ۱۹۸۰دا بەرنامەی سەرەکی ریفۆرمی ئابوری دەستپێکردو ئەم ریفۆرمانە لەدوای کودەتا سەربازییەکەوە جێبەجێ کران. گۆڕانە بنەڕەتییەکانی پرۆسەی پەرەسەندنی تورکیا لەدوای ساڵی ۱۹۸۰وە، بەئاراستەی گەشەی پشت بەستن بەنارده بو.

لەنێوان ساڵەکانی ۱۹۸۰و ۱۹۹۳دا، بەشێوەیەکی مام ناوەند ئابوریی تورکیا نێونجێکی بالای گەشەی بەرێژەی ۲,٥٪ تۆمارکرد.

## ئامارە ئابورییەکان

رەوتی گشتیی ئابوریی تورکیا لەخشتەی ژمارە (۱)دا نیشاندراوە. داتاکانی DATA دە ساڵە هەر لە (۱۹٥۰)وە تاکو ۱۹۸۰، پێنج ساڵە لەنێوان ساڵەکانی ۱۹۸۰و ۱۹۹۰و ساڵانە پاش ساڵی ۱۹۹۰ لەم خشتەیەدا دەبینرێ. نێونجی گەشەی دانیشتوان بەرز بوەو لەنێوان ساڵەکانی ۱۹٥۰و ۱۹۹٤دا بەنێونجی مام ناوەندی ساڵانە، دانیشتوانی تورکیا بەرێژەی ۲.٤٪، سێ بەرابەر زیادی کردوە، لەدەیەی ۱۹۷۰دا، تێکڕای هەڵاوسان زۆر بەرز بوو، ئەگەرچی لەنێوان ساڵەکانی ۱۹۸۱و ۱۹۸٤دا، رەوتی دابەزینی هەڵاوسان بەدی دەکرێ.

سەبارەت بەبێکاری، لەو ساڵانەی خراونەتە بەر لێکۆڵینەوە، گۆڕانێکی کەم دەبینرێو نێونجی بێکاری لەساڵی ۱۹۷۰دا گەیشتە بەرزترین ئاستی خۆی بەرێژەی ۱۲٪. لەکاتێکدا نێونجی گەشەی راستەقینە GNPی بەروبومی ناپوختەی میللی بەنرخە نەگۆڕەکانی ساڵی ۱۹۸۷-بەشێوەیەکی مام ناوەند لەخولی ۱۹٥۰-۱۹۹٤، ساڵانە ٤,٥٪ بوە.

سەرەڕای ئەوەی کەنێونجی مـــام نـاوەند بـەڕێژە بـەرزە، بـەڵام بـەرزبون و دابەزینی کتوپڕ لەنێونجی گەشەدا هەبوو. هەروەها ڕەوتێکـــی زیـادبون لـە GNP ی سـەرانەی واقیعـی دەبینرێ، ئەگـــەرچی بـــەهۆی بەرنامـــەی جێگیرکردنی ئابورییەوە لەساڵی ١٩٩٤دا کە لـەمانگی نیسانەوە دەسـتی پێکرد، دابەزینێك بەدی دەکـرێ. ڕێـژەی سـەرمایەگوزاری لەگـەڵ GNP، نیشاندەری ڕەوتێکی ئارام و رو لەبالایە بەدرێژایی ئـەم خولـە. بەشـداریی بودجەی حکومـەتی ناوەند لـە GNPدا نیشـانەی بەربلاوییـەکی بـەرچاوی چالاکیی حکومەتە لەئابوریدا دوای ساڵی ١٩٩٠.

داتاکانی پەیوەندیدار بە بەشداریی ناردەکان لە GNPدا، ئەوە دەردەخەن کەبەشی نارده لەدوای ساڵی (١٩٨٠)وە خاوەن گەشەیەکی خـێرا بوە، بەجۆرێك کەناردە، جێگایەکی گرنگی لەئابوریدا بەدەستهێناوە.

## خەرجییە سەربازییەکانی تورکیا

بەدرێژایی چل ساڵی رابردوو، خەرجییەکانی بواری بەرگریی تورکیـا نزیکـەی ٤٨٪ی GNP بـوەو بەشـێوەیەکی مـــام نـــاوەند ٢١.٧٪ی خەرجییەکانی حکومـەتی ناوەندیی گرتۆتەوە.

بەبەراورد لەگەڵ نـاتۆدا، تورکیـا ڕێـژە سـەدییەکی زیـاتری GNP ی بـەڕێژەی ٤,٨٪ ی لـەبواری سـەربازیدا خـەرج کـردوەو لەهـەمان کـاتدا، لـەخولی ١٩٥٠-١٩٩٤دا، نێونجـی گەشـەی ئـابوریی لەســنوری ٥,٤٪ لەساڵێکدا بوە.

لەساڵی ١٩٥٢ بەدواوە کـاتێك تورکیـا بـوە ئـەندامی نـاتۆ، زۆربـەی سـاڵەکان، بـاردنی بـەرگریی تورکیـا گـەورەتر بـوە لـەنێونجی NATO، لەکاتێکدا ئاستی پەرەسەندنەکەی بەشێوەیەکی ڕێژەیی نزمتر بوە.

خشتەی ژمـــارە ٢ نیشـانەکانی خـەرجیی سـەبازیی تورکیـا لـەنێوان سـاڵەکانی ١٩٥٠-١٩٩٤دا نیشـان دەدا. خەرجییـەکانی بەیەکـەی دراوی نیشتمانی (لیرە)و بەنرخە نەگۆڕەکانی ساڵی (١٩٨٧)ن. نێونجـی خـەرجیی

سەربازی بەشێوەیەکی مام ناوەند لەساڵێکدا ٦,٢و نێونجی گەشــەی GNP بەشێوەیەکی مام ناوەند بریتی‌یە لە ٥,٤٪ لەســاڵێکدا. ڕێژەکـانی بـاردنی بـەرگریی درێژخایـەن (ڕێـژەی خەرجی‌یـە سـەربازییەکان بـۆ بەرهـــەمی ناپوختــەی میللــی (ME/GNP)و ڕێـژەی خەرجی‌یە سـەربازییەکان بــۆ بودجەی حکومـــەتی نـاوەند (ME/CGB)، یـەك لـەدوای یـەك بـەڕێژەی ٤,٧٪و ٢١,٧٪ لەساڵێکدا بون. لەساڵەکانی دواییدا، چەند سەرچاوەیەکی تر جگە لەبودجــەی حکومــەتی نـاوەند (CGB)، بەشـداریی خەرجی‌یـە سەربازییەکانیان کردوە، کە گرنگترینیان سندوقی پشتگیری لەپیشەسازیی سەربازیی (Defence Idustry Support Fund) DISF بوو.

لەســـاڵی ١٩٨٦دا DISF خـــاوەن بودجەیـــەکی گـــەورە بـــو کـــە لەسەرچاوەکانی خۆیەوە دابینی کردوە. بەر لەو ڕێکەوتە، بودجەکەی بریتــی بو لەبەشێك لەبودجەی حکومەتی ناوەند. بەم جۆرە لەخشـــتەی ژمــارە ٢دا بەشی خەرجی‌یە سەربازییەکان لەبوجــەی حکومــەتی نـاوەندەوە، بودجــەی DISFی نەدەگرتــەوەو ســەرەنجام، لەســاڵی ١٩٨٦دا، دابـەزینێك لـەڕێژەی خەرجی‌یە سەربازییەکان بۆ بودجەی حکومەتی ناوەند دەبینرێ.

ئەگەر بێتو باردنی بەرگریی تورکیــا لەگــەڵ بـاردنی بـەرگریی نـاتۆ بەراورد بکـــەین، دەبینـــین بـاردنی بـەرگریی تورکیـا هەمیشـە گـەورەترە لەباردنی بەرگریی وڵاتـــە ئەوروپاییـــەکانی ئـەندامی نـاتۆ، بـەڵام ئەگــەر ئەمریکای باکور لەبەرچاو بگرین، ئەنجامەکان بەهۆی گـــەورەیی‌ی بـاردنی بەرگریی ئەمریکاوە، لێك دەترازێن.

لایەنێکی تری خەرجی‌یە سەربازییەکان بریتی‌یە لەبەشی خەرجییـــەکان لەبودجەی حکومەتی ناوەندا. ئەم ڕێژەیە لەتورکیا زۆر زیاترە لەوڵاتەکانی تری ئەندامی ناتۆ. لەلایەکی ترەوە، کاتێ خەرجی‌یە سەربازییەکانی سەرانە لەبەرچاو بگرین، دەبینین ئەم ڕێژەیە لەتورکیا زۆر نزمترە بەبەراورد لەگــەڵ وڵاتانی تری ئەندامی ناتۆ.

دورنمایەکی تری بودجەی بەرگری، بریتی‌یە لەدابەشکردنی ئەو بودجەیە لـەنێوان کەسـەکان، کەلوپەلـــەکان، ژێرخـــان‌و خەرجی‌یـــەکانی تـــردا. بەشێوەیەکی مام ناوەند لە ٥٠٪ ی خەرجی‌یە ســـەربازییەکان، ســالآنە بـۆ کەسـەکان بـوە. (١٩٩٠-١٩٩٤) ٢٣,٧٪ ی بـۆ کەلوپـــەل‌و ٣٪ ی بـــۆ ژێرخانەکان‌و ٢٢,٥٪ ی بۆ خەرجی‌یەکانی تر. ئەوەی جێی ســەرنجە لـێرەدا ئەوەیە کەنیوەی خەرجی‌یە سەربازییەکانی تورکیا تایبەت بوە بەکەسەکان‌و ئەم رێژەیەش جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ رێژەکانی وڵاتانی ئەندامی ناتۆدا نییە.

## هێزە چەکدارەکانی تورکیا

پێویـــستە بگوتـرێ کـەهێزە چـەکدارەکانی تورکیـا خـاوەنی باشـــترین رێکخستن، بەرزترین دیسپلین‌و کۆنترین رێکخراوی وڵاتـــن. تورکیـا خـاوەنی یەکێ لەگەورەترین هێزی چەکداری جیهانەو لەساڵی ١٩٩١دا، ئـەم وڵاتـە لەسەر بناغەی راپۆرتی ساڵی ١٩٩٤ی نـاوەندی ACDA ی ئـەمریکایی، پلەی حەوتەمی لەجیهاندا بەدەستهێناوەو خاوەنی زۆرتریـن ژمـارەی هـێزی چـەکدار (٨١١٠٠٠ کەســی لەسـاڵی ١٩٩٤دا) لەبەشـە ئەوروپاییەکـەی ناتۆدا بوە.

رێژەی کەســـانی ســەربازی‌و مـــەدەنی‌ی ســوپایی تورکیـا لەســاڵەکانی ١٩٩٠-١٩٩٤ لەرێژەی گشتی‌ی هێزی کار، نزیکەی ٤,٢٪ بـــوە. ئەمـــەش هەمیشە رێژەیەکی زۆر بەرزتر بـوە لـەنێونجی نـاتۆ کەبریتی‌یـە لـە٢,٢٪ (بڕوانە خشتەی ژمارە٣).

لەخولی ١٩٩٠-١٩٩٤دا تورکیا بەشێوەیەکی مـام نـاوەند هـەر سـاڵە ٢٣٪ ی هێزە چەکدارەکانی بەشی ئەوروپای نـــاتۆو ١٤٪ ی گشـت کەسـە سەربازییەکانی ناتۆی لەخۆ گرتـوە. ئەگـەرچی وڵاتـەکانی ئـەندامی نـاتۆ ئـەندازەی سـوپاکانی خۆیـان کەمکردۆتـەوە، بـەڵام ئـەم کەمکردنەوەیـــە

لەسوپای تورکیادا بەدی ناکرێ، سوپای تورکیا هەمیشە لەرێکخستنەکانی حکومەتدا گەورە بوە.

خزمەتی سەربازی کردن، ئیجبارییەو ماوەکەی بەدرێژایی‌ی کات لەگۆڕاندا بوە. لەساڵی ١٩٩٥دا ماوەی خزمەتی سەربازی بە ١٨ مانگ دانراوە، چەند ساڵ لەوەوبەر ماوەی خزمەت ١٥ مانگ بوو، بەڵام بەهۆی رو لەزیادبونی هەڕەشەکانی یاخی بونی پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK)و مشتومڕ لەگەڵ یۆنان، ماوەی خزمەتی سەربازی کرا بە (١٨) مانگ. ئەوانەی خزمەتی سەربازیش ئەنجام دەدەن، هەمو ئەو پیاوانەن کە گەیشتونەتە تەمەنی (٢٠) ساڵی‌و بەهۆی گەشەی باڵای دانیشتوانیشەوە، ژمارەی ئەوانەی بۆ سەربازی بانگ دەکرێن، هەر ساڵە رو لەزیاد بون دەبێ.

لەخولەکانی ١٩٧٣-١٩٧٤، ١٩٨٨-١٩٨٩، ١٩٩٢-١٩٩٣دا، ئەندازەی سوپا بەهۆی کورتی‌ی ماوەی ئەنجامدانی خزمەتی سەربازییەوە بۆ ماوەیەکی تایبەت، دابەزی.

بەپی‌ی راپۆرتی ئەنستیتۆی نێودەوڵەتی بۆ لێکۆڵینەوە ستراتیجیەکان International Institute for Strategic Studies (IISS) لەساڵی ١٩٩٤دا، ٣٩٣٠٠٠ کەس لەهێزی زەمینی (٣٤٥٠٠٠ کەسیان وەك سەرباز)، ٥٧٠٠٠ کەس لەهێزی ئاسمانی (٢٩٠٠٠ سەرباز)، و ٥٤٠٠٠کەس لەهێزی دەریایی (٣٧٠٠٠سەرباز)بون. ئەمە جگە لەهێزەکانی جەندرمە گاردی میللی کەژمارەیان (٧٠٠٠٠)کەس دەبێ.

رێژەی کەسانی بەسەرباز راگیراو بۆ هەموو توخمە سەربازییەکانی هێزە چەکدارەکانی تورکیا دەگاتە ٨٢٪، ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەڵگەی بەشداریی نزمی هێزە رەسمی‌یەکانە لەسوپادا. لەخشتەی ژمارە (٣)دا، هەندێ زانیاری لەبارەی هێزە چەکدارەکانی تورکیاوە خراونەتە رو.

لەساڵی ١٩٩٤دا، ئامرازە جەنگی‌یە سەرەکییەکانی هێزە چەکدارەکانی تورکیا، بریتی بوون لە ٤٩١٩ تانکی جەنگی، ٣٣٦٠ زرێپۆش‌و

ئۆتۆمبێل، ٢٣٩٧ سستمی تۆپخانە، ٢١ یەکەی کەشتیی بچوکی خێرای جەنگی‌و کەشتیی دسترۆیەر (مدمرە)، ١٥ ژێراو (غواصە)و ٥٥٥ یەکەی فڕۆکەی جەنگی، (IISS 1994). هەرچۆنێ بێ، هێزە چەکدارەکانی تورکیا بڕی پێویست لەئامرازی جۆراوجۆری جەنگیی باوی بۆ دابین کراوە. شایانی باسە کەتورکیا هەمیشە لەڕیزی ئەو وڵاتانە دانراوە کەژمارەی توخمە سەربازییەکانیان زۆرەو لەئایندەیەکی نزیکدا چاوەڕوانی ئەوەی لێ ناکرێ هیچ جۆرە کەم کردنەوەیەکی هێزە چەکدارەکان ئەنجام بدات.

## پیشەسازییە سەربازییەکانی تورکیاو مۆدێرنیزەکردنیان

لەم بەشەدا باس لەپیشەسازیی بەرگریی تورکیا دەکەین بەدرێژاییی سەردەمی کۆماری. لەم خولەدا، بەپشتیوانیی حکومەت بەرهەمهێنانی ناوخۆیی چەندین جۆر ئامرازی جەنگی‌و کەلوپەلی سەربازی، دەستی پێکرد. هەروەها پێشکەوتنی بەرچاو لەبواری زانستی ئاسمانەوانیدا هاتە دی[1]. بەڵام بەهۆی رودانی جەنگی دوەمی جیهان‌و پەیوەندی کردنی ئەنقەرە بەناتۆوە لەساڵی ١٩٥٢و بەدرێژاییی جەنگی کۆریا، تورکیا تا دەهات زیاتر کۆمەکی سەربازی ئەمریکاییی وەردەگرت.

سەرباری ئەو واقعیەتەی کەبەڕێوەبەرێتیی گشتیی کارخانە سەربازییەکان لەساڵی ١٩٥٠دا گواسترایەوە بۆ بەڕێوەبەرێتیی گشتی پیشەسازیی میکانیکی‌و کیمیایی کەچی هیچ جۆرە پێشکەوتنێك لەبواری پیشەسازیی سەربازیی تورکیا لەنێوان ساڵەکانی ١٩٥٠و ١٩٦٠دا نەبینرا[2]. پاش ساڵی ١٩٦٠ پەیڕەوکردنی سیاسەتی نەهێشتنی هاوردن. پیشەسازیی سەربازییی تورکیای خستە ژێر کاریگەریی خۆیەوە، بەڵام ئەم

---

[1]Erdem, K. “History of Turkish Defence Industry”, NATOs. Sixteen Nations, 36(2), 1991, pp. 28-33.

[2]Karasapan, D. “Turkeys Armaments Industrial”, Middle East Report, (January-February 1987), pp. 27-31.

ئامانجە دوای هێرشی تورکیا بۆ سەر قوبرس لەساڵی ١٩٧٤داو سەپاندنی ئابلۆقەی چەك فرۆشتن بەئەنقەرە لەلایەن ئەمریکاوە تاکو ساڵی ١٩٧٩، بایەخی زیاتری پەیداکرد. گرنگترین ئاکامەکانی ئابلۆقەکەی ئەمریکا ئەوەبو کەتورکیا چەند بەرنامەیەکی بۆ فراوانتر کردنی پیشەسازیی میللیی خۆی ئەنجامدا[٣]، ئامانجیی سەرەکیی بەرهەمهێنانی چەك لەتورکیا بریتی بو لەنەهێنانی تەجهیزاتە سەربازییەکان لەدەرەوەی وڵاتو سەرەنجام بەدەستهێنانی سەربەخۆیی سەربازی.

پاش دەیەی ١٩٧٠، پیشەسازیی میللی گورو تینێکی بەخۆوە بینیو ژێرخانی جۆراوجۆر بۆ پشتگیری کردنی دامەزرا (بۆ نمونە، دامەزراوی هێزی ئاسمانی، دامەزراوی هێزی زەمینیو دامەزراوی هێزی دەریایی)و کۆمەکی بنەڕەتی بۆ بەگەڕخستنی ئەم دامەزراوانە تەرخان کرا. لەساڵی ١٩٨٧دا، ئەم یەکانە لەژێر ناوی دامەزراوەکانی هێزە چەکدارەکانی تورکیادا هاتنە کایەوەو هەر بەیارمەتیی ئەم دامەزراوانە چەندین گروپی وەك ئاسەلسان Aselsan (پیشەسازیی ئەلکترۆنیکیی سەربازی)، ئاسپلسان Aspilsan (پیشەسازیی دروست کردنی پیلی سەربازی)، ئسبیر Isbir (جینەراتۆرەکانی سوپا) دامەزران، ئەگەری چالاکییە پیشەسازییەکانیان لەبەر کەمیی سەرچاوەکان، لەئاستێکی سنوورداردا مانەوە[٤].

لەکۆتاییی دەیەی ١٩٧٠دا، هەلومەرجی لەباری تورکیا، پەرەسەندنی پیشەسازیی میللی خاو کردەوەو ئەم بارودۆخە تا ئەیلولی ١٩٨٠، کاتێ حکومەتی سەربازی دەسەڵاتی گرتەدەست، درێژەی کێشا. یەکسەر دوای

---

[3] Ayres, R. "Arms Production as a from of Import Substituting Industerialisation: The Turkish Case", World Development, II(9), 1983, pp. 813-824.

[4] Erdem, K. Op. Cit. Pp. 28-33.

هاتنــه ســەر كــاری حكومــەتی ســەربازی، بەرنامەیــەكی هەمەلایەنـــەی نوێكــاریی پیشەســـازیی ســـەربازی دانـــرا لەوانـــه بەرنامەیـــەك بـــۆ بەرهەمهێنانی فڕۆكەی دروستكراوی خودی توركیا.

لەدەیەی ١٩٨٠دا بەدامــەزراندنی ســندوقی پشــتگیری لەپیشەســازیی ســـەربازی (DISF)، كــە كۆمــەكی دارایــیی بــەردەوامو پایـــەداری بـــۆ بەرهەمهێنانی چەكو تفاقی جەنگی دەستەبەر دەكرد، پێشكەوتنی گرنـــگ لەم بوارەدا هاتەدی.

داهاتەكانی ئەم سندوقە، بەشـێوەیەكی سـەرەكی لـەرێی دانـانی بـاج لەسەر بابەتەكانی خواردنەوە، جگـــەرە، داهــاتی ســودی (مودعــین)و بــاج لەسەر كۆمپانیاكانەوە دابین دەكرا. داهاتو خەرجییەكانی سندوقی ناوبراو لەخشتەی ژمارە (٤)دا نیشاندراوە. لەم خشتەیەدا تێبینی دەكــرێ بــەهۆی ئەوەی لەساڵەكانی ١٩٨٨و ١٩٨٩دا ٣٠٪ و لەساڵەكانی ١٩٩٠و ١٩٩١دا یەك لەدوای یەك ٥٠٪ و ٣٠٪ ی دەرامەتەكانی سندوقەكە بەڕەزامــەندیی سەرەكو وەزیران گواستراوەتەوە بۆ سەر بودجــەی گشــتی، دەبینــین لــەنێوان دەرامەتەكانو خەرجییەكاندا جیاوازییەكی بەرچاو هەیە.

لەگەڵ ئەوانەشدا، لەساڵی ١٩٨٥دا، نــاوەندی پــەرەپێدانو رێكخــراوی پیشەسازیی سەربازی (DIDA) دامەزرا. ئەم ناوەندە جارێكی تر لەســاڵی ١٩٨٩داو لەژێر ناوی سكرتاریەتی لقی پیشەســازیی ســەربازیی (UDI) لــەوەزارەتی بــەرگریی میللــیدا دروســت كرایــەوە. ئــەم هەیكەلــە نــوێو سەربەخۆیە كە بەمەبەســـتی پــەرەپێدانی پیشەســازیی ســەربازی توركیــا دروست كرا، كارە نەخشە ســـازییەكەی بــەهۆی یەكــەی بــاڵای رێكخــەری پیشەسازیی ســـەربازیو كۆمیتــەی راپــەڕاندنی پیشەســازی ســەربازییەوە بەڕێوە دەبرد.

گەورەترین سەرچاوەی دابین کردنی دارایی‌ی UDI، بریتی بو لەسندوقی پشتگیری لەپیشەسازی سەربازی (DISF). ئەمانەی خوارەوە بەشێکن لەپلانەکانی UDI:

-ئۆتۆمبیلی زرێپۆشی جەنگی بۆ سواربون.

-فڕۆکەی جەنگی‌ی ئەلکترۆنیکی F-16 .

-سستمی پەیوەندیکردنی رادیۆیی HF-SSB .

-فڕۆکەی راهێنانی بنەڕەتی.

-فڕۆکەی سوك بۆ گواستنەوە.

-هەلیکۆپتەر.

-سستمی تەقاندنەوەی Multiple رۆکێت.

سەرجەمی ئەو پلانانەی سەرەوە بەشێوەیەکی سەرەکی لەڕێگای سەرمایەگوزاری‌ی هاوبەش لەگەڵ دامەزراوە ئەمریکاییەکاندا جێبەجێ دەکران[5].

دوای ساڵی ١٩٨٥، ژمارەیەکی زۆری دامەزراوەکان هاتنە ناو تۆڕی پیشەسازی‌ی سەربازییەوەو بەم جۆرە پەیوەندییەکی نوێ لەگەڵ کۆمپانیا بیانییەکاندا خولْقا. دەتوانرێ مەیلی رو لەزیادی بەرهەمهێنانی چەك‌و تفاق لەتورکیادا بەهۆی دەرکەوتنی ژمارەیەکی رو لەزیادی بەرهەمهێنەرەکانەوە هەست پێ بکرێ. لەنێوان هەر سەد گەورەترین دامەزراوی پیشەسازی‌ی تورکیادا، هەشت دامەزراو لەنێوان ٥٠٠ دامەزراوی گەورەدا، ٣٠ دامەزراوی بەهەمهێنانی چەك‌و تفاق هەن[6].

[5]Senesen, G. G. "An overview of the Arms Industry Moderinsation Programme in Turkey Appendix 106", in SIPRI Yearbook 1993, pp.521-532.

[6]Ozmucur, S. "The Economics of Defence and Peace Dividend in Tyrkey" (Bogazici university Printhouse, Istanbul, 1996).

دامەزراوەکانی کەرتی تایبەت بۆ سەرمایەگوزرای لەپیشەسازیی سەربازیدا هان دران و لەخشتەی ژمارە (٥) یشدا کۆمپانیا گەورەکانی بەرهەمهێنانی چەکو تفاق دەبینرێنو لەبەشەکانی داهاتوشدا باس لەبەشە سەرەکییەکانی ئەم پیشەسازییە دەکەین.

## پیشەسازیی هەوایی

گەشەی خێرای ئەم پیشەسازییە دوابەدوای بڕیاردان لەسەر نوێکاریی پیشەسازیی سەربازیی تورکیا لەسەرەتاکانی دەیەی ١٩٨٠دا هاتە دی.

ئامانجەکەشی بریتی بوو لەبەرهەمهێنانی فڕۆکەی جەنگیی جۆری F-16، بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیەکانی هێزی ئاسمانیی تورکیاو هەناردە. بۆ ئەم مەبەستەش کۆمپانیای ژێرەداری پیشەسازیی ئێرسپەیسی توساس (TAI) لەسەرمایەگوزارییەکی هاوبەشدا لەگەڵ جەنەرال داینامیکس، لۆك هیدی ئێستا، بەرێژەی ٤٢٪ و جەنەرال ئەلەکتریکی ئەمریکا بەرێژەی ٧٪ دامەزرا. ٤٩٪ ی بەشی توساسو ٢٪ ی بەشی ئەو کۆمپانیایە، بون بەمولکی دامەزراوی هێزە چەکدارەکانی تورکیا.

توساس وەك نمونەیەکی رێکخراو بوو لەپێناوی بەرهەمهێنانی بەردەوامی چەکو تفاقی جەنگی لەتورکیادا[٧].

TAI یەکەم قۆناغی بەرهەمهێنانی فڕۆکەی152F-16 ی بەئیمتیاز وەرگرتن بردە سەرو دەستی کردوە بەتەواوکردنی قۆناغی دوەمی بەرهەمهێنانی فڕۆکەی 80F-16 .

هەروەها لەپێشکەوتنەکانی تری ئەم بەشە، دامەزراندنی پیشەسازیی ئەندازیاریی توساس بوو کەبەمەبەستی بەرهەمهێنانی مەکینەی گڕهاوێژ بۆ فڕۆکەکانی F-16 لەمانگی شوباتی ١٩٨٥دا دامەزرا. ئەم بەرنامەیە بەسەرمایەگوزاریی هاوبەشی جەنەرال ئەلەکتریك ٤٩٪، توساس ٤٩٪ و دامەزراوی هێزە چەکدارەکانی تورکیا بەو بەشە کەمەی مابۆوە دامەزرا.

---

[7]Senesen, G. G..1993, op cit. Pp. 521-532.

تورکیا بەو هیوایەوە بوو کەپاش ئەوەی وڵاتە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا لەساڵی ١٩٩٠دا بەرهەمــهێنانی فڕۆکـەی F-16 رادەگـرێ، خـۆی ببێتـە سەرچاوەی سەرەکی بۆ ناردنە دەرەوەی ئەو فڕۆکانە[٨]. بەڵام یەکەمین پرۆسەی فرۆشتنی ئەم فڕۆکانــە بریتـی بـو لـەدوو فڕۆکـە، کـە لەسـاڵی ١٩٩٤دا فرۆشرایە میسر.

سەرباری هەوڵەکانی تورکیا بۆ فرۆشتنی فڕۆکەی جـەنگیی F-16 بـۆ هەر یەك لەلوبنان، کوێت، مالیزیاو فلیپین، بەڵام بەکردەوە تا ساڵی ١٩٩٥ هیچ ناردەیەك لەو رووەوە ئەنجام نەدراوە[٩] بـەهۆی زۆریی خـەرجیی تێچـووەوە رەنگە بەبێ پشتیوانیی حکومەت، ناردەش ئەنجام نەدرێ.

لەم ساڵانەی دواییدا، چـەند رێکـەوتنێك بـۆ بەرهەمـهێنانی فڕۆکـەی سـوکی گواسـتنەوەو راهێنــــان بەتـــەرتیب بـــەهاوکاری کۆمپانیاکـــانی کاسا(CASA)ی ئسپانیاو ئاگوستا (Agusta) ی ئیتالیا ئیمزاکران[١٠].

**پیشەسازیی کەشتی سازی**

ئەم پیشەسازییە لەتورکیا نوێ نییەو دوو کۆمەڵگای (Yard) گەورەی دەریایی بەناوی تاسکی زاك Taskizak و گولـوك Goluck لـەم وڵاتـەدا هەن. تاسکی زاك لەساڵی ١٤٥٥ـەوە دامەزراوەو یەکەمین غەواسەی خۆی، بۆ هێزی دەریایی دەوڵەتی عوسمانی، لەساڵی ١٨٨٦دا دروست کـرد. بـەڵام پاش جەنگی یەکەمی جیهان، لەکار کەوت و لەساڵی ١٩٤١دا جارێکی تـر وەك کۆمەڵگایەکی دەریایی، چالاکییەکانی خۆی دەست پێ کردەوە، حـاڵی حازر لەم کۆمەڵگایەدا ٤٠٠٠ کەس کاردەکەن و کەشتی کـەنار Landing

[8]Candemir, H.B."Military Expenditures and Economic Performance: A survey of literature and The Case of Turkey", METU Studies and Development, 22(4), 1995, pp. 357-396

[9]Senesen, G.G. "Some Economic Asepcts of Turkish Armaments Spending", Mew Prespective on Turkey, 13. 1995. pp. 75-91.

[10]Senesen, G.G. 1993, op cit pp. 521-532.

ships، بەلەمی گەڕۆکو کەشتیی بارهەڵگر تا ۱۰۰۰۰تەنی تێدا دروست دەکرێ.

هەرچی کۆمەڵگەی گولوکە، لەساڵی ۱۹۲٤دا دامەزراوەو تێیدا کەشتی تاکو ۳۰۰۰۰تەنی، لەوانە کەشتی بارهەڵگرو غەواسە دروست دەکرێو ٦۰۰۰کەس کاری تێدا دەکەن[11].

هەردو کۆمەڵگاکە سەر بەهێزی دەریاییی تورکیانو بەر لەهاوکاریی کارخانەکانی کەشتی سازی ئەڵمانیا، هێزی دەریاییی تورکیا کەشتییە کۆنەکانی ئەمریکای دەکڕی. بەڵام پاش دەیەی ۱۹۷۰ کەشتییە جەنگییەکانی تورکیا بەتەسمیمی ئەڵمانیاییو بەزۆری لەجۆری Lurssen werft, HDW, Blohm & Voss و لەلایەن کۆمەڵگا دەریاییەکانی تاسکی زاکو گولوکەوەو بەکۆمەگی هونەری کۆمپانیاکانی کەشتی سازی دایک، لەئەڵمانیا دروست دەکرێن[12].

## پیشەسازیی ئەلەکترۆنیک

لەم سەردەمەی هونەرەوەری زانیاریو پیشەسازیی ئەلەکترۆنیکدا، کۆمپانیای پیشەسازیی ئەلەکترۆنیکی سەربازیی ئاسەلسان لەساڵی ۱۹۷٥دا دامەزرا. زۆربەی بەشەکانی کۆمپانیاکە موڵکی دامەزراوی هێزە چەکدارەکان بون. لەم کۆمپانیایەدا نزیکەی ۳۰۰ کەس کاریان دەکردو کەلوپەلی پەیوەندی کردنی تاکتیکی، کەلوپەلی encryption، ئامرازی پەیام گەیاندنی Scrambler و دیجیتال (ژمارەیی) یان بەرهەم دەهێنا، کە بەئیمتیازی کۆمپانیاکانی فلێپسی هۆڵەندایی، لیتۆنی ئەمریکایی (Litton) و تێلداین Teledyne دروست دەکران.

هەروەها ئەم کۆمپانیایە هەندێ کەلوپەلی ئەلەکترۆنیکیی فڕۆکەی جۆری F-16 ی بەرهەم دەهێنا. لەنێوان ۱۰۰ دامەزراوی گەورەی تورکیادا،

---

[11] Karasapan, O.Op. cit pp. 27-31.

[12] Senesen, G.G. 1993, pp. 521-532.

ئاسەلسان پلەی حەفتاو حەوتی داگیر کردوە. دو دامەزراوی تری گرنگی ئەم بوارە بریتین لەتێلتاس Teletas لەبواری پەیوەندیکردندا. پیشەسازیی ئەلەکترۆنیکیی تورکیا، تیستاس Testas. دامەزراوی حکومەتیی تێلتاس تایبەتە بە بەرهەمهێنانی بەروبومی پەیوەندیکردنو گەیاندن. هەرچی تیستاسە Testas لەسالّی ١٩٧٦ دا، بەمەبەستی بەرهەمهێنانی کەلوپەلی ئەلەکترۆنیکیو کەلوپەلی پەیوندیدار بەو بوارە دامەزرا. ئەم کۆمپانیایە لەلایەن ژمارەیەك دامەزراوی ژاپۆنی، فەرەنسایيو ئیتالیاییەوە ئیمتیازی پێ بەخشراوە[١٣].

## پیشەسازیی دروست کردنی چەك، تەقەمەنی، تفاقو ئامرازی جەنگی

دروست کردنی چەك، تەقەمەنی، تفاقو ئامرازی جەنگی، بەشێوەیەکی سەرەکی لەلایەن کۆمپانیاکانی پیشەسازیی میکانیکیو کیمیاییی (MKEK)ـەوە، کە لەسالّی ١٩٥٠دا دامەزراوە، ئەنجام دەدرێن. ئەم دامەزراوە موڵکی حکومەتەو حالّی حازر MKEK خاوەن نزیکەی ٢٠ کارخانەو ٢٠٠٠٠ کرێکارەو بەروبومی جۆراوجۆری وەك چەکی بچوك، تفاق، چەکی پێویست بۆ هێزی ئاسمانی، موشەکی هەوا بەزەمین، کەئیمتیازی ئەمریکایی پێ دراوە، تۆپی جۆری (١٠٥ملم)ی تانك، کەئیمتیازی کارخانەکانی تفاقی جەنگی دروست کردنی شاهانەی بەریتانیای پێ دراوە، چەکی ئۆتۆماتیکیی ٢٠ ملمو چەکی ٣٥ ملم، کەئیمتیازی ئورلیکۆن (Oerlikon)ی سویسراییی پێ دراوە، بەرهەم دەهێنێ.

هەروەها MKEK کارخانەیەکی تایبەتی دروست کردنی ماسکی دژ بەچەکی کیمیاییشی هەیەو کاری نوێسازیی تێدا ئەنجام داوە. لەسالّی ١٩٩٠دا MKEK دەستی کرد بەردوست کردنی سستمی موشەکێکی نوێ

---

[13] Karasapan, O.Op. cit .pp. 27-31.

لەژێر ناوی MLRS، یان سستمی تەقاندنی چەند جارەی موشەك، کەنەخشە سازییەکەی لەلایەن ئەمریکاوە ئامادەکرابو.

ژمارەیەك لەچەکە بەرهەمهێنراوەکانی MKEK، بەزۆری رەوانەی وڵاتانی هاوپەیمانی ناتۆ دەکرێن [١٤].

ئەگەرچی کاربەدەستانی تورك، بەڵێنیان داوە کەنوێکاری لەکارگە کۆنە حکومییەکاندا ئەنجام بدەن، بەڵام پێشکەوتنێکی کەم لەم بوارەدا روی داوە [١٥].

تورکیا لەهەوڵی ئەوە دایە ئوتومبیلە سەربازییەکانو تانکەکانی خۆی باشتر بکاتو پێشیانخات. لەپێناوی بەرهەم هێنانی ئۆتۆمبیلی تاکتیکی، کۆمپانیای کوكKOC ، کەگەورەترین کۆمپانیای تورکیایە، کارخانەیەکی بەناوی ئۆتۆکار OTOKAR بەئیمتیازی لاندرۆڤەری ئینگلیزی دامەزراندو کۆمپانیای مان MAN، بەهاوڕێیەتی Erean Holding، کارخانەیەکی دروست کرد تا ئۆتۆمبیلی قورس بۆ سوپا بەرهەم بهێنێ.

هەروەها لەسەرمایەگوزارییەکی هاوبەشدا، کۆمپانیای تورك میرسیدس Turk Mercedes کەوتە دروست کردنی جۆرەها ئۆتۆمبیلی سەربازی [١٦].

دامەزراوی FMCNVORL، ئۆتۆمبیلی زرێپۆشی جەنگیی سوارە بەرهەم دەهێنێ. ئاستی کارکردن لەم بەشەدا رون نییە، چونکە زۆر دامەزراوی سەربازی، هاوکات کەلوپەلی مەدەنیش بەرهەم دەهێنن، بەلام، یەکێتیی بازرگانی لەبەشی سەربازیدا (Harb-15) کە ٤١٥٠٠ ئەندامی هەیە، دەڵێ ئەم ٤١٥٠٠ کەسە بەشێوەیەکی راستەوخۆ لەم بەشەدا کارناکەن. خشتەی ژمارە (٦) گەورەترین دامەزراوە سەربازییەکانو ژمارەی کرێکارەکانیان نیشان دەدا. لەگەڵ ئەوەی خشتەکە، بەهۆی نەبونی

---

[14] Karasapan, O. Op. Cit. Pp. 27-31

[15] Senesen, G.G. 1993, pp. 521-532.

[16] Karasapan, O.Op. cit. Pp. 27-31.

داتاکانەوە، تەواو نەکراون، بەڵام وێنەیەك لەکارکردنی بەشەکە دەدات بەدەستەوە.

سەرەڕای ئەوەی پیشەسازیی سەربازیی تورکیا لەدەیەی رابردوودا، بەخێرایی گەشەی کردوە، بەڵام هێشتا تورکیا زۆربەی کەلوپەلە سەربازییە پێویستەکانی خۆی لەدەرەوە دابین دەکاو ناردەکانی لەئاستێکی زۆر نزمدایە. بەم پێیە، خەرجیی هاوردەی چەكو تفاقی جەنگی بۆتە بارێکی سەرشانی ئابووریی تورکیاو سێیەکی بودجەی سەربازیی تورکیا، تایبەتە بەهاوردەی چەك[17].

## کۆبەند

ئەگەرچی تاکو دەیەی ١٩٨٠ پێشکەوتنێکی گرنگ لەپیشەسازیی سەربازیی تورکیادا روی نەدا، بەڵام لەو بەرەوارە بەدواوە پەرەسەندنێکی بەرچاو لەو بوارەدا هاتە دی.

لێکۆڵینەوەی زۆر هەن کەهەندێکیان لەقازانجو هەندێکی تریان لەدژی پیشەسازیی سەربازیو نوێکارییەکانیەتی. ئایرس[18]، جەخت لەسەر ئەوە دەکا کەتەقەلای تورکیا بۆ بەرهەمهێنانی چەك، هێندە لەگەڵ سیاسەتی جێگرتنەوەی هاوردەدا جیاوازی نییەو هەندێ کەموکوڕیشی لەگەڵدایە. هەروەها دەڵێ کەبەرهەمهێنانی چەك لەتورکیا زۆر پڕ خەرجترە لەهێنانی سیستم گەلی تەواوی چەكو بەکردەوەش توانایی هەناردەی چەك زۆر سنوردارە. هەر بۆیە پێشبینی دەکرێ کەوابەستەیی سەربازی لەڕێگای بەرهەمهێنان بەئیمتیازەوە، هەروا بمێنێتەوە[19]. سەبارەت بەئاسەواری

[17] US Arms Control and Disarmament Agency, World Military Expenditures and Arms Transfers 1991-1992, (Washington D. C. US Government Printing Officer, 1994).

[18] Ayres, R. Op. Cit, pp. 813-824.

[19] Ibid.

رەسمی زێدەی (Spillover) چاوەڕوانكراو لەپیشەسازی سەربازی، بەپێی ئــەوەی كەگوایــە یارمــەتیدەرە بــۆ گوێزانــەوەی هونـــەروەری، كۆنـــترۆڵی چۆنایەتی‌و هـــێزی مرۆیـــی‌و بـــەڕێوەبردنی هونـــەری‌و خـــێرایی دەبەخشـــێتە گەشەی ئابوری‌ی توركیاو قەوارەی بەكردەوە نوێ بۆ كـــاركردن دەرەخســـێنێ، لەموبالەغە زیاتر هیچی تر نەبوە[20].

بارتزوكاس[21] دەڵێ بەرنامەی نوێكاری توركیـــا لەپیشەســـازی هـــەوا-فەزادا تەنها تـــا ئەندازەیـــەك ســـەركەوتو بـــوەو چـــەند هونەروەرییـــەك لـــەم ڕێگایەوە گوێزراوەتەوە.

بەشداریی بەرنامەكراوی دامەزراوە ناوخۆكان هەبوەو واتێبینـــی دەكـــرێ كە لەپیشەسازی سەربازی‌ی توركیادا، ئاستی چالاكییە ئـــەنجامدراوەكان‌و پەرەسەندنی (R&D) زۆر كەم بوبێت‌و نوێكاریش تیایدا سنوردار بوبێ.

سەرەڕای تێبینی كردنـــی هـــەندێ خراپـــی لەچۆنایـــەتی‌ی پیشەســـازی‌ی ســـەربازی توركیـــادا، بـــەڵام ئـــەم كەرتـــە بەیـــەكێ لەبەشـــە گرنگـــەكانی پیشەســـازی‌و بەرهەمـــهێنانی وڵات دادەنـــرێ. هـــەروەها ســـەرباری ئـــەو چاوەڕوانییەی كە لەزیادبونی هەناردەی ئامرازو تفاقی جەنگی دەكرا، تـــاكو ئێستا هیچ بەڵگەیەك بۆ پشتیوانی لەو چاوەڕوانییە نـــابینرێ‌و هێشـــتا زوە لەم یەكەمین هەنگاوانەی پیشەسازی ســـەربازی‌ی، چـــاوەڕوانی قەوارەیـــەكی گەورەی ناردە بین.

لەگەڵ نێونجـــی گەشـــەی بـــاڵاو بـــەرچاودا، خـــەرجی‌ی ســـەربازی‌ی بـــاڵاو كـــەرتێكی ســـەربازی‌ی لـــەباری پەرەســـەندندا، دەبینـــین پـــەیوەندی‌ی نێـــوان خەرجی‌یـــە ســـەربازییەكان‌و گەشـــەی ئـــابوری زیـــاتر بۆتـــە مەســـەلەیەكی

---

[20]Erdem, K. Op. Cit, pp. 28-33.

[21]Bartzokas, A. "The Developing Arms Industries in Greece, Portugal, Turkey" in Restructuring of Arms Production in western Europe, Brzoska, M. and look, p.. Eds, (Oxford University Press, Oxford, 1992).

پراکتیکی تا مەسەلەیەکی تیۆری. هەر بۆیە لـێرەدا تیـۆری نـاتوانیٚ وەڵام بداتەوە[٢٢]. پرســیار ئەوەیـە، ئایـا خەرجیـیـە ســەربازییەکان کاریگـەریی سەلبی یان ئیجابی لەسەر گەشـەی ئـابوری دادەنێـن؟ یـان بەشـێوەیەکی سنوردارتر بڵێین، چـۆن چۆنـی، بـڕی خەرجیـیـە ســەربازییەکان، گەشـەی ئابوریی دەخاتە ژێـر کاریگـەریی خۆیـەوەو ئایـا ئاکامـە دەرەکییـەکانی Externalities بەشی ســەربازی بـۆ بەشـەکانی تـری ئـابوریی تورکیـا، ئیجـابی دەبـن یـان ســەلبی؟ ئـەم پرســیارانە لەبەشـەکانی دواتــردا لێکدەدرێنەوە.

## هەڵسەنگاندنی پەیوەندیی نێوان بەرگری و گەشە

لەم لێکۆڵینەوەیەدا یـەك لایەنـە باسـکراوە کـەجۆری فیدیـر Feder Type شیکردنەوەی پەیوەندیی نێوان خەرجی‌یە ســەربازییەکانو گەشـەی ئابوری بەکاردەبرێ. لەڕوی پراکتیکەوە، پەیوەندیی بەرگری-گەشە، بەسـود وەرگرتن لەمۆدێلەکانی تەلەبو لایەنی عەرز Demand and Supply-Side Models شی دەکرێنەوە. فیدیر[٢٣] لەساڵی ١٩٨٣دا پێشـکەوتنێکی یەکجار سەیری لەیەکیٚ لەمۆدێلەکانی لایەنی عەرزدا بەدی کرد، سەرەڕای ئەوەی فیدیر سودی لەم مۆدێلە بۆ لێکدانەوەی پـەیوەندیی نێـوان بەشـی ناردەو بەشـەکانی غـەیرە هـەناردە وەرگـرت، کـەچی بیـواسو رام[٢٤]، ئـەو نمونەیەیان بۆ شیکردنەوەی پەیوەندیی نێوان بەرگری-گەشە، بەکارهێنا.

---

[22] Alexander, W. Robert J. "The Impact of Defence Spending on Economic Growth: A Multi Seotosal Approach to Defence Spending and Economic Growth with Evidence from Developed Economics", Defence Economics, 2(1), 1990, pp. 39-55.

[23] Feder, G. "On Export and Economic Growth", Journal of Economic Development, 12 (1/2), 1963, pp. 59-73.

[24] Biswas, B. and Ram, R. "Military Spending and Economic Growth in Less Developed Countries: An Augmented Model Futher Evidence", Economic Development and Cultural change, 34(2), 1986, pp. 361-372.

لەزۆر لێکۆڵینەوەی دیکە، جۆری جیاوازتر لەجۆری فیدیر بەکاربرا. لەم مۆدێلەشدا، ئاکامە دەرەکییەکانی نێوان بەشەکانی لەبەرچاو دەگیران کەدەیانتوانی هەم کاریگەریی قەوارەی Size Effect خەرجییە سەربازییەکان و هەم ئاسەوارەکانی ئاکامە ناوخۆییەکان و جیاوازیی سودبەخشی فاکتەرەکان Factor Productivity bifferen tials لێك بدەنەوە. لەهەمان کاتدا، ئەم مۆدێلە لەچاو خۆیدا پێویستی بەداتای Data کەمتر هەیە، کە بەگشتی لەزۆربەی وڵاتە تازە پەرەسەندوەکاندا گرفتێکی گەورە پێك دەهێنن. لەخەسڵەتە باشەکانی تری ئەم مۆدێلە، باسکردنی لێکدانەوەی مەحدودییەتەکانی عەرزە، کەبۆ وڵاتانی تازە پێگەیشتو، لەوانە تورکیا، گرنگە.

لەزۆربەی هەرە زۆری لێکۆڵینەوەکانی بواری پەیوەندیی نێوان خەرجییە سەربازییەکان و گەشە، رەوشی لێکدانەوەی بڕگەیی Cross-Methodologie sectional Type بەسود وەرگرتن لەمۆدێلی فیدیر بەکارهێنراوە. ئەگەرچی لێکدانەوەی بڕگەیی، بۆ لێکدانەوەی بەراوردییەکان باشە، بەڵام توانای دەرخستنی توخمە گرنگەکانی پەیوەندیی زیندوی نێوان بەرگریی و گەشەی نییە[25]. لەم ئەدەبیاتەدا، لێکدانەوەکان لەئاستی وڵاتدا نین و بۆ بەدەستهێنانی بەڵگەی پتەو لەهاوشانی بەرگریی و گەشە، ئەوا دەبێ بەلێکۆڵینەوەی نێودەوڵەتی، ئەو لێکۆڵینەوانەی لەبارەی تاك تاکی وڵاتانەوە دەکرێ، پشتیوانی لێکرێ[26] لەبەر زۆر هۆی جیاجیا، لێکۆڵینەوە نێودەوڵەتییەکان، بەڵگەی سنوردار دەربارەی پەیوەندیی بەرگریی و گەشە دەدەن بەدەستەوە: یەکەم، وڵاتان لەیەك جیاوازن. دوەم،

[25]Ward et al. "Military Spendng in India: Country Survey 1", Defence Economics, 3(1), 1991, 99, 41-63.

[26]RAM, R. "Defence Ependiture and Growth", Handbook of Defence Economics, Hartley, K. and Sandle, T., eds., (Elsever Science, B.V. Amsterdam, ch. 10. 1995.

بەلەبەرچاو گرتنی بارودۆخی زۆر جیاوازی ولاّتان، هەلّبژاردنی مۆدێلێکیان وردبینیی گەرەکەو لەکاتێکدا ژمارەیەك لەولاّتانی بەنمونە هێنراودا رەنگە لەدۆخی سستیدا بن، ئەوا ژمارەیەکی تریان لەدۆخی گەشەدا دەبێ[٢٧].

دۆزینەوەی چەند ولاّتێك کەهاوکات، خاوەن هەلومەرجی یەکسانی ئابوری بن، کارێکی زەحمەتە، سێهەم، کاریگەرییەکانی ئاکامە دەرەکییەکانی خەرجیی سەربازی لەولاّتێکەوە بۆ ولاّتێکی تر دەگۆرێ. ئەم کاریگەریانەش دەتوانرێ پاش دەورەیەکی دواکەوتن Leg تێبینی بکرێ[٢٨].

چوارەم، داتا Data برگەییەکانو مۆدێلی فیدیر وا دادەنێن کە: مرونەتی هێزی کار Labour Elasticity، بەروبومی کۆتاییی سەرمایە لەبەشی غەیرە سەربازییدا، کاریگەریی دەرەکیی بەشی سەربازی لەسەر بەشەکانی تری ئابوریو جیاوازیی رێژەییی سودبەخشیی فاکتەرەکان لەبەشی سەربازی-غەیرە سەربازیدا، لەنێوان ولاّتە بەنمونە هێنراوەکاندا یەکسانە[٢٩].

ئەمەش گریمانێکی بەهێزە، چونکە دەشێ ئەم فاکتەرە دیاریکەرانە Parameters لەولاّتێکەوە بۆ یەکێکی تر بگۆرێن. تەنانەت ئەگەر ولاّتە بەنمونە هەلّبژێردراوەکان، لەهەمان قۆناغی پەرەسەندنیشدا بن، رەنگە سودبەخشیی هێزی کار جیاواز بێو لەهەمان کاتدا لەتێکرایی گەرانەوەی سەرمایەدا هاوشێوە بن[٣٠].

---

[27]Ibid.

[28]Deger, S. and Sen, S. "Military Expenditure and Third World Countries", Handbook of defence Economics, Hartely, K. and sandler, T. eds., (Elsevier Science, b. V. Amsterdam, ch. 11. 1995.

[29]RAM, R. Op. Cit.

[30]Ibid

لەبەر ئەوەی لێکۆڵینەوەکان لەبارەی وڵاتانەوە، بەشێوەی تاك لەئارادا نین و کەم و کورییەکان لەشیکردنەوەی برگەییدا دەردەکەون، شیکردنەوەی عەجزی زەمەنی بۆ یەك وڵات، شتێکی بەسود دەبێ.

لەئەدەبیاتی بەرگری-گەشەدا، لێکۆڵینەوەی پراکتیکیی کەم لەبارەی تاکی وڵاتانەوە، بەسود وەرگرتن لەنمونەی ئاکامە دەرەکییەکانی فیدیر، کراوە. لێکۆڵینەوەی وڵاتانی تورکیاش، چەندین بەڵگەی پەیوەندیی نێوان بەرگری و گەشە دەستەبەر دەکات. چونکە ئەم لێکۆڵینەوەیە لەبەر دو هۆ لەگەڵ لێکۆڵینەوەکانی تردا جیاوازە: یەکەم، پەیوەندیی بەرگری-گەشەی تورکیا، بەسود وەرگرتن لەنمونەیەکی جۆری فیدیر ئەنجام دراوە. هەروەها لەم لێکۆڵینەوەیەدا سود لەتازەترین داتاو زۆرترین جێ متمانەکان وەرگیراوە.

بەپێچەوانەی رابردوەوە، لەم لێکۆڵینەوەیەدا لەبری سود وەرگرتن لەدانیشتوان، فاکتەری گۆڕاوی هێزی کار وەك ئاماژەیەك بەکارهێنراوە. دوەم، ئەم لێکۆڵینەوەیە یارمەتیی قەرەبوکردنەوەی کێماسیی نەبونی لێکۆڵینەوەکانی دەوڵەتی، لەبوارەکانی بەرگری و گەشە، دەکاو زۆر گرنگە ئەنجامی بەهێز لەم بوارە جەنجاڵەدا بدات بەدەستەوە.

### مۆدێلی ئاکامە دەرەکییەکان

فیدیر لەساڵی ١٩٨٣دا، مۆدێلێکی بۆ زانینی کاریگەریی بەشی هەنارده لەسەر گەشەی ئابوری، خستەڕو. مۆدێلەکەی فیدیر، کەرتی ئابوریی دەکرد بەدو بەشەوە: بەشێکی پێشکەوتوی هەنارده (X)و بەشەکەی تر بەئاڕاستەگیریی ناوخۆیی (بەشی غەیرە هەنارده).

ئـەنجامی دەرەکـیی نیجـابی لەبەشـە پێشـکەوتوەکەوە، بەئاڕاسـتەی بەشەکانی تری ئابوری هەیە. رام[31] و بیـواس‌و رام[32]، ئـەم مۆدێلـەیان بـۆ زانینی خەرجی‌یە سـەربازییەکان، لەلێکۆڵینەوەیـەکی برگـەییدا کـە ٥٨ وڵاتی کـەم پەرەسـەندوی دەگرتـەوەو بـەدرێژایی‌ی سـاڵانی ١٩٦٠-١٩٧٧، بەکارهێنا. لەمەودواش، لێکۆڵەرەوەی تـر هـاتن‌و سـودیان لەمۆدێلەکـەی فیدیر وەرگرت بۆ لێکۆڵینەوە لەبارەی هاوشانی بەرگری‌و گەشە[33]. مۆدێلی بەکارهێنراوی مۆێلەکە لەلایەن رۆردو هاوکارانیە رێکخرابو.

سەرەتا وا دادەنرێ ئابوری لـەدو بـەش پێکـهاتوە، واتـە بەشـی غـەیرە سەربازی (C) و بەشی سەربازی (M):

1-M=(Km,Lm)

2-C=C(Kc, Lc, M)

K= یەکەی سەرمایە

L= هێزی کار

خاڵی بنەڕەتی لەم مۆدێلەدا ئەوەیـە کەئاکامـە دەرەکییـەکانی بەشـی "M" بۆ بەشی "C" لەبەرچاو دەگیرێن‌و جیاوازییە سودبەخشەکان دەبنـە فاکتەر.

خـاڵی لاوازی بنـەڕەتی‌ی مۆدێلـی فیدیـر لـەوە دایـە کەپرۆسـەی بەرهەمهێنان تەنها سەرمایەی فیزیایی‌و کاریش دەگرێتـەوە. ئـەم مۆدێلـە بەشـێوەیەکی شـاراوە وا دادەنـێ کەسـەرمایەی مرۆیـی هـەبونی نییـە.

---

[31]RAM, R. "Government Size and Economic Growth: A New Framework and Some Evidence From Cross-Section and Time-Series Data", American Economic Review, 76(1), 1986, pp. 191-203.

[32]Biswas, B. and Ram, r. Op. Cit.

٣٣ لێکۆڵینەوەیەکی تەواو لەئەدەبیاتی ئەزمونی ئەم بابەتـە لـە (١٩٥٥) Ram (1955), Sandler Hartiley کراوە.

سەرمایەی فیزیایی لەبەرهەمهێناندا گرنگــە بــەڵام، ســەرمایەی مرۆیــی، ژیانییە.

سەرمایەی مرۆیی، توانایی‌و لێهاتوییە خودییەکان‌و راهێنـــان‌و بــەهرە وەرگیراوەکان دەگرێتەوە. سەرمایەی مرۆیی، لەرێگای راهێنانە رەسمییــەکان، فێربون‌و پراکتیکەکانی کارەوە دروست دەبن. هەر بۆیە لەبــەرچاو نــەگرتنی سەرمایەی مرۆیــی، لەوانەیــە ئەنجامگیرییــەکی هەڵــە بــدا بەدەســتەوە[٣٤]. گــەنجاندنی ســەرمایەی مرۆیــی لەگــەڵ مۆدێلەکــەی فیدیــردا پرۆســـــەی بەرهەمهێنان لەهەر بەشێك بەم شێوەی خوارەوە لێ دەکا:

Y=F(K, L, H)

3-M=M(Km, Lm, Hm)

4-C=C(Kc, Lc, Hc, M)

واتە H= هێمای سەرمایەی مرۆیی

ئەو هاوکێشە ئابورییە بەراوردکارییانـــەی بــۆ مۆدێلــەکان ســودیان لێ وەرگیراوە بریتین لە: (ئەلف) مۆدێلی دو بەشیی فیدیر:

لــەم هاوکێشــانەدا، ٨ نیشــاندەری جیـــاوازیی ســـودوەری فاکتــــەری بەشــەکانە. Cm، کاریگــەریی بەشــی ســەربازییە لەســەر بەشــە غــەیرە سەربازییەکان‌و O هێمای ئاکامە دەرەکییەکانی بەشی سەربازیییە لەســەر بەشــەکانی تــری ئــابوری وڵات، (8/(1+8)+Cm)، کاریگــەریی گشــتیی خەرجییــە ســەربازییەکان نیشـــان دەداو (O -(8/(1+8))، نیشــاندەری کاریگەریی بڕی خەرجە سەربازییەکانە.

ئەو فاکتــەرە گۆڕاوانــەی (Variety) کــەبۆ بــەراوردکردن ســودیان لێ بینراوە، بەم شێوەیەی خوارەوە دەپێورێن:

---

[34] Mankiw, G.N, Romer, d. and weil, D.N, "A Contribution to the Empirics of Economics of Economic Growth", Quarterly Journal of Economics, 1992, pp. 407-437.

ئەلف) Δ Y/Y1: نێونجی گەشەی بەروبوم وەك گۆڕاوێکی وابەستە. بۆ ژماردنی، جیاوازیی نێوان بەهای ئێستا (جاری)و رابردوی بەرهەمی ناپوختەی میللیی واقیعی (GNP)، دابەش کراوەتە سەر (GNP)ی واقیعی ساڵی رابردوو.

ب) Δ L/L-1: نێونجی گەشەی هێزی کار، لەم گۆڕاوەشدا، سود لەئاماری هێزی کاری چالاکیی تورکیا وەرگیراوەو نێونجی گەشەی لەبەرچاو گیراوە.

ج) I/Y-1 : رێژەی سەرمایەگوزاری بۆ / GNP یە کەسەرمایەی نەگۆڕی ناپوختەی واقیعی تورکیاو GDPی واقیعی ساڵی رابردو دەگرێتەوە.

د) Δ H/Y-1: خەرجییەکانی پەروەردەی واقیعی، دابەش کراوەتە سەر GNPی واقیعی ساڵی رابردودا.

حساب کردنی سەرمایەی مرۆیی، کارێکی قورسە، هەر بۆیە، وەك نوێنەر، سود لەخەرجییە پەروەردەییەکانی بودجەی گشتی بینرا.

هـ) Δ M/Y-1 : جیاوازیی نێوان خەرجییە سەربازییە واقیعییەکانی ئەمساڵو ساڵی رابردو، دابەش کراو بەسەر GNP واقیعیی ساڵی رابردو.

و) Δ M/M-1: تێکڕای گەشەی خەرجییە سەربازییەکان.

هاوکێشەکانی (٥)و (٦) زۆر هاوشێوەی ئەو هاوکێشانەن کە لەلێکۆڵینەوەکانی رابردوودا سودیان لێ بینراوە. بەڵام ئەو هاوکێشانە پێشتر لەبارەی وڵاتی تورکیاوە بەکار نەهێنراون. هاوکێشەکانی (٧)و (٨)، لەو روەوە کەسەرمایەی مرۆیی دێننە ناو مۆدێلەکەوە، جیاوازییان لەگەڵ لێکۆڵینەوەکانی رابردودا هەیە.

لەهاوکێشەکانی (٧)و (٨)دا، Δ H/Y-1 هێمای کاریگەریی سەرمایەی مرۆیی لەسەر گەشەی ئابورییەو چاوەڕوان دەکرێ بەشێوەی مەعنەوی (Sensitive) ئیجابی بێت.

سەرەڕای ئەوە، تورکیا یەکێکە لەوڵاتە تازە پەرەسەندوەکانو خاوەن نێونجێکی گەشەو خەرجێکی سەربازیی بەرێژە بەرزە. لەسەر ئەم بناغەیە، هەروا چاوەڕوان دەکرێ کەخەرجیی‌یە سەربازییەکان، خاوەن پەیوەندییەکی ئیجابی بن لەگەڵ گەشەی ئابوری تورکیادا.

بیانوی بەکاربردنی مۆدێلی فیدیر لەم لێکۆڵینەوەیەدا، ئەوەیە کەئاکامە دەرەکییەکانی خەرجیی سەربازیی، گرنگیی خۆی هەیە بۆ تێگەیشتن لەپەیوەندیی نێوان خەرجیی‌یە سەربازییەکانو گەشەی ئابوریو هەروەها ئەم مۆدێلە، جیاوازی لەسودبەخشیی فاکتەری بەشەکان زیاتر دەخاتە ڕو.

بە بەراوردکردنی ئەو مۆدێلەی بەم شێوەیە ڕێکخرابوو، وۆرد و هاوڕێکانی، دیڤیسو چان[٣٥]، توانیان کاریگەریی ئیجابیی خەرجیی‌یە سەربازییەکان لەسەر گەشەی ئابوری لەهیندستانو تایوان، یەك لەدوای یەکدا بدۆزنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا سەبارەت بەتایوان، کاریگەریی ئاکامە دەرەکییەکانی خەرجیی سەربازیی، سالب بو. لێکۆڵینەوەی خەرجیی‌یە سەربازییەکانی تورکیا، چەند بەڵگەیەك لەهەبوونی ئاڵوگۆڕ (جێگۆڕکێ Trade-off) لەنێوان بەرگریو گەشەدا دەخاتە ڕو.

**داتاکان**

هەبونی داتای جێ متمانە، توخمێکی ژیانییە لەلێکۆڵینەوە ئابورییە بەراوردکارییەکاندا. بەڵام، لەکاتی لێکۆڵینەوە لەوڵاتە کەم پەرەسەندوەکان، شتێکی سروشتییە کەداتای جێ متمانە گرفتێکی گەورەیە. ئەم گرفتە، نەك تەنها لەبارەی داتاکانی خەرجیی سەربازییەوە، بەڵکو لەداتا گشتییەکانی ئابوریشدا دەبینرێ.

---

[35]Ward, M.D.. Davis, D. and Chan,s. "Military Spending and Economic Growth Taiwan", Armed Forces and Society, 19(4), 1993, pp. 533-550.

بەشێوەیەکی ئاسایی، داتاکانی زەمەنە یەك لەدوای یەکەکان، ڕێکوپێك نین، یان بەهۆی هەڵاوسانی زۆرەوە، تەعدیلکارییەکانی بەها، وردبـــین نـــین، هەر بۆیە ڕەوا نییە داتا زەمەنییە یەك لەدوای یەکەکان، بۆ دەستەیەکی تر بگەڕێنرێنەوە، لەم هەلومەرجەدا، بڕی پاشماوەکـــان، گـەورەو چـەند جـارەی دیـــاریکردنی ($R^2$) بچـــوك دەبێ[٣٦]. تورکیـــا لەدەورەیـــەکی زەمـــــەنی درێژخایەندا، خاوەن نێونجێکی هەڵاوسانی بەرز بوو.

لەکاتی دیراسەکردنی تورکیـــادا، ئەمــە دەبێتــە یــەکێ لەکێشــەکانی ئابووریی بەراوردکاری. بەڵام، ڕێگایەکی تر بـــۆ لێکۆڵینـــەوەی پراکتیکـــیی هاوشانیی بەرگریو گەشە، لەئارادا نییە.

چەند سەرچاوەیەکی دیاریکراو بۆ داتاکانی خـــەرجیی ســـەربازی هـــەن، کەهەر یـــەك لەوانـــە خـــاوەن تایبەتمـــەندێتیی تایبـــەتی خۆیـــەتی. هـــەندێ لەســـەرچاوەکانی داتـــا ســـەربازییەکان بـــەم شـــێوەیەی خـــوارەوەن: تـــەرازووی ســـەربازی ((Military Balance (MB)) کـــە لەلایـــەن دامـــەزراوی نێودەوڵەتیی لێکۆڵینـــەوە ســـتراتیجییەکانەوە (IISS) بڵاوکراوەتـــەوە. ئـــەم بڵاوکراوەیە کۆمەڵێ زانیاریی پوختو بەسودی سەبارەت بەهەر وڵاتێکو بۆ هەر ساڵێکی دیاریکراو تێدایـــە[٣٧]، بـــەڵام ئەگـــەر پێویســـتیت بـــەداتاکانی زەمەنە یەك لەدوای یەکەکان، یان داتا مێژووییەکان بێ، ئەم جۆرە داتایانە، وەك پێویست کارا نین.

یـــەکێکی تـــر لـــەو بڵاوکراوانـــە، ســـاڵنامەی ئامـــارە دارایـــیو حکومەتییەکانـــە ((Government Finance Statistics (GFS) Yearbook کە لەلایەن سندوقی دراوی نێودەوڵەتییەوە دەردەچێو تیـــایدا

---

[36]Stewart, D.B. "Economic Growth and the Defence Burden in Africa and Latin America: Simulation from a Dynamic Model, "Economic Development and Cultural change, 40(1), 1991, pp. 189-207.

[37]Deger, S. "Military Expenditure and Third World Countries: The Economic Effect, (Routledge and Kegan Paul, London, (1986). Et al. Op. Cit.

خەرجی‌یە سەربازییەکانیش نیشان دەدرێن. داتاکانی ئەم کۆمەڵە، راستەوخۆ لەسەرچاوە رەسمییەکانی حکومەتەکانەوە وەردەگیرێ، و پێناسەی بۆ خەرجی‌یە سەربازییەکان زۆر سنوورداره.

سەرچاوەیەکی گشتی‌ی تری داتا سەربازییەکان، بلاوکراوەی ئاژانسی کۆنترۆڵ کردنی چەك‌و چەکداماڵینی ئەمریکایە US. Arms Control and Disarmamants Agency (ACDA). بەلام، لەم کۆمەڵەیەدا، ژمارەکان بەپێی دراوی نیشتمانی حساب نەکراوو بەم پێیە، بەهای کالاکان بەدراوی نیشتمانی، راستەوخۆ لەکۆمەڵە ژمارەکانی (ACDA)ـەوە ناتوانرێ دەربهێنرێ. هەر بەرگێك داتای پەیوەندیدار بە (١٠) ساڵەوە دەخاتە روو و ئەم مەسەلەیە کاری دۆزینەوەی داتاکانی چەند ساڵێك بەپێی پێویست قورس دەکات[٣٨].

سەرباری ئەوانەش، گۆڕینی داتاکان لەدراوی نیشتمانییەوە بۆ دۆلار، پرۆسەیەکی ئالۆزو درێژ خایەنە، کەتەعدیلکارییەکانی بەهاری GDP ی میللی‌و ولاتی ئەمریکاو نرخی دراو دەگرێتەوە.

بلاوکراوەکانی خودی تورکیاش، یەکێکی تر لەسەرچاوەکانی داتاکانە. بەم دواییانە، خەرجی‌یە سەربازییەکانی بودجەی گشتی‌ی حکومەت لەساڵی (١٩٢٤)ـەوە تاکو ساڵی ١٩٩٣، لەلایەن وەزارەتی ئابوورییەوە بلاوکراوەتەوە. ئەم داتایانە، هەمان داتاکانی (IMF-GFS)ن‌و بەو جۆرە هەمان گرفتیان هەیە. ژمارەکانی ئەم کۆمەڵە، زۆر لەخەرجی‌یەکانی بەرگری، لەوانە سندوقی پارێزگاریکردن لەپیشەسازی‌ی سەربازی‌ی (DISF) ناگرێتەوە. لەم سەروبەندەدا دامەزراوی نێودەوڵەتی‌ی لێکۆڵینەوەکانی ئاشتی ستۆکهۆڵم (SIPRI) داتاکانی خەرجی‌یە سەربازییەکان بلاو دەکاتەوە. ئەم دامەزراوە، بۆ حساب کردنی خەرجی‌یە سەربازییەکان، سوود لەسەرچاوە کراوەکان (Opens) وەردەگرێ.

---

[38] Deger, S. Op. Cit.

پێناسەکانی ناتۆ بۆ خەرجییە سەربازییەکان، وەك یەك ڕێبەر، لەهەمو وڵاتاندا پەیڕەو دەکرێ، ئەم داتایانە، بۆ زانینی چەند زەمەنێك، زۆر جێی متمانەن، جگە لەوەی کەناتۆ خەرجییە سەربازییەکانی ئەندامانی خۆیشی بڵاو دەکاتەوەو بڕی خەرجییە سەربازییەکان لەبڵاوکراوەکانی ناتۆو SIPRI دا یەکسانن.

لەوێنەی ژمارە (١) دا ئاستو ڕەوتی خەرجییە سەربازییەکان، لەسەرچاوەی داتا جۆراوجۆرەکانەوە نیشاندراوە. لەم وێنەیەدا، داتاکانی IISSو MOD GFS – (ئامارەکانی دارایی حکومەت کە لەلایەن IMF، بڵاودەکرێتەوەو داتاکانی وەزارەتی بەرگری تورکیا) بڕێکی کەمتر بەدرێژایی ڕەوتەکە نیشان دەدەن، چونکە پێناسەی خەرجییە سەربازییەکان لەوانەدا، زۆر سنوردارە. لەم ڕوەوە، داتاکانی خەرجیی سەربازیی تورکیا لەوەزارەتی ئابورییەوە وەردەگیرێ. ئەم داتایانە، هەمو خەرجییەکانی بواری ئاسایشو بەرگری دەگرێتەوە (پەواتایەکی تر، بودجەی وەزارەتی بەرگری، بودجەی هێزەکانی جەندرمە، بودجەی پاسەوانانی کەنار، بودجەی هێزەکانی ئاسایشو ژمارەکانی بودجەی وەزارەتی ناوخۆ).

هەر بۆیە ئەم ژمارانە، زیاتر خەرجییە سەربازییەکانی تورکیا دەگرێتەوەو هەندێ لەگرنگترین بەشەکانی کڕینی سەربازی ناگرێتەوە. ژمارەکانی SIPRI دەربڕینێکی باشترن بۆ خەرجییە سەربازییەکانی تورکیا، چونکە پێوانەیەکی وردتری هەمو کاڵا سەربازییەکانەو هەر لەبەر ئەم هۆیەشە، لەم لێکۆڵینەوەیەدا سود لەداتاکانی SIPRI (یان داتاکانی ناتۆ)، بۆ خەرجییە سەربازییەکان وەرگیراوە.

### ئەنجامی پراکتیکی

ئەنجامە پراکتیکییەکانی بەراوردکردنی هاوکێشەکانی (٥) تاکو (٨) بەشێوازی لایەنی کەمی چوارگۆشەکاری ئاسایی (OLS)، لەخشتەی ژمارە (٧)دا نیشاندراوە. هاوکێشەی (٥) نمونەیەك لەدو بەش،

بەجیاکردنـەوەی بّەشـەکانی سـەربازیو غـــەیرە سـەربازی، نیشـــانداوە. کاریگەریی گشتیی خەرجییە سەربازییەکان، لەم هاوکێشەیەدا دەبیـنرێ، هاوکێشەی (٥)، ئەو ئەنجامانەی کە لەڕوی ئامارەوە مەعنەوین، سـەبارەت بەهێزی کارو بەشی بەرگری، دەخاتە رو. هەردو ئەم کاریگەرییانە، ئیجابین. بەلاّم، چەند جارەی گۆڕاوی سـەرمایەگوزاری، لـەڕوی ئامـارەوە مـەعنـەوی نییە. ئەمەش جێی سەرسوڕمانە کە لەولاّتێکدا نێونجی گەشـە بـەرز بـێ، سەرمایەگوزاری وەك بەهێزکەرێکی بـەروبوم، دەرنەکـەوێ. وۆرد، دیڤیـسو چـان[39]، ئـەنجامێکی هاوشـێوەیان لـەبارەی تایوانـەوە کەوتـە دەسـت. لەهاوکێشەی (٦)دا بەراوردگەلێ بـۆ کاریگـەریی ئاکامـە دەرەکییـەکانو جیـاوازیی لەسودبەخشـی فاکتـەرەکاندا، بەشـێوەی جیاجیـا دەبیـنرێ. ئەنجامـەکان بـەنزیکی هـەمان هاوکێشـەی (٥)ن. بـەلاّم، لەگـەلّ ئـەوەی کاریگەری خەرجیی سـەربازی ئیجابییـە، کـەچی ئاکامـە دەرەکییـەکانی بەشی بەرگری سەلبییە، هـەروەها لـەم هاوکێشـەیەدا، ئەگـەری حسـاب کردنی جیاوازی لەسودبەخشی فاکتەرەکان، کەسەلبییە (S=1/03) هەیە. مانای ئەم چەند جارەیە (S)، ئەوەیە کەبەشە غەیرە سەربازییەکان، خـاوەن سودبەخشییەکی بالاّترن بەگوێرەی بەشی سەربازی چونکە بەشی سـەربازی، کەمتر پابەندی شێوەی بازاڕە.

جگە لەگۆڕاوی سەرمایەگوزاری، چەند جارەکانی تری هاوکێشەی (٦)، لەڕوی ئامارەوە مەعنەوین. چەند جارەی دیاریکـەری ($R^2$)، لەهاوکێشـەی (٦)دا، بەرێژە بچوکە. بەلاّم، ئەم جۆرە لەنمونەکانی گەشە، بـەزۆری خـاوەن ($R^2$)ی بالاّ نین بەتایبەتی کاتێ ولاّتـانی کـەم پەرەسـەندوی وەك تورکیـا، بەنێونجێکی بالاّی هەلاّوسانەوە دەخرێنە بەر لێکۆلّینەوە.

بەهۆی بەرزیی هەلاّوسان لەخولێکی درێژخایەندا، تەعدیلکارییـەکانی بەها لەتورکیا ورد نین. لەم روەوە بڕی $R^2$ نزمە.

---

[39] Ward, M.D, Davis, D. and Chnan, S. op cit.

ئەگەر گۆڕاوی سەرمایەی مرۆیی بخەینە پاڵ هاوکێشەکانی (٧) و(٨)، ئەوا ئەنجامێکی هاوشێوەمان دەست دەکەوێ، بەڵام چەند جارەی پەیوەندیی سەرمایەی مرۆیی لەگەڵ گەشەی ئابوریدا، لەروی ئامارییەوە، لەهەردو دۆخەکەدا مەعنەوی نین. رەنگە ئەمە لەهەڵبژاردنی گۆڕاوی نوێنەری نەگونجاو بۆ سەرمایەی مرۆییەوە سەرچاوەی گرتبێ.

لەڕاستیدا نوێنەرایەتیی سەرمایەی مرۆیی کارێکی ئاسان نییە. لەلێکۆڵینەوەیەکی پراکتیکیدا، سود لەرێژەی سەدەیی دانیشتوانی تەمەن چالاك، کە لەخوێندنگە ئامادەییەکاندا دەخوێنن، وەرگیراوە[40]. کەچی لەلێکۆڵینەوەیەکی تردا، رێژەی ناونوسکراوەکان لەئامادەییەکاندا بۆ دانیشتوان، وەك نوێنەرێك بۆ سەرمایەی مرۆیی بەکار براوە[41]. بەڵام، ئەم جۆرە نوێنەرانە، بۆ مۆدێلەکانی جۆری فیدیر گونجاو نین.

سود وەرگرتن لەخەرجییە پەروەردەییەکانی بودجەی گشتیی حکومەت، ئەنجامێکی باشی نەدایە دەستەوە. بەدانانی رێژەی ناونوسکراوەکان لەئامادەییەکاندا بۆ دانیشتوان، لەمۆدێلی فیدیردا، لەوانەیە ئەنجامێکی باشتر بداتە دەستەوە. لەگشت ئەم دۆخانەدا، بەهای ئاماری F، خاوەن ئەگەری روداني کەمە.

لەوتارەکەی وۆرد، دیڤیس و لوفدالدا[42]، ئاڵوگۆری نێوان بەرگری و گەشە بەدرێژایی کات، لەویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا (١٨٧٩-١٩٩٠) و ژاپۆن (١٨٧٩-١٩٩٠)، لێکدراونەتەوەو بۆیان ساغ بۆتەوە کەکاریگەریی کڕینی کەرەستەی سەربازی، جێگیر نییەو بەشێوەیەکی

[40]Mankiw et al. Op. Cit.

[41]Ghatak, S. Milner, C. and Utkulu, U. "Trade Liberalisation and Endogenous Growth: Some Evidence for Turkey", (Discussion papers in Economics, University of Leiceseter, Leicester, 1994).

[42]Ward, M.D, Davis, D. and Lofdahl, C.R "A Century of Trade offs: Defence and Growth in Japan and The United States", International Studies Quarterly, 39, 1995, pp. 27-50.

سەیر بەدرێژاییی کات لەگۆڕاندایە.

دەکرێ ئەم لێکۆڵینەوەیە، بۆ تورکیاش تاقی بکەینەوە. لەخشتەی ژمارەی (٨)دا ئەنجامی لەم جۆر بەراوردە نیشاندراوە. بۆ ئەنجامدانی ئەم جۆرە بەراوردەش، سود لەهاوکێشەی ژمارە (٦) وەرگیراوە، چونکە کاریگەریی بڕو هەم کاریگەریی ئاکامە دەرەکییەکانی خەرجیی سەربازی نیشان دەداتو ئەنجام گەلێکی باشتر بۆ بەراورد کردنێکی گشتی دەداتە دەستەوە.

پەرامیتەرە بەراوردکراوەکان لەیەکەمین دێڕی خشتەی (٨)دا، هەمو خولەکانی نمونەکە دەگرێتەوە، کەخولێکی ٤٤ ساڵەیەو لەساڵی ١٩٥٠ تاکو ساڵی ١٩٩٠ دەگرێتەوە.

دێڕەکانی دواتری خشتەکە، ئەنجامی خولەکانی ٢٤ ساڵە، کەبەخولەکانی ١٩٥٠-١٩٧٣ دەست پێ دەکات، نیشان دەدات. ئەم ئەنجامانە نیشاندەری ئەوەن کەکاریگەریی خەرجییە سەربازییەکانی وڵاتی تورکیاش جێگیر نییە. کاریگەریی قەوارە، یان بڕی خەرجییە سەربازییەکان لەسەر گەشەی ئابوری، سەرەتا ئیجابییە، بەڵام بەخێرایی دەگۆڕێ بۆ غەیرە مەعنەوی. لەکاتێکدا، کاریگەرییەکانی ئاکامە دەرەکییەکانی خەرجیی سەربازی، لەسەرەتادا سەلبییەو دواتر دەبێتە غەیرە مەعنەوی، هەروەها لێرەش چەند جارەی گۆڕاوی سەرمایەگوزاری، لەڕوی ئامارەوە غەیرە مەعنەوین.

## ئەنجامەکان

دەکرێ ئەنجامەکانی ئەو لێکدانەوانەی لەم وتارەدا ئەنجام دراون بەم شێوەیە پوخت بکەینەوە، یەکەم، ئابوریی تورکیا خاوەن دەرامەتێکی مام ناوەندەو لەنێوان وڵاتەکانی ئەندامی ناتۆدا خاوەن بارێکی بەرگریی باڵایە. ئەم وڵاتە خاوەن هێزێکی سەربازیی گەورەیە، بەجۆرێك لەئایندەیەکی نزیکدا ئەگەری کەمکردنەوەی ناکرێ.

دووەم، لەپاش ساڵی (١٩٨٠)وە تورکیا دەستی کردوە بە بەرهەمهێنانی کەلوپەلی سەربازیی پێویستی خۆی، بەجۆرێك کەپیشەسازیی سەربازی بۆتە بەشێکی حاڵەتی پەرەسەندنی ئەم وڵاتە. ئەم پیشەسازییە، لەئایندەدا دەبێتە بەشێکی گرنگی پیشەسازیی تورکیاو سودبەخشیو قەوارەی هەناردەی زیاد دەکات.

سێهەم، بەڵگەی بەرجەستە نیشانی دەدەن کەخەرجییە سەربازییەکانی تورکیا، زیانی نابێ لەسەر ئابوریی وڵات، بەپێچەوانەوە، یارمەتیی گەشەی ئابوریی دەدات.

پەیوەندییەکی ئیجابیو مانادار هەیە لەنێوان بڕی خەرجییە سەربازییەکانو گەشەی ئابورییدا. لەهەمان کاتدا، ئاکامە دەرەکییەکانی بەشی سەربازیی بۆ بەشەکانی تری ئابووری سەلبییە.

سەرەنجام، کاریگەریی خەرجییە سەربازییەکان بۆ تورکیاو بەدرێژایی کات، جێگیر نییە.

سەرمایەی مرۆیی نمونەی فیدیرو ئەنجامەکان باشتر ناکاتو ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کەخەرجییە پەروەردەییەکان، نوێنەرێکی باشی سەرمایەی مرۆیی نین.

## خشتەی ژمارە ١ -أ-

## داتا بنەڕەتییەکانی ئابوریی تورکیا (١٩٥٠-١٩٩٤)

| دانیشتوان (ملیۆن کەس) | ١٩٥٠ | ١٩٦٠ | ١٩٧٠ | ١٩٨٠ | ١٩٨٥ |
|---|---|---|---|---|---|
| | ٢٠,٨ | ٢٧,٥ | ٣٥,٣ | ٤٤,٤ | ٥٠,٣ |
| هەڵاوسان | -٩,٤ | ٥,٠ | ٨,٣ | ١٠١,٦ | ٤٤,٩ |
| تێکرای بێکاری (٪) | - | ٩,٥ | ١٢,٠ | ٧,٨ | ٦,٩ |
| تێکڕای گەشەی GNP واقعي (٪) | ١١,٤ | ١٠,٩ | ٧.٠ | -١,٢ | ٥,١ |
| GNP سەرانە (دۆلاری ئێستای ئەمریکا) | ٢٤٢ | ٥٢٢ | ٥٣٩ | ١٥٣٩ | ١٢٠٤ |
| GNPسەرانە (هەزار لیرەی تورکیایی-جێگیر ١٩٨٧) | ٥٢٠,٣ | ٧٢٤,٥ | ٧٧٥,٩ | ١١٤٤,٨ | ١٢٧٢,٠ |
| ڕێژەی سەرمایە گوزاری بۆ GNP (٪) | ١٠,٤ | ١٣,١ | ٢٠,٩ | ١٦,٧ | ٢٢,٥ |
| ڕێژەی بودجەی حکومەتی مەرکەزی بۆGNP (٪) | ١٣,٨ | ١١.٥ | ١٦,٧ | ٢١,٦ | ١٩,٥ |
| ڕێژەی نارده بۆ GNP (٪) | ٧,١ | ٣,٤ | ٤,٤ | ٥,٠ | ١٤,٩ |

## خشتەی ژمارە ١ -ب-

| دانیشتوان (ملیۆن کەس) | ١٩٩٠ | ١٩٩١ | ١٩٩٢ | ١٩٩٣ | ١٩٩٤ |
|---|---|---|---|---|---|
| | ٥٦,١ | ٥٧,٣ | ٥٨,٦ | ٥٩,٩ | ٦١,٢ |
| هەڵاوسان | ٦٠,٣ | ٦٦,٠ | ٧٠,١ | ٦٦,١ | ١٠٦,٣ |
| تێکرای بێکاری (٪) | ٨,٣ | ٧,٨ | ٧,٦ | ٧,٧ | - |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| تێکڕای گەشەی GNP واقعی (٪) | ٩,١ | ٠,٣ | ٦,٤ | ١١,٤ | -٧,٤ |
| GNP سەرانە (دۆلاری ئێستای ئەمریکا) | ٢٦٨٧ | ٢٦٢٠ | ٢٧٠٠ | ٢٩٣٧ | ١٩٧٥ |
| GNPسەرانە (هەزار لیرەی تورکیایی-جێگیر ١٩٨٧) | ١٥٠٨,٠ | ١٤٨٠,٩ | ١٥٤٢,١ | ١٩٢٣,٩ | ١٥٠٣,١ |
| ڕێژەی سەرمایە گوزاری بۆ GNP (٪) | ٢٥,٧ | ٢٢,٦ | ٢٤,٦ | ٢٨,٢ | ٢١,١ |
| ڕێژەی بودجەی حکومەتی مەرکەزی بۆ GNP (٪) | ١٢,٢ | ٢٠,٩ | ٢٠,٤ | ٢٥,٤ | ٢٤,٦ |
| ڕێژەی نارده بۆ GNP (٪) | ١١,٩ | ١٢,٥ | ١٢,٨ | ١١,٩ | ١٣,٦ |

سەرچاوە:

OECD Economic Suveys Turkey and OECD Labour Force Statistics, (MF, IFS, Ministry of Finance Turkey (١٩٩٣, ١٩٩٥), SiS Turkey (١٩٩٦), Ozmueur (١٩٩٦)

*بەپێی بەها جێگیرەکانی ١٩٨٥ حساب کراوە.

## خشتەی ژمارە ٢

### داتا هەڵبژێردراوەکان لەبواری خەرجی‌یە سەربازییەکانی تورکیا

| ساڵ | ME | AME (%) | AGNP (%) | ME/GNP (%) | ME/CGB (%) |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٥٠ | ٢٤٧,٥ | ٧,٣ | ٩,٤ | ٥,٨ | ٢٧,٠ |
| ١٩٥١ | ٢٧٥,٠ | ١١,١ | ١٢,٨ | ٥,٣ | ٢٧,٢ |
| ١٩٥٢ | ٢٨٧,٣ | ٤,٥ | ١١,٩ | ٥,١ | ٢٦,٥ |
| ١٩٥٣ | ٣١٩,٠ | ١١,٠ | ١١,٢ | ٤,٩ | ٣١.٠ |
| ١٩٥٤ | ٣٤٤,٦ | ٣,٥ | -٣,٠ | ٥,٥ | ٣٤,٨ |
| ١٩٥٥ | ٣٧٧,٣ | ٩,٥ | ٧,٩ | ٥,١ | ٣٧,٨ |
| ١٩٥٦ | ٣٦٤,٨ | -٣,٣ | ٣,٢ | ٤,٨ | ٣١,٢ |
| ١٩٥٧ | ٣٥٦,٤ | -٢,٣ | ٧,٨ | ٤,٢ | ٢٩,١ |
| ١٩٥٨ | ٣٣٥,٦ | -٥,٩ | ٤,٥ | ٣,٨ | ٣٠,٩ |
| ١٩٥٩ | ٤٣٠,٢ | ٢٨,٢ | ٤,١ | ٤,٥ | ٢٩,٥ |
| ١٩٦٠ | ٤٠١,٧ | -٦,٦ | ٣,٤ | ٤,٧ | ٢٧,١ |
| ١٩٦١ | ٤٥٣,٠ | ١٢,٨ | ٢,٥ | ٥,١ | ٢٢,١ |
| ١٩٦٢ | ٤٢٥,٧ | -٦,٠ | ٦,٢ | ٤,٩ | ٢٨,٨ |
| ١٩٦٣ | ٤٥١,٠ | ٥,٩ | ٩,٧ | ٤,٧ | ٢٥,٦ |
| ١٩٦٤ | ٤٣٠,٤ | -٤,٦ | ٤,١ | ٤,٨ | ٢٤,٨ |
| ١٩٦٥ | ٤٧٧,٦ | ١١,١ | ٣,١ | ٥,٠ | ٢٤,١ |
| ١٩٦٦ | ٤٩٩,٥ | ٤,٦ | ١٢,٠ | ٤,٤ | ٢٣,١ |
| ١٩٦٧ | ٥١٠,٧ | ٢,٢ | ٤,٢ | ٤,٥ | ٢٢,١ |
| ١٩٦٨ | ٥٧٣,٢ | ١٢,٣ | ٤,١ | ٤,٦ | ٢٢,٩ |
| ١٩٦٩ | ٥٣٩,٥ | -٥,٩ | ٤,٣ | ٤,٣ | ٢٠,٢ |
| ١٩٧٠ | ٥٦٧,٠ | ٥,١ | ٤,٤ | ٤.٢ | ١٨,٢ |
| ١٩٧١ | ٦٥٢,٨ | ١٥,١ | ٧,٠ | ٤,٤ | ١٩,١ |
| ١٩٧٢ | ٦٦٤,١ | ١,٧ | ٩,٢ | ٤,١ | ١٩,٢ |
| ١٩٧٣ | ٦٧٧,٣ | ٢,٠ | ٤,٩ | ٣,٩ | ٢٠,٧ |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ۱۹۷٤ | ٦٥۹,٦ | -۲,٦ | ۳,۳ | ۳,۷ | ۲۱,۸ |
| ۱۹۷٥ | ۱۱۱۸,٥ | ٦۹,٦ | ۸,۱ | ٥,٦ | ۲۰,۱ |
| ۱۹۷٦ | ۱۲۷۱,٦ | ۱۳,۷ | ۹,۰ | ٦,۰ | ۱۹,۳ |
| ۱۹۷۷ | ۱۲٤٤,۸ | -۲,۱ | ۳,۰ | ٥,۷ | ۱۷,۲ |
| ۱۹۷۸ | ۱۱٦۲.۱ | -٦,٦ | ۱,۲ | ٥,۱ | ۱٥,۰ |
| ۱۹۷۹ | ۹٥۱,۷ | -۱۸,۱ | -۰,٥ | ٤,۲ | ۱٥,۰ |
| ۱۹۸۰ | ۹۲۸,۳ | -۲,٥ | -۲,۸ | ٤,۱ | ۱۹,۰ |
| ۱۹۸۱ | ۱۱۰۲,۳ | ۱۸,۸ | ٤,۸ | ٤,۸ | ۱۷,۹ |
| ۱۹۸۲ | ۱۲٤۰,٤ | ۱۲,٥ | ۳,۱ | ٥,۱ | [illegible],۰ |
| ۱۹۸۳ | ۱۲۰۲,٥ | -۳,۱ | ٤,۲ | ٤,۸ | ۱٦,۳ |
| ۱۹۸٤ | ۱۱٥٥,٥ | – -۳,۹ | ۷,۱ | ٤,٤ | ۱٦,۱ |
| ۱۹۸٥ | ۱۲۳٥,۰ | ٦,۹ | ٤,۳ | ٤,٤ | ۱٥,٤ |
| ۱۹۸٦ | ۱٤۲٦,۰ | ۱٥,٥ | ٦,۸ | ٤,۷ | ۱۷,۹ |
| ۱۹۸۷ | ۱۳٦٥,٥ | -٤,۲ | ۹,۸ | ٤,۲ | ۱٦,۰ |
| ۱۹۸۸ | ۱۲٦۱,۷ | -۷,٦ | ۱,٥ | ۳,۸ | ۱٥,۱ |
| ۱۹۸۹ | ۱٤۳٤,۲ | ۱۳,۷ | ۱,٦ | ٤,۲ | ۱۷,۱ |
| ۱۹۹۰ | ۱۷۹۸,۷ | ۲٥,٤ | ۹,٤ | ٤,۸ | ۱۷,۹ |
| ۱۹۹۱ | ۱۹۲۸,۰ | ۷,۲ | ۰,٤ | ٥,۲ | ۱٦,۸ |
| ۱۹۹۲ | ۳۱۰۹,٦ | ۹,٤ | ٦,٤ | ٥,۳ | ۱۸,٥ |
| ۱۹۹۳ | ۲۳۸٥,۲ | ۱۳,۱ | ۷,٦ | ٥,٤ | ۱۳,۲ |
| ۱۹۹٤ | ۲۱۸٤,۷ | -۸,٤ | -٥,۱ | ٥,۲ | ۱٥,۰ |

تێبینییەکان:

ME = خەرجییە سەربازییەکانی تورکیا بەملیار لیرەو بەها جێگیرەکانی ساڵی ۱۹۸٥.

AME = نێونجی گەشەی ME.

AGNP = نێونجی گەشەی واقیعی بەرهەمی ناپوختەی میللی GNP.

ME/GNP = بەشی خەرجییە سەربازییەکان لە GNP دا.

ME/CGB = بەشی خەرجییە سەربازییەکان لەبودجەی حکومەتی مەرکەزیدا.

سەچاوە:

Statistical Indicators 1993-1992, SIS (1994), Ministry of Finance (1993, 1995),-Ozmucur (1996) SIPRI Yearbook.

## خشتەی ژمارە ٣

### پرسنلە سەربازییەکان لەتورکیاو ناتۆ

| پرسنلی سەربازیی تورکیا (هەزار کەس) | ١٩٧٥ | ١٩٨٠ | ١٩٨٥ | ١٩٩٠ | ١٩٩١ | ١٩٩٢ | ١٩٩٣ | ١٩٩٤ | ١٩٩٥ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ٥٨٤ | ٧١٧ | ٨١٤ | ٧٦٩ | ٨٠٤ | ٧٠٤ | ٦٨٦ | ٨١١ | ٨٠٧ |
| ناتۆی ئەوروپایی (هەزار کەس) | - | ٣٥٠٤ | ٣٦٠٣ | ٣٥١٠ | ٣٣٩٠ | ٣١٥٩ | ٢٩٩٤ | ٣٠٨٢ | ٣٠٢٣ |
| هەموو ناتۆ (هەزار کەس) | - | ٥٦٣٦ | ٥٩٣٠ | ٥٧٧٨ | ٥٥٩١ | ٥١٥٩ | ٤٨٨٥ | ٤٨٧١ | ٤٧٣٠ |
| ١,٢ (%) | - | ٢٠,٥ | ٢٢,٦ | ٢١,٩ | ٢٣,٧ | ٢٢,٣ | ٢٢,٩ | ٢٦,٣ | ٢٦,٦ |
| ١,٣ (%) | - | ١٢,٧ | ١٣,٧ | ١٣,٣ | ١٤,٤ | ١٣,٦ | ١٤,٠ | ١٦,٦ | ١٧,١ |

### پرنسلی سەربازیو غەیرە سەربازی بەرێژەی سەدی لەهێزی کار

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| تورکیا (%) | ٣,٨ | ٤,٥ | ٤,٨ | ٤,١ | ٤,٣ | ٣,٨ | ٣,٧ | ٤,٢ | ٤,١ |
| ناتۆی ئەوروپایی (%) | - | ٢,٨ | ٢,٨ | ٢,٦ | ٢,٤ | ٢,٢ | ٢,١ | ٢,١ | ٢,١ |
| هەموو ناتۆ (%) | - | ٢,٨ | ٢,٧ | ٢,٥ | ٢,٤ | ٢,٢ | ٢,١ | ٢,٠ | ١,٩ |

سەرچاوە NATO Review, January 1995

### خشتەی ژمارە ٤

### خەرجیو داهاتەکانی سندوقی پشتگیری لەپیشەسازیی سەربازی

(ملیۆن دۆلاری ئەمریکا، بەهای ئیستا)

| خەرجی | داهات | ساڵ |
|---|---|---|
| ٥٤,٢ | ٢٣٧,٩ | ١٩٨٦ |
| ٧٣,٩ | ٢٠٨,٣ | ١٩٨٧ |
| ٢١٠,٧ | ٤٤٥,١ | ١٩٨٨ |
| ٢٧٣,٧ | ٦٦٩,١ | ١٩٨٩ |
| ٧٦٥,٥ | ٩٢٠,٧ | ١٩٩٠ |
| ٦١١,٧ | ٣٨٢,٦ | ١٩٩١ |
| ١٠٠١,٠ | ١١٥١,٣ | ١٩٩٢ |

سەرچاوە

Ministry of Finance (1993). Defence and Security Services, 1924-1993.

## خشتەی ژمارە ٥

## بەرهەمهێنەرە سەرەکییەکانی ئامرازی جەنگی لەتورکیا

| ناو | ساڵی دامەزراندن | موڵکداریتی | چالاکییە سەرەکییەکان |
|---|---|---|---|
| Aselsan | ١٩٧٩ | هێزە چەکدارەکان | پەیوەندیی سەربازی، پارچەی ئەلکترۆنی |
| Asicolik | ١٩٧٤ | حکومەتی | بەرهەمهێنانی پۆڵا (لوولەو گوللە) |
| Coskunoz | ١٩٧٣ | تایبەتی | دەزگای گوشاری Press هەیدرۆلیکیو میکانیکی پارچەی یەدەکی ئۆتۆمبیل |
| FMC-NUROOL | ١٩٩٢ | سەرمایەگوزاری هاوبەش | ئۆتۆمبیلی زرێپۆشی جەنگی بۆ سوارە |
| ISBIR Electric | ١٩٧٧ | هێزە چەکدارەکان | جەنەراتۆری دیزلی بۆ ئامانجی سەربازی |
| MARCON I(MKAS) | ١٩٨٨ | سەرمایەگوزاری هاوبەش | پەیوەندییە رادیۆییەکان HF-SSB |
| Mercedes Benz | ١٩٦٧ | سەرمایەگوزرای هاوبەش | ئۆتۆمبیلی تاکنیکی |
| MKEK | ١٩٥٠ | حکومەتی | تۆپخانە، چەکی سوك، تفاقی جەنگی، موشەك هاوێژی دژەتانك، رەشاش |

| | | | |
|---|---|---|---|
| MKEK-AV Fisek | ١٩٢٠ | حکومەتی | تفاقی جەنگی |
| MKEK-Barustsan | ١٩٨٩ | حکومەتی | تەقەمەنی ئامرازەکانی تەقاندن |
| NOROL | ١٩٨٢ | سەرمایەگوزاری هاوبەش | سستمە پەیوەندیدارەکان بەچەکسازییەوە |
| OTOKAR | ١٩٦٣ | سەرمایەگوزاری هاوبەش | شاسی لاندرۆز، مەکینەی دیزل |
| Petlas | ١٩٧٦ | هێزە چەکدارەکان | تایە |
| Pokeisan | ١٩٨٩ | سەرمایەگوزاری هاوبەش | ئامرازی تەقاندنو ماتۆڕی موشەك |
| SGS-Profilo | ١٩٨٨ | سەرمایەگوزاری هاوبەش | تەلەفۆنی هاورێ |
| STFA-Sarorouik | ١٩٨٦ | سەرمایەگوزاری هاوبەش | سستمی ئاگر کوژاندنەوەو سەلامەتی |
| Tusas TAI | ١٩٨٤ | سەرمایەگوزاری هاوبەش - | فڕۆکەی F-16 |
| Tusas TEI | ١٩٨٥ | سەرمایەگوزاری هاوبەش | مەکینەی F-110، پارچەکانی F-16 |
| Teletas | ١٩٨٤ | حکومەتی | پەیوەندی، پارچەی ئەلەکترۆنی |
| Testas | ١٩٧٦ | تایبەتی | پارچەی ئەلکترۆنی، ئۆتۆمبیلی قورس بۆ ئامانجی سەربازی |

| | | | |
|---|---|---|---|
| کەشتی دروست کردن | هێزی دەریایی | ١٩٤١ | Taskizak Naval Yard |
| کەشتی دروست کردن | هێزی دەریایی | ١٩٢٤ | Goleuk Naval Yard |

Source: Bartzokas (1992), Karasapan (1987), Ozmucur (1996).Senesen (1993).

خشتەی ژمارە ٦

دامەزراوە بنەڕەتییە سەربازییەکان و ژمارەی کرێکارەکانیان

| دامەزراو | کەس |
|---|---|
| MKE (٢٠ کارخانە) | ٢٠٠٠٠ |
| GOLUCK(کۆمەڵگای کەشتی سازی) | ٦٠٠٠ |
| TASKIZAK (کۆمەڵگای کەشتی سازی) | ٤٠٠٠ |
| Aselsan(پیشەسازی ئەلەکترۆنیکی سەربازی) | ٣٠٠٠ |
| TAI(فڕۆکەی جەنگی F-16 ) | ٢٣٠٠ |
| MAN (لۆریی سەربازی) | ١٥٠٠ |
| Ibrahim Ors (کەلوپەلی بچوکی سەربازی) | ٣٠٠ |

Source: Akgul (1988), Karasapan (1987), senesen (1993).

## خشتەی ژمارە ٧
## ئەنجامە پراکتیکییەکان

| چەند جارە | هاوکێشەی ٥ | هاوکێشەی ٦ | هاوکێشەی ٧ | هاوکێشەی ٨ |
|---|---|---|---|---|
| جێگیر | ٠,٠٥ (٢,٠٢) | ٠,٠٤ (١,٨٠) | ٠,٠٣ (١,١٤) | ٠,٠٨١ (٠,٠٢) |
| I/Y | ٠,١٠ (-١,١٧) | ٠,٠٨ (-٠,٩٦) | -٠,١٥ (-١,٤١) | -٠١٣ (-١,٣٧) |
| Δ L/L | ١,٤١ (٢,٤٩) | ١,٣٩ (٣.٠٩) | ١,٤٧ (٣,٠٢) | ١,٤٦ (٣,٢١) |
| Δ H/Y | - | - | ٠,٩٣ (٠,٨١) | ١,١٢ (١,٠٥) |
| Δ M/Y | ٥,٢٧ (٣,٧٢) | ٢٦,٧٤ (٣,١٠) | ٥,٠٩ (٣,٥٣) | ٣٧,١٥ (٣,١٥) |
| ΔM/M | - | -٠,٠٩ (٠٢,٥٢) | - | -٠,٩٢ (-٢,٥٩) |
| S | - | -١,٠٣ | - | -١,٠٣ |
| $R^2$ | ٠,٣٨ | ٠,٤٦ | ٠,٣٩ | ٠,٤٨ |
| $R^{-2}$ | ٠,٣٢ | ٠,٣٩ | ٠,٣٢ | ٠,٤١ |
| $D^w$ | ٢,٢٦ | ٢,٢٦ | ٢,٢٢ | ٢,٢٣ |

## خشتەی ژمارە ٨

### بەراوردی پارامیتەرەکانی هاوکێشەی (٦) بەدرێژاییی کات

| ساڵی دەستپێکردن | ساڵی کۆتایی | ژمارەی موشاهەدات | سەرمایە گوزرای | هێزی کار | ئەندازەی سوپا | خەرجیی سەربازی | $R^2$ | F |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٥٠ | ١٩٩٣ | ٤٤ | (٠٠,٩٦)<br>٠٠,٠٨ | (٣,٠٨)<br>١,٣٩ | (٣,١٠)<br>٣٦,٧٤ | (-٢,٢٥)<br>-٠,٩٠ | ٠,٤٧ | ٨,٤٢ |
| ١٩٥٠ | ١٩٧٣ | ٢٤ | (١,٠٩)<br>٠,٦٣ | (٢,٠٨)<br>١,٠٨ | (٣,٤٧)<br>٧١,٣٢ | (-٢,٩٣)<br>-٢,٦٦ | ٠,٦٣ | ٨,٢٣ |
| ١٩٥١ | ١٩٧٤ | ٢٤ | (١,٠٩)<br>٠,٣٤ | (٢,٠٢)<br>١,٠٨ | (٣,١٥)<br>٦٥,٧٤ | (-٢,٦٢)<br>-٢,٤٠ | ٠,٦١ | ٧,٣٤ |
| ١٩٥٢ | ١٩٧٥ | ٢٤ | (١,٢٢)<br>٠,٣٩ | (١,٩٧)<br>١,٠٤ | (٣,٣١)<br>٥٨,٨٠ | (-٣,٠٣)<br>-٢,١١ | ٠,٥٦ | ٦,٠٣ |
| ١٩٥٣ | ١٩٧٦ | ٢٤ | (٠,٠٤)<br>٠,٠١ | (١,٩٦)<br>١,١٧ | (٢,١٧)<br>٣٣,٨٦ | (-١,٨٦)<br>-١,١٢ | ٠,٤٤ | ٣,٧٣ |
| ١٩٥٤ | ١٩٧٧ | ٢٤ | (٠,١٥)<br>٠,٠٤ | (١,٨٥)<br>١,١١ | (٢,٠٢)<br>(٣١,٩٧ | (-١,٧٧)<br>-١,٠٦ | ٠,٤١ | ٣,٣٥ |
| ١٩٥٥ | ١٩٧٨ | ٢٤ | (-٠,٣٢)<br>-٠,٠٨ | (٢,٤٨)<br>١,٣٦ | (٢,٤٢)<br>٣٢,٠٣ | (-٢,٠٧)<br>-١,١٠ | ٠,٥٠ | ٤,٧٨ |

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٥٦ | ١٩٧٩ | ٢٤ | (٠,٣٢)<br>٠,٣٠ | (٢,٠٣)<br>١,١٧ | (١,٩٣)<br>٢٤,٥٦ | (-١,٥٥)<br>-٠,٧٩ | ٠,٤٥ | ٣,٨٣ |
| ١٩٥٧ | ١٩٨٠ | ٢٤ | (-٠,٣٢)<br>-٠,٠٧ | (٢,١٣)<br>١,٢٤ | (١,٨٦)<br>٢٤,١٠ | (-١,٤٧)<br>-٠,٧٦ | ٠,٤٥ | ٣,٨٥ |
| ١٩٥٨ | ١٩٨١ | ٢٤ | (-٠,٢٣)<br>-٠,٠٥ | (١,٨٥)<br>١,٠٨ | (١,٨٨)<br>٢٣,٥١ | (-١,٤٧)<br>-٠,٧٤ | ٠,٤٥ | ٣,٨٨ |
| ١٩٥٩ | ١٩٨٢ | ٢٤ | (-٠,٤١)<br>-٠,٠٨ | (١,٨٩)<br>١,١٥ | (١,٨٠)<br>٢١,٨٩ | (-١,٣٩)<br>-٠,٦٨ | ٠,٤٤ | ٣,٧٨ |
| ١٩٦٠ | ١٩٨٣ | ٢٤ | (-٠,٥٠)<br>-٠,١٢ | (١,٩١)<br>١,٢٢ | (١,٧٤)<br>٢١,١٤ | (-١,٣٠)<br>-٠,٦٤ | ٠,٤٤ | ٣,٦٨ |
| ١٩٦١ | ١٩٨٤ | ٢٤ | (-٠,٤٦)<br>-٠,١١ | (٠,٨٧)<br>٠,٦٠ | (١,٥٠)<br>١٧,٣٨ | (-١,١١)<br>-٠,٥٢ | ٠,٣٤ | ٢,٣٩ |
| ١٩٦٢ | ١٩٨٥ | ٢٤ | (-٠,٧٠)<br>-٠,١٤ | (٠,٩٧)<br>٠,٦٦ | (١,٦٤)<br>١٩,٠٢ | (-١,٢٤)<br>-٠,٥٨ | ٠,٣٥ | ٢,٥٨ |
| ١٩٦٣ | ١٩٨٦ | ٢٤ | (-١,٠٢)<br>-٠,١٩ | (١,٠٤)<br>٠.٦٩ | (١,٥٥)<br>١٧,٢٩ | (-١,١٥)<br>-٠,٥٢ | ٠,٣٥ | ٢,٥٤ |
| ١٩٦٤ | ١٩٨٧ | ٢٤ | (-٠,٣٧)<br>-٠,٠٧ | (٠,٨٧)<br>٠,٥٩ | (١,٣٦)<br>١٥,٥٢ | (-١,٠٩)<br>-٠,٤٦ | ٠,٣٠ | ٢,٠٥ |
| ١٩٦٥ | ١٩٨٨ | ٢٤ | (-١,١٢)<br>-٠,١٦ | (١,٠٧)<br>٠,٦١ | (١,٣٣)<br>١٣,٠٢ | (-٠,٩٧)<br>-٠,٣٨ | ٠,٣٤ | ٢,٤٣ |
| ١٩٦٦ | ١٩٨٩ | ٢٤ | (-١,٣٣)<br>-٠,١٩ | (١,١٣)<br>٠,٨٤ | (١,٢٩)<br>١٢,٨٠ | (-٠,٩٥)<br>-٠.٣٨ | ٠,٣٤ | ٢,٤٨ |

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٦٧ | ١٩٩٠ | ٢٤ | (-٠,٧٦)<br>-٠,٠٧ | (١,٧٢)<br>٠,٩٠ | (١,٣٧)<br>٩,٦٤ | (-٠,٨٧)<br>-٠,٢٥ | ٠,٤٨ | ٤,٥٥ |
| ١٩٦٨ | ١٩٩١ | ٢٤ | (-١,٧٣)<br>-٠,١٦ | (١,٧٥)<br>٠,٨٧ | (١,٣٨)<br>٩,١٨ | (-٠,٨٤)<br>-٠,٢٣ | ٠,٥٢ | ٥,٢٣ |
| ١٩٦٩ | ١٩٩٢ | ٢٤ | (-١,٠٨)<br>-٠,٠٩ | (٢,٠٩)<br>٠,٩٩ | (١,٣٣)<br>٧,٧٩ | (-٠,٦٩)<br>-٠,١٨ | ٠,٥٣ | ٥,٢٨ |
| ١٩٧٠ | ١٩٩٣ | ٢٤ | (-٠,٨٣)<br>-٠,٠٧ | (١,٤١)<br>٠,٧٣ | (١,٤٧)<br>٩,٥١ | (-٠,٩٧)<br>-٠,٢٥ | ٠,٤٦ | ٤,١٥ |

**تێبینی: ئامارەکانی F خەتیان بەژێردا هاتوە لەئاستی ٥٪ یان کەمتر مانادارن. ئەوانی‌تر لەئاستی ١٠٪ دا مانادار دەبن.**

## وێنەی ژمارە ١

## ڕەوتی خەرجی‌یە سەربازی‌یەکانی تورکیا لەسەرچاوە داتا جیاجیاکانەوە




Sources.IISS,Military Balance(Various Years), NATO Review(Various Years), SIPRI Yearbook 1995, IMF-GFS Yearbooks( Various Years), Ministry of Finance (1993,1995)

# تەوەری یەکەم

# رابونی نەتەوەیی‌ی کورد لەتورکیا

# ١٩٤٥-١٩٩٠

مستەفا ئیبراهیم

رابونی نەتەوەیی‌ی کورد لەتورکیا سەربهوردەیەکی دورو درێژی هەیە. بەدرێژایی‌ی مێژوی مۆدێرنی تورکیا تا ئەم دوایی‌یە، کورد مافی سیاسی‌و دەستوریی دانپێدانراوی نەبوەو لەبەر چەندین هۆ کە گرنگترینیان پەیوەندییان بەئایدیۆلۆژیاو مێژوو و ئاسایشەوە هەیە، کاربەدەستانی تورك بەئەوپەڕی هەستیارییەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ مەسەلەی کورددا کردوە[1].

تورکەکان پاش هەوڵو تەقەللایەکی زۆر توانییان دەسەلاتی خۆیان بەسەر کوردستاندا بسەپێنن. بەم پێیە لەساڵی ١٩٢٥ بەدواوە تورکەکان کارێکی وایان کرد کوردستان بەتەواوەتی لەجیهان دابڕێ، بۆیە تا ئێستا روداوەکانی ماوەی نێوان ١٩٢٥-١٩٤٠ بەتەمومژاوی ماونەتەوە. دکتۆر عەزیز شەمزینی لەکتێبەکەیدا ((جولانەوەی رزگاریی نیشتمانیی کوردستان)) باس لەساڵی ١٩٣٧ دەکا کەدوایین جولانەوەی کوردی لەدژی تورکیا لەناوچەی دەرسیم تێدا رویدا[2]. تورکەکان ناوی دەرسیمیان گۆڕی‌و

---

[1] رێناس صمد، تطورات المسألة الكردية في تركيا، مجلة شؤون تركية، العدد ٤، مركز كردستان للدراسات الاستراتيجية، السليمانية، ٢٠٠٠، ص ٨.

[2] دکتۆر عەزیز شەمزینی، جولانەوەی رزگاریی نیشتمانیی کوردستان، وەرگێڕانی فەرید ئەسەسەرد، چاپی سێیەم، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، سلێمانی، ١٩٩٨، ل ٧٤.

کردیان بەتوندی و هێزێکی زۆریان بەسەرکردایەتیی جەنراڵ عەبدوڵڵا ئالب دوغان بۆ ناوچەکە ناردو کەوتنە سەرکوت کردنی دانیشتوان، پاش ئەوەی جوڵانەوەکە دامرکایەوە، وەزیری ناوخۆی تورک جەلال بەگ بەحکومەتی راگەیاند کە لەمڕۆ بەدواوە شتێك نیە ناوی مەسەلەی کورد بێ[3]. بەلام سەرەڕای ئەوە، هەندێ زانیاری ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە لەکۆتاییی سالی ۱۹٤۰دا لەچەندین شوێنی کوردستاندا راپەڕین لەدژی تورکەکان هەلایساوە[4].

سەرەڕای هەمو شتێك ئەنکەرە نەیتوانی کورد بەتەواوەتی لەڕوداوەکانی ناوچەکانی تری کوردستان دابڕێ‌و ژمارەیەك لەکوردپەروەرەکان بۆیان هەلکەوت پەیوەندی لەگەل کۆمەلەی ژێ کافی کوردستانی ئێران‌و حزبی هیوای کوردستانی عیراقدا دروست بکەن‌و لەئابی سالی ۱۹٤٤دا لەسەر سنوری نێوان تورکیاو ئێران نوێنەرانی هەر سێ پارچەکەی کوردستان بەنهێنی کۆنفرەنسێکیان بۆ یەکخستنی خەباتی کورد ساز کرد. بەلام بەدرێژاییی سالەکانی جەنگی دووەمی جیهان، کوردەکانی تورکیا نەیانتوانی هیچ جوڵانەوەیەکی چەکدار رێك بخەن[5].

لەسەردەمی عیسمەت ئینونودا تورکیا درێژەی بەسیاسەتی تواندنەوەی کورد داو لەم رەوتەدا حکومەتی تورك جگە لەنەسەلماندنی هیچ مافێکی سیاسی بۆ کورد، قسەکردن‌و گۆرانی وتنی بەزمانی کوردی قەدەغە کردو

---

[3] جليلي جليل واخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، ترجمة د. عبدي حاجي، دار الرازي، بيروت، ١٩٩٢، صص ١٨٠-١٨١.

[4] ديفيد مكدول، تاريخ الاكراد الحديث، ترجمة راج آل محمد، دار الفارابي، بيروت، ٢٠٠٤، ص ٥٩١.

[5] جليلي جليل وآخرون، المصدر السابق، ص ٢١٠.

لەئەنجامدا هەمو ئەم هەنگاوانە کوردیان کرد بەهاوولاتیی پلە دوو[6]. هەر لەم بوارەدا رۆژنامەی سۆن پۆستا لەژمارەی رۆژی ١١ی نیسانی ١٩٤٦دا وەك گوزارشتێك لەڕای فەرمیی دامودەزگا حوکمڕانەکان بلاوی کردەوە کە ((تورکیا هیچ کەمینەیەکی لێ نەبوە، نە کوردی چادرنشینو نە نیشتەجێ، نە خاوەنی هۆشیاریی نەتەوەییو نە بێهۆشیاریی نەتەوەییی))[7]. هەرچەند تورکیا لەهەولّی ئەوەدا بوو کەجیاوازیی ئابوریو رۆشنبیری لەنێوان ناوچەکانی ولاتدا نەهێڵێ بەلام سیاسەتی پەیڕەوکراو بەرامبەر بەکورد هیچ گۆڕانی بەسەردا نەهاتو تا ماوەیەکی زۆر ناوچە کوردنشینەکانی بەدواکەوتویی بەجێ هێشت، ئەگەرچی کاربەدەستان پاش دامرکاندنەوەی هەر راپەڕینێکی کورد بەڵێنیان دەدا کەباری ژیانی ناوچەکان دەگۆڕنو دەرەبەگایەتی لەرەگو ریشەوە دەردێنن[8].

پێش هەلایسانی جەنگی دووەمی جیهان دو هەولّ لەسالانی ١٩٢٤و ١٩٣٠دا بۆ دیموکراتیزەکردنی تورکیاو کردنی بەولاتێکی خاوەن حزبی بەرهەلّستکار بەرێوە چوو بەلام هەردوو هەولّەکە زۆریان نەخایاند، زوو پوکانەوەو ولات تا سالّی چلەکان وەك ولاتێکی خاوەن سستمی تاك حزبی مایەوە[9]. بەلام سستمی تاك حزبی لەتورکیا درێژەی نەکێشاو لەناوخۆی پارتی کۆمارخوازی گەلدا کەسانێك کە لەمێژوی سیاسیی تورکیادا ناسراو

---

[6] یوسف ابراهیم الجهماني، اوج الان ترکیا والاکراد، دار حوران للطباعة والنشر والتوزیع، دمشق، ١٩٩٩، ص ٣٤.

[7] دیفید ماکدول، المصدر السابق، ص ٥٩١.

[8] گیسارۆڤو رگووشین، کوردی تورکیا، وەرگێڕانی جەلال تەقی، وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ٨٩.

[9] ارغون اوزبیودن، النخبة السیاسیة والثقافة الدیمقرطیة السیاسیة في ترکیا، فصل من کتاب: مصادر الدیمقراطیة ثقافة المجموع ام دور النخبة، اعداد لاری دایموند، ترجمة سمیة فلو عبود، دار الساقي، بیروت، ١٩٩٤، ص ١٢٧.

بون، لەوانە جەلال بایار کە لەسەردەمی مستەفا کەمالدا سەرەك وەزیرانو لایەنگری رژێمی لیبرالی دیموکرات بوو، لەگەڵ فوات کوپرلولەر، عەدنان مەندرێسو رەفیق کۆرال، راپۆرتێکیان دایە دەست گروپی پارتی کۆمارخوازو باسی ئەوەیان تێدا کرد کەکاتی پەرینەوە بەرەو رژێمی فرە حزبی لەتورکیا هاتوەو پێویستە دەوڵەت رێ بۆ ئەم مەسەلەیە خۆش بکات[10]. بەمجۆرە رژێمی حوکمڕان کەوتە داوی قەیرانێکی دژوارەوە.

ساڵی ١٩٤٦ ئەو ئەندامانەی کە لەپارتی کۆمارخوازی گەل جیا بونەوە، پارتی دیموکراتیان پێك هێناو لێرە بەدواوە سەردەمی فرە حزبی لەتورکیا دەستی پێ کرد. لەهەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٠دا پارتی دیموکرات لەپرۆپاگەندەی هەڵبژاردندا کەوتە لێدانی بالۆرەی سەلماندنی بڕێکی زۆرتری مافە دیموکراتییەکانو لەو هەڵبژاردنەدا کوردەکان دەنگیان دایە پارتی دیموکرات (جەلال بایار-عەدنان مەندرێس) کەبەڵێنی دابوو مافی یەکسان بۆ کورد بسەلمێنێو پەرە بەئابوریی ناوچە کوردنشینەکان بدات بەلاّم ئەم حزبە پاش ئەوەی گەیشتە دەسەلاّت هیچ یەکێ لەو بەڵێنانەی جێبەجێ نەکرد[11].

لەراستیدا لەنێو کورددا پارتی کۆمارخوازی گەل حزبێکی خۆشەویست نەبوو، ئەویش هەم لەڕوی ئاینییەوەو هەم لەڕوی نەتەوەییەوە. هەمو ئەو کوردانەی لەژێر فاکتەری ئایندا بون بەو جۆرە سەیری پارتی کۆمارخوازیان دەکرد کەحزبێکە تورکیای لەئیسلام دور خستۆتەوە، خەلافەتی هەڵوەشاندۆتەوەو تەریقەتە سۆفییەکانی سەرکوت کردوەو خوێندنگە

[10] ئەیوب ئەمیر کەواسمی، پەڕینەوە لەسستەمی تاکە حزبەوە بۆ سستەمی فرە حزبی لەتورکیا، وەرگێڕانی ئەبوبەکر خۆشناو، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە ٢، ساڵی چوارەم، ١٩٩٥، ل ٩٥.

[11] یوسف ابراهیم الجهماني، اوج الان ترکیا والاکراد، المصدر السابق، ص ٣٦.

ئایینی‌یەکانی داخستوە. هەمو کوردە ناسیۆنالیستەکانیش بەگومانەوە سەیری نیازو مەرامەکانی ئەو حزبەیان دەکرد کەنکوڵیی لەبونی کورد کردوەو زمان‌و جل‌وبەرگ‌و کەلتوری کوردیی قەدەغە کردوەو بەزۆرو بەزەبری زۆردارەکی راپەڕینەکانی کوردی داپڵۆسیوە. بۆیە کاتێك تورکیا بەرەو دیموکراسی هەنگاوی نا، کورد بەپشتیوانی کردن لەپارتی بەرهەڵستکار ویستی تۆڵەی خۆی لەپارتی کۆمارخواز بکاتەوەو هەر بەهۆی پشتگیریی کوردەوە، پارتی کۆمارخواز دۆڕاو پارتی دیموکرات هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٠ی بردەوە.

بەدی هێنانی دیموکراسیی راستەقینە کارێکی ئاسان نەبو. سێ گیروگرفتی بنچینەیی هاتنە بەردەم حکومەت‌و بونە مایەی پەرەسەندنی ململانێی دژوار لەنێوان حکومەت‌و پارتی کۆمار خوازی گەل کەلەو سەردەمەدا، بەهۆی دەرنەچونی لەهەڵبژاردن، لەسەنگەری بەرهەڵستکاریدا بو[12]: یەکەم گیروگرفت پەیوەندیی بەئابورییەوە هەبو چونکە پارتی دیموکرات بەڵێنی دابو بەرنامەیەك بۆ چاککردنی ئابوری ئامادە بکات‌و ئابوری لەدەستێوەردانی دەوڵەت رزگار بکات. ئەگەرچی حکومەت لەسەرەتادا هەندێ سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەڵام لەسەرەنجامی دواییدا نەیتوانی کێشە بنەڕەتییەکانی ئابوریی تورکیا چارەسەر بکات.

دوەم گیروگرفت گیروگرفتی ئاین بو چونکە حکومەت بەوە تاوانبار کرا کەسیاسەتەکەی لەم روەوە بۆتە مایەی هەڵوەشاندنەوەی بنەما لائیکی‌یەکانی دەوڵەت. زۆری نەخایاند حکومەتی مەندریس خوێندنی ئاینی گێڕایەوە بۆ خوێندنگەکان‌و بودجەی کۆلیجی ئیلاهیاتی زیاد کردو

---

[12] استانفوردجی شاو و ازل کورال شاو، تاریخ امپراتوری عثمانی‌و ترکیه جدید ١٨٠٨-١٩٧٥، جلد دوم، ترجمه محمود رمضان زاده، معاونت فرهنگی آستان قدس، تهران، ١٣٧٠، صص ٦٧٥-٦٨٤.

مامۆستای زۆرتری بۆ دابین کرد. لەئاکامی ئەم تەگبیرانەدا رابەرە ئاینییەکان کەوتنە خۆ بۆ بەدەست هێنانەوەی ئەو دەسەڵاتەی کە بەهۆی ریفۆرمەکانی مستەفا کەمالەوە لەدەستیان دابوو. لەئەنجامی ئەو بارودۆخەدا کتێبو نامیلکەی ئاینی دیسان رەواجی پەیدا کردو هەندێ لەکتێب فرۆشییەکان بەتایبەت بۆ فرۆشتنی کتێبی ئاینی تەرخان کرانو تەنانەت بونە مەڵبەندی هەڵسوڕانو چوستو چالاکیی ئاینی.

سێیەم گیروگرفت کەدوچاری پارتی دیموکرات بۆوە گیروگرفتی ئازادیی سیاسی بوو. لەڕاستیدا پارتی دیموکراتو پارتی کۆمارخوازی گەل نەیاندەزانی چۆن بەشێوەیەکی شارستانییانەو بەهەست کردن بەلێپراسراوەتییەوە ململانێ بکەن. ئەم دوحزبە هێشتا لەهونەری هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ رای بەرامبەردا کۆڵەوار بون. بۆیە هەردوکیان زۆر بەتوندی وەڵامی یەکتریان دەدایەوەو بەسەختی ململانێیان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد.

ئەو پەرەسەندنە ئابورییەی کە لەسەرەتای سالانی پەنجادا هاتە دیو رەخسانی هەلی لەبار بۆ دابین کردنی مۆرکێکی بازرگانی بۆ کشتوکاڵ، زۆر سودی بۆ تورکیا لێ کەوتەوەو بوە هۆی زیادبونی ناردەکانی بۆ دەرەوەی وڵات. هەر لەساڵی ١٩٥٠ بەدواوە روبەری چێنراو بەرێژەی ٥٠٪ زیاتر پەرەی سەندو لەماوەی سێ ساڵدا حکومەت ٣٥ هەزار ترەکتەری بۆ کشتوکاڵ دەستەبەر کرد بەڵام ئەم بوژانەوە کتوپڕە تەنها تاساڵی ١٩٥٣ بڕی کردو لێرە بەدواوە پەرەسەندنەکە لەشوێنی خۆی چەقیو لەوە زیاتر نەچوە پێش[١٣].

---

[١٣] نوبار هوفسبيان (المحرر)و فيروز احمد وأخرون، تركيا بين الصفوة البيروقراطية والحكم العسكري، ترجمة سامي الرزاز وعدنان بدر ومجدي عبدالهادي، مؤسسة الابحاث العربية، بيروت، ١٩٨٥، ص ٣٧.

لەگەڵ پەرینەوە بۆ سیستمی فرە حزبی، دەسەڵاتی شێخو ئاغاکان لەکوردستان پەرەی سەند چونکە سیستمی نوێی هەڵبژاردن بوە مایەی زیادکردنی رۆڵو گرنگیی دەنگدەران لەوانە دەنگدەرە کوردەکان کەزۆربەیان لەرِوی ئاینیو ئابورییەوە ملکەچی شێخو ئاغاکانی خۆیان بونو دەنگی دەنگدەرانی کورد بۆ ئەو پاڵێوراوە دەچو کەشێخو ئاغاکان پشتیوانییان لێ دەکرد. جگە لەوەش، ئەنکەرە بەلایەوە گرنگ بوو بایەخ بەدەرەبەگەکانی کورد بداتو ئەمەش زیادبونی سەنگی ئەو دەرەبەگانەی لەنێو کورددا لێ کەوتەوە[١٤].

پارتی دیموکرات بایەخێکی تایبەتی بەئابوریی کشتوکاڵ داو لەم بوارەدا ئاوی پاکی بۆ هەزاران گوند لەتورکیا دەستەبەر کردو بڕی پێویستی ئاوی بۆ ئاودێریکردنی روبەرێکی فراوانی زەوی دابین کرد. جگە لەوە، قەوارەی قەرزی کشتوکاڵی لەنیو ملیار لیرەوە لەساڵی ١٩٥٠دا بۆ ٢,٥ ملیار لیرە لەساڵی ١٩٦٠دا زیاد کردو بەشی زۆری ئەو قەرزانە بەر جوتیارە مامناوەنجیو گەورەکان کەوتن، لەکاتێکدا بەشی هەرە زۆری جوتیارە هەژارەکان تەنها ٣٠٠-٥٠٠ لیرەیان بەقەرز پێ درا. بەڵام ئەم تەگبیرانە بونە هۆی بەرزکردنەوەی ئاستی بەرهەم هێنان، بەتایبەتی سەبارەت بەهەندێ بەروبومی سەرەکی[١٥]. ئەم هەمو تەگبیرانە تا ئەندازەیەکی زۆر قازانجیان بۆ کورد لێ کەوتەوە چونکە بەهۆیانەوە کشتوکاڵ لەکوردستاندا بوژایەوەو ئەم بوژانەوەیە بنچینە کۆمەڵایەتییە-ئابورییەکەی رابونی نەتەوەییی کوردی لەساڵانی هەشتادا پێك هێنا[١٦].

---

[١٤] جليلي جليل وآخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، المصدر السابق، ص ٢١٣.

[١٥] فلاديمير ايفانوفيتش دانيلوف، الصراع السياسي في تركيا، ترجمة يوسف ابراهيم الجهماني، دار حوران للطباعة والنشر والتوزيع، دمشق، ١٩٩٦، ص ٢١-٢٢.

[١٦] ديفيد مكدول، المصدر السابق، ص ٥٩٧.

ئەو هەلومەرجەی بەهۆی سیاسەتی پارتی دیموکراتەوە هاتە دی، بەوە گەیشت کەدەرەبەگە کوردەکان بوژانەوەو جارێکی تر دەسەڵاتیان لەکوردستاندا پەیدا کردەوە. پاش هاتنە سەر کاری پارتی دیموکرات لەساڵی ١٩٥٠دا، رژێمی تازە پەیڕەویی لەسستمی تێکەڵاو (کەرتی گشتی-کەرتی تایبەت) کردو گرنگترین گۆڕان لەو قۆناغەدا جەخت کردن بوو لەسەر پەرەپێدانی ئابوری بەیارمەتیی سەرمایەی بیانی، بەتایبەتی لەبواری کشتوکاڵدا. لەسەر ئەم بناغەیە زەویدارەکان لەترسی یاسای ریفۆرمی زەوی پشتیوانییان لەپارتی دیموکرات کرد[١٧]. لەڕاستیشدا پارتی دیموکرات بەهۆی ئەو بەرنامەیەی کە لەکاتی هەڵبژاردندا بانگەشەی بۆ کردبوو لەوانە چاککردنی رێوبانو خوێندنگەکانو دابین کردنی قەرزی کشتوکاڵی، پشتگیریی توێژە لادێییەکانی بۆ خۆی مسۆگەر کرد[١٨]. لەساڵی ١٩٦٠دا، ئەنکەرە بۆ کزکردنی دەسەڵاتی زەویدارە کوردەکان چەند دەرەبەگێکی لەکوردستان دور خستەوەو رایگەیاند کەنیازێتی زەویو زار بەسەر جوتیاراندا دابەش بکات بەڵام هەموی ساڵێکی نەبرد دەرەبەگەکان گەڕانەوەو زەوییەکانیان وەرگرتەوە. ئەمەش بەڵگەی ئەوە بوو کەزەویدارە کوردەکان پەیوەندیی پتەویان لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتدا پەیدا کردووەو تێکەڵ بەدامودەزگای حوکمڕان بوون[١٩].

لەساڵانی شەستەکانو حەفتاکانیش ئاغاو شێخو زەویدارەکان رۆڵێکی کاریگەریان لەژیانی سیاسیو ئابوریی کوردستاندا هەبوو و ئەو ئاغاو

---

[١٧] الدكتور احمد نوري النعيمي، ظاهرة التعدد الحزبي في تركيا ١٩٤٥-١٩٨٠، بغداد، ١٩٨٩، ص ٥١.

[18] Joseph S. Szytiowicz, political change in Rural Turkey, op. cit., P. 142.

[١٩] ديفيد مكدول، المصدر السابق، صص ٥٩٨-٥٩٩.

شێخو زەویدارانە کەلایەنگرو پشتیوانی پارتی دیموکرات بون، پاش هەڵوەشانەوەی ئەو حزبە، زۆربەیان بونە لایەنگرو پشتیوانی پارتی عەدالەت کە لەشوباتی ساڵی ١٩٦١دا لەسەر دەستی جەنرال راغب کۆمۆش بالا دامەزراو دوای مردنی لەساڵی ١٩٦٤دا سلێمان دەمیریل سەرکردایەتیی حزبەکەی گرتە دەست. ئەم حزبە درێژەپێدانی ئەو پارتی دیموکراتە بوو کەئاغاو شێخو زەویدارە کوردەکان پشتیوانییان لێ دەکردو زۆربەی ئەندامەکانیشی لەکۆنە ئەندامەکانی پارتی دیموکراتی پێشو بون[٢٠].

## بەردەوام بونی سیاسەتی نکوڵی کردن لەبونی گەلی کورد

لەسەردەمی دیموکراسیشدا ئەنکەرە هەر درێژەی بەسیاسەتی دێرینەی خۆی دا کەبریتی بوو لەنکوڵی کردن لەبونی گیروگرفتی کورد. ئەنکەرە تەنها لەساڵی ٢٠٠٥دا لەسەر زاری سەرەك وەزیران رەجەب تەیب ئەردوغان بۆ یەکەم جار لەوەتەی کۆمار راگەیانراوە، دانی بەبونی گیروگرفتی کورددا نا، ئەویش وەك بەشێك لەپێداویستییەکانی بەدەست هێنانی مەرجەکانی بوون بەئەندام لەیەکێتیی ئەوروپا.

فیلیب برایس ئەندامی پەرلەمانی بریتانیا لەوتارێکدا کەساڵی ١٩٥٦ پاش سەردانی کوردستان بڵاوی کردۆتەوە، وتویەتی ((لەدورگەیەکدا لەدەریاچەی وان کەلاوەی دێرێکی کۆنی ئەرمەن هەیە کە تا ئەم دواییە کاربەدەستانی تورك رێیان بەبێگانەکان نەدەدا سەردانی بکەن چونکە نایانەوێ دان بەوەدا بنێن کەرۆژێك لەرۆژان ئەم ناوە هەندێ گەلی وەك ئەرمەنو کوردی لێ ژیاوە گوایە هەر چی لێرە ژیاوە هەمیشە تورك بوە. بەڵام ئەو کاربەدەستانە ئەمڕۆ دیدێکی ژیرانەتریان هەیە. ماوەیەك

---

[٢٠] الدكتور احمد نوري النعيمي، النظم السياسية في الشرق الاوسط (تركيا وايران)، الجزء الاول، كلية القانون والسياسة بجامعة بغداد، بغداد ١٩٨٧، ص ٦١.

لەمەوپێش هەندێ گروپی بیانی سەردانی ئەو دورگەیەیان کرد. لەگەڵ ئەوەشدا کاربەدەستانی تورك هەر وەك جاران هەڵسوکەوت لەگەڵ کوردەکاندا دەکەن. هەر چی ٤٠ ساڵ لەمەوبەر سەردانی تورکیای کردبێ دەزانێ کورد بەشێکی زۆری دانیشتوانی پێك هێناوە. کورد نەتەوەیەکی دێرینە کە لەناوچە شاخاوییە بڵندەکاندا دەژیو زمانی تایبەتی خۆی هەیەو هیچ شتێکی هاوبەشی (لەڕوی ئیتنیکییەوە) لەگەڵ تورکدا نیە. تائێستا لەسەرتاپای ئەو ناوچانەدا ئەو ژنانە دەبینرێن کەسەرپۆشی کوردانەو جلوبەرگی رەنگاورەنگی جوان بەکار دێنن. ئەم کوردانە ئەوانەن کەتورکەکان بە بەردەوامی لەهەوڵی تواندنەوەیان دان لەبۆتەی نەتەوەی تورکدا. پیاوانی کورد هەمان جلوبەرگی تورکەکان دەکەنە بەرو زۆربەشیان بەزمانی تورکی قسان دەکەن بەلاَم لەشەقامەکانی شاری وانو لەگوندەکاندا زمانی کوردی بەر گوێ دەکەوێ))[٢١].

لەساڵی ١٩٦٠دا کتێبەکەی محەمەد شەریف فرات ((ناوچەکانی رۆژهەلاَتو مێژوی ناوچەی وارتۆ)) سەرلەنوێ چاپ کرایەوەو بەتیراژێکی زۆر پەخش کرا. ئەم کتێبە یەکێ لەو کتێبانە بوو کەنکوڵیی لەبونی کورد دەکردو ریشەی کوردی دەبردەوە سەر تورکو دانی بەوەدا نەدەنا کەزمانێك بەناوی زمانی کوردییەوە هەیە، گوایە ئەوەی هەیە شێوە زارێکی زمانی تورکییە. فرات لەساڵی ١٩٤٨دا کتێبەکەی دانابوو و لەساڵی ١٩٦٠دا وەزارەتی رۆشنبیری بۆی چاپ کردەوەو بەخۆڕایی پەخشی کرد بەجۆرێك کەشوێن نەما ئەو کتێبەی نەگاتێ[٢٢]. سەرۆکی تورکیا، جەمال گورسیل،

---

[21]The Manchester Guardian, 29/12/1956, Garvan, Kurdistan: Divided Nation of the Middle East, p. 28.

[٢٢] اسماعيل بيشيكجي، كردستان مستعمرة دولية، ترجمة زهير عبدالملك، دار APEC للطباعة والنشر، سبانجا (السويد)، ١٩٩٨، ص ١٦٠.

ئەوەندە ئەم کتێبەی بەدڵ بوو خۆی پێشەکی‌یەکی بۆ چاپی دووەمی نوسـی. یـەکێ لـەو هۆیانـەی کـەوای کردبـوو کتێبەکـە جێـی رەزامـەندیی کاربەدەستانی تورك بێ ئەوە بوو کەکتێبەکە زۆر گوتەی قێزەوەن‌و ناشیرینی تێدا بوو وەك ((هەر کەسێك پێت بڵـێ تـۆ کـوردی، تفێـك لـەدەموچاوی بکە)). بەم شێوەیە وشەی کورد وەك جنێوو بۆ سـوکایەتی کـردن لەلایـەن شۆڤێنیستەکانەوە بەکار هات. لەهەمان کاتدا یاسای ژمارە ١٥٨٧ دەرچوو کە بەهۆیەوە پرۆسەی گۆڕینی ناوە کوردییەکان بۆ ناوی تورکی، زۆر پەرەی پێ درا ئەویش بەو بیانووەی کەگوایـە نـاوە کوردییـەکان بەگوتـەی دەزگـا رەسمییـەکانی تـورك ((لەگـەڵ کـەلتوری نیشـتمانی‌و بـەهاو داب‌و نەریتەکانماندا ویّك نایەنەوە))[٢٣].

## فاکتەرەکانی بوژانەوەی هۆشیاریی نەتەوەیی

سێ فاکتەری سەرەکی رۆڵێکی گرنگیان لەڕابونی نەتـەوەیی‌ی کـوردی تورکیا گێڕا. یەکەم فاکتەر کۆچی ناوخۆیی‌یـە. بـەپێی ئـەو زانیارییانـەی کەدێڤید ماکدوێل لەکتێبەکەیدا ((مێژووی مۆدێرنی کورد)) خستویەتییە بـەر دەسـت[٢٤]، سـەدان هـەزار کـورد لەبـەر پەرەسـەندنی بـەکارهێنانی مەکینەی کشتوکاڵ لەسـالانی پـەنجادا، ناوچـە لادێ نشـینەکانیان بـەجێ هێشـت‌و لەشـارەکاندا نیشـتەجێ بـون‌و ئـەو کۆچکەرانـە بـەڕێژەی ٢٥٪ لەناوچەکانی دەوروبەری دیاربەکر، بەڕێژەی ١٦٪ لەئەلازیك، بەڕێژەی ١٥٪ لەسـیرت‌و بـەڕێژەی ٨٪ لەئورفـە نیشـتەجێ بـون. ئیـتر بـەجۆرە ژمـارەی دانیشتوانی دیاربەکر لـەماوەی چـەند سـاڵێکدا لـە ٣٠ هـەزار کەسـەوە

---

[٢٣] میخائیل م. جونتر، تقالید السلطة المطلقة في ترکیـا، ترجمـة الدکتـور سـعید ابراهیـم خضر، مجلة شؤون ترکیة، العدد ٤، مرکز کردستان للدراسات الاستراتیجیة، السلیمانیة، ٢٠٠٠، ص ٢٢.

[٢٤] دیفید مکدول، المصدر السابق، صص ٦٠٠-٦٠١.

لەسییەکاندا، گەیشتە ئاستی دەوروبەری ٦٥ هەزار کەس لەساڵی ١٩٥٦داو ١٤٠ هەزار کەس لەساڵی ١٩٧٠داو ٤٠٠ هەزار کەس لەساڵی ١٩٩٠دا. لەنێو ئەو کۆچەرانەش کە لەناوچەکانی دەرەوەی کوردستان نیشتەجێ بون، دەوروبەری ٤١٪ یان چونە ئیستانبولو ١٨٪ چونە ئەنکەرە، لەکاتێکدا ١٥٪ چونە ئەدەنەو ٤٪ یش چونە ئیزمیر. ئیدی بەهۆی ئەم کۆچەوە کورد بەسەر پانتاییەکی فراواندا بڵاو بۆوەو ئەو شوێنانەش کەئەوان لێی نیشتەجێ بون، بونە کوانوو و مەڵبەندی بەجۆشو خرۆش بۆ کوردایەتی کردن، جگە لەوەی کەئەو کۆچکەرانە لەو شوێنانەدا ئاستی رۆشنبیرییان بەرز بۆوەو ئاشنایەتیشیان لەگەڵ بیروباوەڕی چەپگەرایی‌دا پەیدا کرد.

ئەم کۆچە ناوخۆیی‌یەی کورد جگە لەوەی کەهەندێ هۆی تایبەتی هەیە کەپەیوەندیی بەهەلومەرجی کوردستانەوە هەیە، دیاردەیەکی گشتی‌یە لەسەرانسەری تورکیا. لەساڵی ١٩٦٠دا رێژەی شارنشین لەچاو سەرجەمی دانیشتوان لەتورکیا ٣١.٩٢٪ بوو و رێژەی لادێ نشینەکانیش ٦٨,٠٨٪ بوو. بەڵام پاش ٣٠ساڵ رێژەکە بەجۆرەی لیٚ هات: شارنشین ٥٩,٠١٪و لادێ نشین ٤٠,٩٩. بەپێی ئەم ژمارە راگەیەنراوانە رێژەی شارنشین لەماوەی ٣٠ ساڵدا پەرەی سەندوەو رێژەی لادێ نشینەکانیش هاتۆتە خوار[٢٥].

فاکتەری دووەم پەرەسەندنی خەباتی دیموکراتی‌ی کورد بوو. لەساڵانی شەستداو لەگەرمەی پەرەسەندنی بیروڕای چەپگەرایی‌دا، جموجۆڵی کورد شوێنێکی گرنگی لەتورکیا بۆ خۆی دەستەبەر کردو خەباتێکی زۆر بۆ سەرلەنوێ بوژاندنەوەی ناسنامەی نەتەوەیی ئەنجام دراو,لەم بوارەدا چەندەها دروشم بانگەشەی بۆ کرا وەك ((ئەی هاوولاتیی دانیشتوی رۆژهەڵات

---

[٢٥] احمد فاضل، الضغط الديموغرافي في تركيا-الهجرة والتهجير، مجلة شؤون تركية، العدد ٢، مركز كردستان للدراسات الاستراتيجية، السليمانية، ١٩٩٨، ص ١٣.

(کوردستان) داوا بکه دان بەمافه رەواکانتدا بنرێ))، ((ئامانجه‌کان دەستەبەرکردنی یەکسانیو برایەتیو شادمانییە))، ((پێویستمان بەجەندرمە نیە، پێویستمان بەمامۆستایە))، ((خوێندنگەمان دەوێ نەك پۆلیسخانە))، ((هاوولاتیی رۆژهەلات (کوردستان) سەلماندنی مافه مرۆییو مەدەنییەکانی خۆی هەر بەدەست دێنێ))[٢٦].

هەروەها بەسود وەرگرتن لەکەشو هەوای دیموکراتییانه، رۆشنبیره کورده چەپەکان چەندەها یانەو کۆمەلەی کەلتورییان دروست کرد کەبونه ناوکێك بۆ پەیدابونی چینێکی سیاسی کوردیو هەر بۆ نمونه رێکخراوی شۆرشگێری کەلتوری کورد (دەدەقۆ) کە لەشەستەکاندا دامەزراو رێکخراوی شۆرشگێری دیموکراتی رۆشنبیری (دەدەقەدە) کە لەسالی ١٩٧١دا دامەزرا، بونه بنچینەی فیکریو کەلتوریی هەمو ئەو بیروباوەرە سیاسییەی کەدواتر حزبه کوردییەکان لەسەر بنەماکەی دامەزران[٢٧].

لەم مەیدانەدا چەندەها گۆڤارو بلاوکراوه رۆلی گرنگیان هەبو لەپەرەپێدانی هۆشیاریی نەتەوەیی‌دا وەك گۆڤاری ئیلەری یورت ileri yurt که لەسالی ١٩٥٨دا لەدیاربەکر دەرچو، گۆڤاری سلڤانین سەسی silvanin sesi (دەنگی سیلڤان) لەسالی ١٩٦٢دا لەسیلڤان، گۆڤاری دجله-فورات لەسالی ١٩٦٢دا لەئیستانبول، گۆڤاری ((دەنگ))و ((رۆژا نوو)) لەسالی ١٩٦٣داو گۆڤاری یەنی ئاکس yeni akis لەسالی ١٩٦٤دا لەئەنکەرەو گۆڤاری seresiyar لەسالی ١٩٧٠دا لەدۆغۆ بایەزید[٢٨].

فاکتەری سێیەم کەزیاتر دکتۆر بێشکچی سەرنجی بەلادا راکێشاوه، خوێندنگه ئاینییە نادەولەتییەکانە. ئەو خوێندنگایانه رۆلێکی گەورەیان

---

[٢٦] یوسف ابراهیم الجهمانی، اوج الان ترکیا والاکراد، ص ٣٨.

[٢٧] یوسف کوران، الجذور الاجتماعیة للصراع بین النخب السیاسیة في ترکیا، مجلة شؤون ترکیة، العدد ٢، مرکز کردستان للدراسات الاستراتیجیة، السلیمانیة، ١٩٩٨، ص ١٦.

[٢٨] اسماعیل بیشیکجی، المصدر السابق، ص ٧٧.

لەپەرەپێدانی هۆشیاریی نەتەوەییدا گێڕا چونکە مەلاکان پەیوەندیی پتەویان بەخەڵکەوە هەبوو. کاتێك حکومەتی تورکیا پەی بەو رۆڵە برد کەئەو مەلایانە لەم بوارەدا دەیانگێڕا، لەسەرەتای ساڵانی حەفتادا خوێندنگەکانی داخست بەتایبەتی پاش کودەتای ١٢ی ئازاری ١٩٧١. هۆی پەرەسەندنی هۆشیاریی نەتەوەیی‌ی پیاوانی ئاین بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کەخوێندن لەخوێندنگە ئاینی‌یەکاندا بەزمانی کوردی بوو و جگە لەوەی کەئاینیان تێدا بەکوردی دەخوێند، مێژوو و وێژەی کوردیشیان تێدا دەخوێند[٢٩]. ئیدی لەگەڵ پەرەسەندنی هۆشیاریی نەتەوەییدا، پەیتا پەیتا سەنگەری خەبات جێی هەمو ئەو گروپانەی کۆمەڵی تێدا بۆوە کەهەستیان دەکرد لەوڵاتێکدا دەژین کەتێیدا هاووڵاتیی پلە دوون.

## زیندوبونەوەی ناسنامەی نەتەوەیی

لەساڵی ١٩٦١دا لەسۆنگەی چەند فاکتەرێکەوە لەوانە پێشهاتە سیاسییەکانی عیراق پاش روخانی رژێمی پاشایەتی‌و کودەتاکەی ساڵی ١٩٦٠ی تورکیاو دەرچونی کتێبەکەی شەریف فرات کەخودی سەرۆك جەمال گورسیل پشتیوانیی لەبۆچونە شۆڤێنی‌یەکانی کردبوو، لەمانگی ئایاردا هاوکات لەگەڵ دادگایی کردنی ٤٩ خوێندکاری کورددا، خۆپیشاندانی فراوان شارەکانی ماردین، دەیکر، سیڤەرك، دیاربەکر، بتلیس‌و وانی گرتەوە. دروشمە بەرزکراوەکانی خۆپیشاندەران گوزارشتیان لەگەشەسەندنی هۆشیاریی نەتەوەیی‌ی کورد دەکردو بریتی بون لە ((ئێمە کوردین تورك نین))و ((مردن بۆ گورسل، مردن بۆ مەندرس، مردن بۆ ئینۆنۆ))و ((دەبێ حکومەتی تورکیا مافە نەتەوەیی‌یەکانمان بەشێوەیەکی فەرمی بناسێنێ)). لەئاکامی ئەو خۆپیشاندانانەدا «لەماردین ١٢١ کەس

---

[٢٩] اسماعيل بيشيكجي، المصدر السابق، ص ٢٤٥.

کوژران‌و ٣٥٤ بریندار بون‌و ژمارەی کوژراوەکان لەدیاریەکر گەیشــتە ١٩٤ کەس‌و سەرجەمی ژمارەی بریندارەکان ٢٠٠ کەسی تێپەڕاند بەڵام لە ١٣ی ئایاردا جەنرال گورسیل دانی بەکوژرانی تەنها ١٤٠ کەس‌دا نا[٣٠].

لەهەلومــەرجی ناوەڕاسـتی ســاڵانی شەســتدا پــارتی دیموکراتـــی کوردستانی تورکیا دروســت بــوو و توانــی پەیوەندییــەکانی خــۆی لەگــەڵ پارچەکانی تری کوردستان، بەتایبەتی کوردستانی عیراق، پەرە پێ بدا. ئەم حزبە رۆڵێکی سەرەکیی لەخەباتی کــوردی تورکیــادا نــەگێڕا[٣١] بــەڵام وەك حزبێکی نــهێنی کەوتــە نواندنــی چـالاکی‌و لــەم بـوارەدا بــەدی هێنــانی ئۆتۆنۆمــی‌ی لــەچوارچێوەی تورکیــا کــردە ســەرەکیترین ئامــانجی خــۆی‌و لەدواییدا توانی پەرە بەهەندێ لەبۆچونەکانی خۆی بداو لەســاڵی ١٩٧٤دا پرۆگرامی حزبەکە کەوتە ئاماژەکردن بۆ ((پێکــهێنانی لەشـکری گــەل)) بەمەبەستی پاك کردنەوەی ناوچــە کوردنشـینەکان لــەهێزە چــەکدارەکانی تورکیــاو ((دامــەزراندنی دەســـەڵاتی دیموکراتـــی گـــەل))[٣٢]. ئەمـــەش بیرکردنەوەیــەکی ســەرەتایی بــوو لەئەگــەری بــەرپاکردنی جوڵانەوەیـــەکی چەکدار لەناوچە کوردنشینەکانی تورکیا.

پــارتی دیموکراتــی کوردســـتانی تورکیـــا هیـــچ رۆژنامەیـــەکی وەك ئۆرگانێکی ناوەندی نەبوو بەڵام دەکرێ لـــەرێی هــەندێ لــەو بڵاوکراوانــەی کەدەری کردون، پرۆگرام‌و بۆچون‌و دیدە سیاسییەکانی هەڵبسەنگێنرێن[٣٣].

---

[٣٠] درك كينان، كردهـا وكردسـتان، ترجمـه ابراهيـم يونسـى، مؤسسـه انتشـارات نگـاه، تهران، ١٣٧٢، ص ٩٠.

[٣١] ديفيد مكدول، المصدر السابق، ص ٦٠٩.

[٣٢] يوسف ابراهيم الجهماني، اوج الان تركيا والاكراد، المصدر السابق، صص ٤٠-٤٣.

[٣٣] جليلي جليل وآخرون، المصدر السابق، ص ٢٦٢.

پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا لەسەر مۆدێلێ پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق بەسەرۆکایەتیی مەلا مستەفا بارزانی دامەزرا بوو و سەرکردایەتیو دیدە سیاسییەکانی لە ئاستی گەشەکردنی کۆمەڵایەتیو ئابورییو سیاسیی ئەوسای کوردستانی تورکیا بوو و زۆربەی بۆچونەکانی بۆچونی نەتەوەیی-پارێزگار بون. لەروی کۆمەڵایەتییەوە زۆربەی سەرکردەکانی ئەم حزبە لەئاغاکانو زەویداران بون. دامەزرانی ئەم حزبە بۆ ساڵی ١٩٦٥ لەسەر دەستی فایق بووجاق دەگەڕێتەوە کەیەکێ لەئاغا گەورەکانی ناوچەی سیڤەرك بوو. پاش هەشت مانگی لەدامەزراندنی حزبەکە، هێزەکانی ئاسایشی تورکیا لەپلانێکی دارێژراودا توانییان دامەزرێنەری حزبەکە بدەنە بەر دەستڕێژی گوللەو بیکوژن. پاش ئەو، سەعید ئالچی سەرکردایەتیی حزبەکەی کرد. لەساڵی ١٩٧٠دا ناکۆکییەکانی ناو حزبەکە گەیشتنە لوتکە بەتایبەتی کەلەنێو حزبەکەدا بازوویەکی چەپگەرای بەهێز بەسەرۆکایەتیی سەعید قرمزیتۆپراق، ناسراو بەدکتۆر شڤان، سەرنجی بەلای خۆیدا رادەکێشا. لەو ساڵەدا دکتۆر شڤان لەشاری زاخۆ جیابونەوەی خۆی لەپارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا راگەیاندو پارتی دیموکراتی چەپی کوردستانی تورکیای دامەزراند. لەساڵی ١٩٧١دا سەعید ئالچی لەهەلومەرجێکی پڕ تەمومژدا لەکوردستانی عیراق تیرۆر کراو ئۆباڵی تیرۆرکردنی خرایە ملی دکتۆر شڤانەوەو لەم سۆنگەیەوە دکتۆر شڤانیش بەفەرمانی مەلا مستەفا بارزانی کوژرا. بەمجۆر، پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا ئەگەرچی تا کۆتاییی ساڵانی حەفتاش درێژەی بەچالاکییەکانی خۆی دا، بەلام بەکردەوە پاش کوژرانی سەعید ئالچیو دکتۆر شڤان کەوتە پەلەقاژەوە[٣٤]. دواتر لەباڵەکەی دکتۆر

---

[٣٤] دیفید مکدول، المصدر السابق، ص ٦٠٩.

شڤان حزبێکی نوێ بەناوی پارتی کارگەرانی کوردستانەوە پێك هات‌و لەدواییدا، پاش دامەزراندنی پارتی کارگەرانی کوردستان لەسەر دەستی عەبدوڵڵا ئۆجەلان‌و بۆ ئەوەی هەردو ناو تێکەڵ بەیەکتری نەبن، باڵەکەی دکتۆر شڤان ناوی حزبەکەی کردە پارتی پێشەنگی کرێکارانی تورکیا.

لەم سەروبەندەدا تورکیا پاش کودەتای ساڵی ۱۹٦۰ بەرەو گۆڕانکاری دەڕۆیی. کۆمیتەی یەکێتیی نەتەوەیی کەسەرکردایەتیی کودەتاکەی کردبوو چەندەها بۆچونی جیاوازی لەخۆ گرتبوو بەڵام ئەو بۆچونە زۆر بەهێز بوو کەپشتگیریی لەگەڕانەوە بۆ سەر دیموکراسیی دەکرد. بەم پێیە ئەرکی نوسینی دەستور بەچەند پرۆفیسۆرێکی ئیستانبول سپێردرا بەسەرۆکایەتیی ئۆنار. لەبەر ئەوەی ئەم ئەرکە لەسایەی کۆنترۆلی جەنراڵەکانی سوپادا بەڕێوە دەچو، پێشنوسە پەسەندکراوەکە بەئەندازەی پێویست ئازادییە دیموکراتییەکانی نەسەلماندبوو. بەڵام دواتر کۆمیسیۆنێکی دیکە بەسەرۆکایەتیی پرۆفیسۆر ئەنوەر زیا کارال بۆ پێداچونەوە بەپرۆژەکە پێکهات‌و ئەو کۆمیسیۆنە زیاتر لەژێر کۆنترۆلی پارتی کۆمارخوازی گەلدا بوو و سەرەنجامەکە بەوە گەیشت کەپرۆژەکە کۆمەڵێك دەستکەوتی بەدەست هێنا کەپەسەندکردنیان دەبونە مایەی فراوان کردنی پانتاییی دیموکراسی وەك فراوان کردنی ماف‌و ئازادییەکان‌و دەستنیشان کردنی مافە ئابوریی‌و کۆمەڵایەتییەکان‌و سەلماندنی ئەوەی کەبونی حزبە سیاسییەکان بەشێکی جیانەکراوەی ژیانی سیاسیی دیموکراتییانە پێکدێنێ[٣٥]. دەستوری ساڵی ۱۹٦۱ یەکەم دەستور بوو لەمێژووی تورکیا کەدان بەحزبە چەپەکاندا بنێ[٣٦].

---

[٣٥] فلاديمير ايفانوفيتش دانيلوف، المصدر السابق، صص ١٣١-١٣٣.

[٣٦] الدكتور احمد نوري النعيمي، النظم السياسية في الشرق الاوسط (تركيا وايران)، المصدر السابق، ص ٨٧.

دەستوری ساڵی ١٩٦١ ئەگەرچی ئەویش وەکو دەستورەکەی پێشو رێـــی نەدەدا هیچ حزبێکی کۆمۆنیست لەتورکیا دابمەزرێ بەڵام بۆ یەکەمین جـــار لەمێژوی کۆماری تورکیا هێشتی حزبێکی سۆسیالیست دابمەزرێت. بەمجۆرە هەر هەمان ساڵ کەسانێك کە لەیەکێتیی سەندیکاکانی تورکیـــا (Turk-Is) جیا بووبوونەوە، پارتی کرێکارانی تورکیایان دامەزراند. ئەم حزبە پاش ئەوەی محەمەد عەلی ئیبار جڵەوی سەرکردایەتییەکەی گرتە دەســـت، توانـــی رۆڵێکی گرنگ لەژیانی چەپی تورکیادا بگێڕێ[٣٧]. بەڵام بەهۆی پەرەسەندنی رۆڵی کورد لەناو ئەو حزبەدا، بەتایبـــەتی لەســـاڵی ١٩٦٨ لـــەپاش ئـــەوەی تارق زیا ئاکنجیی بەڕەگەز کورد بوو بەسکرتێری گشتیی حزبەکەو محەمەد عەلی ئەسلانی بەڕەگەز کورد بوو بەســـەرۆکی حزبەکـــە، مەســـەلەی کـــورد شوێنێکی گرنگی لەسیاسەتی ناوخۆییی حزبەکەدا داگیر کرد.

لەساڵی ١٩٦٥دا پارتی کرێکارانی تورکیا توانـــی ١٥ ئـــەندامی خـــۆی بگەیەنێتە پەرلەمانو زۆربەی ئەوانەش کەدەنگیان پێ دا هەژارەکان بـــون، بەتایبەتی لەنێو کوردو عەلەوییەکاندا[٣٨]. لەکۆنگرەی چواری ئـــەو حزبـــەدا کە لەمانگی تشرینی یەکەمی ســـاڵی ١٩٧٠دا بەســـترا، حـــزب بەئاشـــکرا دانی بەبونی گەلی کورددا ناو لەبڕیارێکدا رایگەیاند کە:

-گەلی کورد لەرۆژهەڵاتی تورکیا هەیە.

-هەر لەسەرەتاوە دەسەڵاتی فاشیستی چینەکانی کاربەدەســـتی تورکیـــا بەرامبـــەر بەگـــەلی کـــورد پـــەیڕەوی لەسیاســـەتی زۆرداریو رەشـــەکوژیو تواندنەوە کردوە کەزۆر جار بەشکڵی کردەوەی خوێناویو فشار خۆی نواندوە.

-یەکێك لەهۆیەکانی ئەساسیی دواکەوتوویی ئـــەو ناوچەیـــە کەگـــەلی کوردی تێدا دەژی لـــەچاو ناوچـــەکانیتر بێجگـــە لـــەقانوونی پەرەســـەندنی

---

[٣٧] نوبار هوفسبیان (المحرر) وفیروز احمد وأخرون، المصدر السابق، ص ١٦٣.

[٣٨] هەمان سەرچاوە، ل ١٦٥-١٦٦.

نارێکی سەرمایەداری سیاسەتی کۆمەڵایەتیو ئابووریی کاربەدەستانی چینەکانی حاکیمەیە کەئەوەیان لەبەرچاو بوە، لەم ناوچەیەدا گەلی کورد نیشتەجیێیە.

-جا لەبەر ئەوە دانانی ((گیروگرفتی رۆژهەڵات)) بەگیروگرفتێکی پەرەسەندنی ناوچەیی هیچ شتێکی تر نیە بێجگە لەدرێژە پێدان بەبیروباوەڕی شۆڤێنستی-ناسیۆنالیستی چینەکانی حاکم.

-پشتیوانیی حزبی ئێمە کەدوژمنێکی سەرسەختی رێبازی دژی دیموکراتی فاشیستی، زۆرداریو شۆڤێنی-ناسیۆنالیستییە لەخەباتی گەلی کورد بۆ کەلك وەرگرتن لەمافەکانی قانوونی هاونیشتمانیەتی خۆی وەبۆ هێنانەدیی ئاواتو داخوازە دیموکراتیەکانی خۆی ئەرکێکی شۆڕشگێڕی تەبیعیو پێویستە.

دەبێ سۆسیالیستەکانی کوردو تورك شان بەشانی یەکتر لەناو حزبدا تێبکۆشن بۆ ئەوەی خەبات بۆ دەربڕینو بەجێهێنانی ئاواتو داخوازەکانی دیموکراتی گەلی کورد لەگەڵ ئەو خەباتە کەچینی کرێکارو رێکخراوە پێشڕەوەکەی حزبەکەمان لەپێناوی شۆڕشی سۆسیالیستیدا دەیکا تێکەڵ بکرێو ببێ بەتاقە شەپۆلێکی شۆڕشگێڕ.

فرمانی لەناوبردنی بیروباوەڕی رەگەزپەرستی-ناسیۆنالیستی، شۆڤێنستیو بۆرژوازیی کە لەناو کۆڕو کۆمەڵی لایەنگری حزب، سۆسیالیستیو کرێکاریو لەنێو کۆمەڵانی زەحمەتکێشی تردا هەیە یەکێ لەئامانجەکانی هەرە بنەڕەتیو درێژخایەنی خەباتی ئایدیۆلۆژیكو پەرەسەندنی حزبەکەمانە.

حزب گیروگرفتی کورد لەروانگەی پێویستی‌یەکانی خەباتی شۆڕشگێڕی سۆسیالیستی چینی کرێکارەوە تەماشا دەکا[٣٩].

پاش کودەتاکەی ساڵی ١٩٧١ کەدووەم کودەتایە لـەمێژوی هاوچـەرخی تورکیـا، پـارتی کرێکـارانی تورکیـا لەلایـەن سـەرانی کودەتاکـەوە بەرێکخراوێکی نایاسایی دانراو قەدەغە کرا. بەڵام ئەمە رێی لـەوە نـەگرت کەگروپە چەپەکانی تر باشتر لەمەسەلەی کورد بگەن‌و پەیوەندی دۆسـتانە لەگەڵ گەلی کورددا دابمەزرێنن. لەم روەوە دەشێ بوترێ کە لەسـاڵی ١٩٧٠ بەولاوە لاوانی کورد لەتورکیا زۆر بەلای بیری چەپگەراییدا دایانشـکاند[٤٠]. بەڵام پێـش هەڵوەشـانەوەی پـارتی کرێکـارانی تورکیـا، بزاڤـە چەپـەکان لەپەرەسەندندا بون‌و تا دەهات ژمارەیان زیـادی دەکـردو لـەم روەوە سـاڵی ١٩٦٧و ١٩٦٩ بـەدو وێسـتگەی گرنگـی پەرەسـەندنی بزاڤـە چەپـەکان دەژمێردرێن.

لەسـاڵی ١٩٦٧دا یـەکێتیی کرێکـارە شۆڕشـگێڕەکان (دیسـک)وەك سەندیکایەکی سەربەخۆ بۆ کرێکارە چەپەکانی تورکیا دامـەزراو هـەروەها لەساڵی ١٩٦٩دا لەئەنجامی پەرەسەندنی چالاکیی یانەو کۆمەڵە چەپەکان یەکێتیی لاوانی شۆڕشگێڕ (دەڤ گەنج) دامەزرا. لەمێژوی بیری چەپگەرای تورکیادا بایەخی ئەو رێکخراوە لەوە دایـە کەریشـەی زۆربـەی هـەرە زۆری رێکخراوە چەپەکانی ساڵانی حەفتا دەچێتەوە سەر گروپی دەڤ گەنج.

---

[٣٩] دکتۆر عەبدولرەحمان قاسملو، کوردستان‌و کورد لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی‌و ئـابوری، وەرگێڕانی عەبدوڵلا حەسەن زادە، بلاوکراوەکـانی بنکـەی پێشـەوا، بـەغدا، ١٩٧٣، ل ٣٥٢-٣٥٣.

[٤٠] الدكتور احمد نـوري النعيمـي، ظـاهرة التعـدد الحزبـي في تركيـا ١٩٤٥-١٩٨٠، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٩٠، ص ٢٨٧.

دەڤ گەنج لەلایەك بزاوتێكی خوێندكاری بوو و لەلایەكی تـرەوە یەكێتییەكی شۆڕشگێڕ بوو[41]. بەشێوەیەكی گشتی، پەرەسەندنی بزوتنەوەی چەپ لەسالآنی شەست توخمێكی گرنگی ژیانی سیاسی توركیای پێكـهێنا بەرادەیەك كە لەدواییدا ترسی ئەنكەرە لەپەرەسەندنی بزوتنەوەی چەپی تورك‌و بزوتنەوەی نەتەوەیی‌ی كورد بوو بەمەراقێكی بەردەوام‌و لەم بارەیەوە دەشێ ئاماژە بۆ ئەوە بكرێ كەیەكێ لەهۆكانی كودەتای سالّی ١٩٧١ گەشەسەندنی بزوتنەوەی چەپگەرای توركیا بوو[42] كە تا دەهات كورد زیاتر پشتیوانیی لێ دەكرد، لەسالآنی شەستدا هێزی كار لەتوركیا پەرەی سەندو لەسالآنی ١٩٦٧ بەدواوە بەئەندامبونی كرێكاران لەسەندیكاكاندا گەشەسەندنێكی زۆری بەخۆوە بینی‌و بەپێی هەندێ ئامار لەماوەی نێوان ١٩٦٠-١٩٧٠دا ژمارەی ئەندامانی سەندیكاكان لەو ٢٥٠ كرێكارەوە گەیشتە پتر لەدوو ملیۆن كرێكار[43] كەبەشێكی زۆریان كورد بون.

روناكبیرە كوردەكان بەشدارییان لەهەڵسوڕانی ئایدیۆلۆژیی چەپگەرادا كرد. لەسالّی ١٩٦٧دا هەفتەنامەی ((ئانت)) لەئیستانبول دەرچوو كە لەروی ئایدیۆلۆژییەوە پشتگیریی لەبازووە هەرە رادیكالّەكەی پارتی كرێكارانی توركیا دەكردو یەكێ لەنوسەرە هەرە دیارەكانی ئەو هەفتەنامەیە رۆمانتوسی بەرەچەڵەك كورد یەشار كەمال بوو[44].

لەسالّی ١٩٦٧دا روداوێكی جێی سەرنج‌و بەبایەخ هاتە پێش كەئاماژەیەك بوو بۆ پەرەسەندنێكی بنەڕەتی لەرابونی نەتەوەیی‌ی كورددا. لەو سالّەدا هەندێ لەئەندامە كوردەكانی دیسك‌و پارتی كرێكارانی

---

[41] نوبار هوفسبيان (المحرر) وفيروز احمد وآخرون، المصدر السابق، ص ١٦٩.
[42] فلاديمير ايفانوفيتش دانيلوف، المصدر السابق، ص ١٧١.
[43] نوبار هوفسبيان (المحرر) وفيروز احمد وآخرون، المصدر السابق، ص ١٦٦.
[44] هەمان سەرچاوە، ل ١٦٧.

تورکیاو دەڤ گەنج گردبونەوەیەکی جـەماوەریی فراوانیـان لـە ١٠ هـەزار کەس لەسیلوانو لە ٢٥ هەزار کەس لەدیاربەکر ڕێکخسـتو ناڕەزایییـان بەرامبەر بەسیاسەتی حکومەت دەربـڕیو داوای مافـە دیموکراتییـەکانیان کرد[٤٥]. ئەم گردبونەوە فراوانـە ئاماژەیـەك بـوو بـۆ گواسـتنەوەی سـەنگی قورسایی‌ی خەباتی کورد لەلادێوە بۆ شارو گواستنەوەی جڵەوی رابەرایـەتی کردنی بزوتنەوەی نەتەوەیی لەدەستی شێخو ئاغاو زەویدارەکانەوە بۆ دەستی رۆشنبیرانی رادیکاڵو بورژوازیی شارەکان کـە بەشـێوەیەکی گشـتی زیـاتر بەلای بیروباوەڕی چەپگـەرادا دایاندەشـکاندو پـەیوەندیی پتـەویان لەگـەڵ چـەپی تورکـدا هـەبوو. دیـارە ئەمـــەش جگـــە لـــەوەی کەپـــەیوەندیی بەگەشەسەندنی بیری سیاسییەوە هەیە، هەروەها پەیوەندیی بەگەشـەکردنی شارەکانیشەوە هەیە. لەماوەی نێوان ١٩٦٠و ١٩٧٠دا ژمارەی دانیشـتوانی شارەکان گەیشتە پێنج ملیۆن کەسو ڕێژەی دانیشتوانی شـارەکان بـوو بـە ٣٩٪ی سەرجەمی دانیشتوانی ناوچە کوردنشینەکان[٤٦].

سەرکردەکانی بزاڤی نەتەوەیی‌ی کورد لەتورکیا بایـەخێکی تایبـەتیان بەزمانو کەلتوری کوردی داو لەم ڕووەوە بەشێکی زۆری ئـەدەبیاتی کـوردی بـەزمانی تورکـی بـلاو کرایـەوە. لەسـاڵی ١٩٦٨دا محەمـەد ئـەمین بـوز ئەرسەلان چیرۆکی مەمو زینی هۆزانڤانی گەورەی کـورد ئەحمـەدی خـانی‌ی وەرگێڕایە سەر زمانی تورکـیو لەهـەمان کـاتدا کتێبێکـی بـۆ فـێربونی ئەلفو بێی کوردی لەسەر مۆدێلی کتێبە تورکییەکان دەرکـرد بـەلام ئـەم کتێبە دەستی بەسەردا گیراو خودی دانەرەکەی درایـە دادگـا. لـەکۆتایی‌ی شەستەکاندا نەك هەر هۆشیاریی سیاسـی‌ی کـورد سـەقامگیریی بـەخۆوە

---

[٤٥] دیفید مکدول، المصدر السابق، ص ٦١١.

[٤٦] دكتور حامد محمود عيسى، القضيـة الكرديـة في تركيـا، مكتبـة مدبـولي، القـاهرة، ٢٠٠١، ص ٢٦٥.

بینی بەڵکو هۆشیاریی سیاسیش پەرەی سەند بەتایبەتی بیری چەپگەرا، بەڵگەش ژمارەی زۆری ئەو کەسانەیە کە لەساڵی ١٩٦٩دا بەشداربیان لەخۆپیشاندانەکاندا کرد بۆ داواکردنی مافە نەتەوەیی‌یەکان[٤٧].

لەساڵانی ١٩٦٩-١٩٧١ تورکیا دوچاری پشێوی‌یەکی دژوار بوو و لەم بارەیەوە ململانێیەکی سەخت لەنێوان گروپە ڕاستڕەوەکان‌و گروپە چەپەکاندا هاتە ئاراوە. لەو ماوەیەدا چەپ‌و ڕاست خۆی بۆ ڕووبەڕووبونەوە ئامادە کردبوو، لەم میانەشەدا کورد زیاتر بەلای چەپەکاندا دایدەشکاندو پەیوەندیی پتەوی لەگەڵیاندا هەبو.

لەناوەڕاستی شەستەکاندا یەکێ لەدڕترین گروپە ڕاستڕەوە تورکیستەکان لەسەر دەستی کۆلۆنیل ئالب ئەرسەلان تورکێش بەنێوی پارتی بزوتنەوەی نەتەوەیی‌یەوە دامەزرا. تورکێش یەکێ لەرابەرانی کودەتا خوێناوییەکەی ساڵی ١٩٦١ بوو. ئایدیۆلۆژیای حزبەکەی لەسەر بنەمای تۆرانیزم دامەزرابوو واتە دامەزراندنی یەك دەوڵەتی تورکیایی‌ی بەربلاو لەتورکەکانی تورکیاو تراکیا (یۆنان)و باکوری قوبرس‌و ناوەڕاستی ئاسیاو ئازەربایجانی باکورو ئازەربایجانی ئێران‌و تورکمانەکانی کەرکوك[٤٨]. بەلای تورکێش‌و حزبەکەیەوە ناکرێ چەپەکان بەتورك بژمێردرێن بەڵکو ئەوانە لەبەر داشکاندنیان بەلای بیروباوەڕی کۆمۆنیزم‌دا نیمچە تورکن، گوایە ئەوانەی نیمچە تورکن خۆیان بەتورك دادەنێن بەڵام ئەم تورکبونە دادیان نادا چونکە ڕیشەو ڕەچەڵەکیان ناچێتەوە سەر تورك، بۆیە ئەوانە هەمیشە بۆ خیانەت کردن لەڕەگەزی تورك لەبۆسەدان[٤٩].

---

[٤٧] هەمان سەرچاوە، ل ٢٦١.

[٤٨] مصطفى الزين، اتاتورك وخلفاؤه، دار الكلمة للنشر، بيروت، ١٩٨٢، ص ٣٠٢.

[٤٩] اندرو فنكل ونوكهت سيرمان، تركيا المجتمع والدولة، ترجمة د. حمدي حميد الدوري و د. عدنان ياسين مصطفى، بيت الحكمة، بغداد، ٢٠٠٢، ص ١١٥.

تورکێش بەشێوەیەکی سەرەکی کۆمۆنیزمو کوردی بەدوژمنی سەرەکی دەژمارد. لاوانی حزب پێیان دەگوترا گورگە بۆرەکانو لەسەر شێوەی گروپە فاشستە ئەوروپاییەکانی نێوان هەردو جەنگی جیهان مەشقی سەربازییان پێ دەکراو زانیارییەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کەتورکێش لەساڵی ١٩٤٥دا پەیوەندیی بەتینی لەگەڵ سەرکردە نازییەکانی ئەڵمانیادا هەبوە. تورکێش هەمیشە بەوە تۆمەتبار دەکرا کەکابرایەکی فاشستە بەلام ئەو بەو جۆرە بەرگریی لەخۆی دەکرد، دەیگوت ((ئەگەر یەکێك پێم بڵێ تۆ فاشستی، پارچە پارچەی دەکەم)). لەماوەی نێوان ١٩٦٨-١٩٦٩دا گروپەکانی گورگە بۆرەکان چەندەها چالاکیی چەکداریان لەدژی کوردو چەپەکان ئەنجامدا[50].

لەهەمان کاتدا بزوتنەوەی چەپ زۆر پەرەی سەندبوو و بەشێکی زۆری چەپەکان لەو ماوەیەدا لەلای گروپە فەلەستینییەکانی لوبنان مەشقی سەربازییان پێ کرابوو و تازە گەڕابونەوە بۆ تورکیاو بەنیاز بون هەندێ لەتیۆرییەکانی گیڤاراو ماوتسیتۆنگ لەناوخۆی تورکیا پراکتیزە بکەن.

لەکۆتاییی شەستەکاندا بەدەستپێشخەریی پارتی کرێکارانی تورکیا چەندین یانەی کەلتوری لەکوردستاندا دامەزرا کەژمارەی ئەندامانیان گەیشتە دەوروبەری ٢٠ هەزار ئەندام[51]، لەوانە یانەی شۆڕشگێڕی ڕۆشنبیریی ڕۆژهەلات (DDKO). بەرنامەی ئەو یانانە جگە لەوەی کەلایەنێکی سیاسیی هەبو، لایەنێکی کۆمەلایەتیشی هەبوو بۆ بەرزکردنەوەی هۆشیاریی جوتیارانو ژنانو بلاوکردنەوەی کەلتوری یەکسانیو ریفۆرمی کۆمەلایەتی. لەساڵی ١٩٧٠دا رابەرەکانی DDKO

---

[50] الدكتور احمد نوري النعيمي، ظاهرة التعدد الحزبي في تركيا ١٩٤٥-١٩٨٠، المصدر السابق، ص ٢١٥-٢١٦.

[51] الدكتور حامد محمود عيسى، القضية الكردية في تركيا، المصدر السابق، ص ٣٠٢.

گیرانو لەئیستانبولو دیاربەکر دادگایی کران. لەنێو گیراوەکاندا کەسانێکی دیار هەبون وەك موسا عەنتەر، سەعید ئالچی، تارق زیا ئاکنجیو ئیسماعیل بێشکچی.

لەساڵی ١٩٧١دا لەئاکامی تەشەنە سەندنی قەیرانی ناوخۆیی تورکیا، دیسان سوپا دەستی تێوەرداو دەسەڵاتی گرتە دەستو کەوتە وێزەی کوردو چەپەکان. لەدیاربەکر ٣٣ کەس بەتۆمەتی هەوڵدان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی دادگایی کرانو لەنیسانی هەمان ساڵدا یاسای سوپایی بەسەر ١١ پارێزگادا سەپێنراو سوپا دەوروبەری ٥ هەزار کەسی لەسەرانسەری تورکیادا دەستگیر کردو کەوتە ئەشکەنجەدانیان. لەم سەروبەندەشدا چەندان روناکبیری کورد گیران وەك تارق زیا ئاکنجی، جانیب ئیلدمیر، موسا عەنتەر، کەمال بورقای، ناجی قوتلای، مەهدی زانا، محەمەد ئەمین بوز ئەرسەلان، یوسف ئاکنجیو سەدانی تر. بەپێی زانیارییەکان هەر تەنها لەدیاربەکرو سیلفان ٤ هەزار کەس گیرا. جگە لەوەش لەئابی ساڵی ١٩٧٢دا دادگای سوپاییی دیاربەکر زانای کۆمەڵناسی گەورەی تورك ئیسماعیل بێشکچیی بەتۆمەتی کارکردن بۆ کۆمۆنیزمو کوردایەتی، سیانزە ساڵ زیندانی بەسەردا سەپاند[٥٢].

ساڵی ١٩٧٣ ئارامییەکی رێژەیی هاتە ئاراوەو یەکەم هەڵبژاردن پاش کودەتاکە بەرێوە چوو کەسەرەنجامەکەی بەسەرکەوتنی پارتی کۆمارخوازی گەل بەسەرۆکایەتیی بۆلەنت ئەجەوید کۆتایی هات. حزبەکەی ئەجەوید ٣٣,٣٪ی دەنگەکانو ١٨٥ کورسیی بەدەست هێنا بەڵام سەرەڕای ئەم سەرکەوتنە بەرچاوە، ئەم حزبە نەیتوانی ببێ بەحزبی زۆرینە چونکە پێویستی بە ٤١ کورسیی تر بوو تا بگا بەسەرکەوتنی رەها، بۆیە بەهۆی

---

[٥٢] هەمان سەرچاوە، ل ٢٦٨-٢٦٩.

ئەمەوە تەنگژەکەی تورکیا لەو قۆناغەشدا هەر درێژەی کێشاو[٥٣] ئەنکەرە هیچ شتێکی وای نیشان نەدا کەئاماژە بێ بۆ ئامادەبونی بۆ لاکردنەوە لەکوردو چارەسەرکردنی کێشەی کورد بەشێوەیەکی دیموکراتییانە.

لەئەنجامی ئەم هەلومەرجەدا کورد درێژەی بەچالاکییە سیاسییەکانی خۆی داو لەم بوارەدا لایەنگرانی دکتۆر شڤان درێژەیان بەچالاکییەکانیان داو ناوی حزبەکەیان کردە پارتی پێشەنگی کرێکارانی کوردستان (PPKK). ئەندامە کوردەکانی ناو پارتی کرێکارانی تورکیاش حزبێکیان بەناوی پارتی سۆسیالیستی کوردستانی تورکیا (پسکت) بەسەرۆکایەتی کەمال بورقای دامەزراندو گۆڤارێکیان بەناوی (ریا ئازادی)و رۆژنامەیەکیان بەناوی (رۆژا وەلات) دەرکرد. جگە لەوە بەشێکی تری چەپەکان حزبێکی تریان بەناوی پارتی رزگاری دامەزراند بەلام ئەم حزبە لەساڵی ١٩٧٨ گروپێکی لێ جیابۆوە کەئەندامەکانی حزبێکی تریان بەناوی ئالای رزگاری دروست کرد. گروپێکی تری چەپەکانیش رێکخراوێکیان بەناوی رێکخراوی کاوە دروست کرد کەسەرەتا پەیڕەویی لەماویزم دەکردو پاشان دەستبەرداری ئەم بیروباوەڕە بوو و چوە سەر بیروباوەڕی ئەنوەر خۆجەی سەرۆکی ئەلبانیا. لەهەموشیان بەناوبانگتر پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK) بوو کەوەك رێکخراوێکی مارکسیستی دامەزراو ئامانجەکەی سەربەخۆیی بوو[٥٤]. بەشێکی ئەو گروپانە، چەتری یاسایی‌یان بەشێوەی کۆمەڵەو یانەی رۆشنبیریی ئاشکرا بۆ خۆیان پێك هێنا بوو وەك دەدەقەدە واتە کۆمەڵەی روناکبیری دیموکراتی

---

[٥٣] فيروز احمد، صنع تركيا الحديثة، ترجمة سلمان داود الواسطي و د.حمدي حميد الدوري، بيت الحكمة، بغداد، ٢٠٠٠، ص ٣٥٧.

[٥٤] الدكتور حامد محمود عيسى، القضية الكردية في تركيا، المصدر السابق، صص ٢٩٧-٣٠٢.

شۆڕشگێڕ کەپەیوەندیی پتەوی لەگەڵ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا دروست کردبوو.

لەنیوەی دووەمی سالآنی هەشتادا پێکادانی نێوان گروپە ڕاستڕەوەکان (کەپێشەنگەکەیان میلیشیاکانی گروپی گورگە بۆرەکان بوو)و گروپە چەپەکان بەخەستی پەرەی سەند، جگە لەوە هێرش کرایە سەر عەلەوییەکانیش کەکەمینەیەکی ئایینین‌و لەڕوی رەگەزەوە بەسەر کوردو تورك‌و عەرەبەکاندا دابەش بون‌و زۆربەی سەرچاوەکان بەسێیەکی دانیشتوانی تورکیایان دادەنێن. عەلەوییە کوردەکان دەوروبەری ۳۰٪ی گەلی کوردو پێنج یەکی تەواوی عەلەوییەکانی تورکیا پێکدێنن[55]. عەلەوییەکان بەگشتی هەر لەسەرەتاوە پشتگیرییان لەعیلمانییەکان دەکردو هەر لەم روانگەیەشەوە لەکاتی هەڵبژاردندا دەنگیان بەپارتی کۆمارخوازی گەل داو بەهۆی ئەمەوە کەوتنە بەر نەفرەت‌و رق لێ هەڵگرتنی گورگە بۆرەکان کەعەلەوییەکانیان بەکۆمۆنیست دادەنا. یەکەم هێرش کەکرایە سەر عەلەوییەکان، لەساڵی ۱۹۷۸دا لەمەلاتیە ئەنجام دراو پاشان هێرش کرایە سەر عەلەوییەکانی سیواس‌و پاشان بنگول کەوالییەکەی سەر بەپارتی بزوتنەوەی نەتەوەیی تورکێش بوو و ڕێی بەمیلیشیاکانی گورگە بۆرەکان دا بەئارەزوی خۆیان بکەونە وێزەی عەلەوییەکانی ئەوێ[56].

لەم سەروبەندەدا لەساڵی ۱۹۷۹دا وەزیرێکی کورد کەناوی شەرەفەددین ئالچی بوو بەئاشکرا رایگەیاند کە ((کورد لەتورکیا هەیەو تەنانەت خودی خۆیشم کوردم)). ئیتر بەم راگەیاندنە ئازایانە هەرایەکی زۆری

---

[55] محمد نورالدين، تركيا الجمهورية الحائرة، مركز الدراسات الاستراتيجية والبحوث والتوثيق، بيروت، ۱۹۹۸، صص ٥٥-٥٦.

[56] فيروز احمد، المصدر السابق، ص ۳۸٦.

لەتورکیا نایەوەو لەدوایشیدا ئالچی درایە دادگاو لەسەر ئەم قسەیە بۆ ماوەی دوو ساڵو چوار مانگ زیندانی کرا[٥٧].

لەو هەراو جەنجاڵەدا لە ١٢ی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٠دا سوپا دیسان هاتەوە سەر شانۆو لەکودەتایەکدا دەسەڵاتی گرتەوە دەست. یەکێ لەهۆیە سەرەکییەکانی کودەتاکە، پەرەسەندنی بزاڤی کورد بوو و لەم بوارەدا جەنراڵەکانی سوپا خۆیان ئامادە کردبوو بەزەبری زۆردارەکیو بە بەکارهێنانی ئەوپەڕی هێزەوە مەسەلەی کورد سەرکوت بکەن. هەر بۆیە هەمو ویلایەتەکانی تورکیا خرانە بەر حوکمی هەرِەمەکیەوە بەڵام لەکاتێکدا حوکمی هەرِەمەکی لەناوچەکانی تردا هەڵوەشێنرایەوە، تا ماوەیەکی دورو درێژ لەناوچە کوردنشینەکان درێژەی کێشا.

مەترسیی دووەم بۆ سەر دەوڵەت، پەرەسەندنی بزوتنەوەی چەپ بوو کەداوای یەکسانیو دادی کۆمەڵایەتیو چارەسەرکردنی گرفتەکانی هەژاریو بێکاریی دەکرد، بەڵام جگە لەم دو فاکتەرە، فاکتەرێکی تریش چووبوە پاڵ ئەم دو فاکتەرەوە ئەویش ترسو دڵەڕاوکێ بوو لەپەرەسەندنی بزوتنەوەی ئیسلامگەرا کەپاش روخانی شای ئێران و هاتنە سەرکاری رژێمێکی ئیسلامگەرا لەئێراندا، پەیتا پەیتا باسکی ئەستورتر دەبوو. دەکرێ ئەوەش بەنمونە بهێنرێتەوە کەچەند رۆژێك پێش کودەتاکەی سوپا، لایەنگرانی پارتی سەلامەتی نیشتمان کەسەرۆکەکەی نەجمەددین ئەربەکان بوو، خۆپیشاندانی زلیان لەشاری قۆنیە رێکخستبوو و کەوتبونە سەرزەنشت کردنی عێلمانیەتەکەی مستەفا کەمال ئەتاتورکو هاواریان دەکرد ((تورکیا وڵاتێکی ئیسلامییە))[٥٨]. بەچاوپۆشین لەو خۆپیشاندانانە،

---

[٥٧] دیفید مکدول، المصدر السابق، ص ٦٢٠.

[٥٨] الدکتور ابراهیم خلیل احمد واخرون، ترکیا المعاصرة، مرکز الدراسات الترکیة، الموصل، ١٩٨٧، ص ١٨٠.

جەنراڵەکانی سوپا هەر لەسەرەتاوە بەگومانەوە دەیانڕوانییە بیروباوەڕەکانی پارتی سەلامەت کە لەسەرەتای دامەزراندنی‌یەوە خاوەنی دروشمی ئاینی بوو وەك بانگهێشت کردن بۆ هەڵوەشاندنەوەی رژێمی عیلمانیەت، کردنی ئیسلام بەئاینی فەرمیی دەوڵەت، کردنەوەی کەنیسەی ئایا سۆفیا بەمزگەوت بۆ بەبیرهێنانەوەی سەروەرییەکانی دەوڵەتی عوسمانی‌و یادکردنەوەی گرتنی شاری کۆستانتینبول لەساڵی ١٤٥٣ دا لەسەر دەستی سوڵتان محەمەدی فاتیح‌و چەندەها دروشمی ئاینی‌ی تر[٥٩].

دوا بەدوای کودەتاکە، دامودەزگا سوپایی‌یەکان کەوتنە شاڵاوێکی رەشبگیرو دەیان هەزار کوردیان گرت‌و راپێچی گرتوخانەکانیان کردن‌و لەوێ بەشێکی زۆریان خرانە ژێر ئەشکەنجەوە. سەدان کەس لەکاتی راوناندا کوژران‌و نزیکە ١٢٠ هەزاری تریش وەك گومانلێکراو خرانە ژێر چاودێرییەوەو داوایان لێ کرا شوێنەکانی خۆیان بەبێ پرسی سوپا بەجێ نەهێڵن. سەدان تێکۆشەریش لەزیندانی سوپایی‌ی دیاربەکر ئیعدام کران[٦٠].

لەم روەوە لێدوانێکی جەنرال کەنعان ئیڤرینی سەرۆکی کودەتاکە هەڵوێستی ئەم کودەتایە بەرامبەر بەکورد دەردەخا. ئیڤرین لەلێدوانێکدا بۆ گۆڤاری (دێرشبیگل) لە ١٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٨١دا وتی ((کورد لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانی‌و ئەتاتورکدا راپەڕینی سازکردوەو یاخی بووە. ئێمە لەبەردەم پلانێکی جەهەننەمی داین: هەر کات کۆماری تورکیا شپرزەو لاواز بوو، کوردەکان رادەپەڕن. ئەوانە دەیانەوێ بەکۆمەك‌و دەسگیرۆدەیی‌و یارمەتیی هێزە دەرەکییەکان تورکیا پارچە پارچە بکەن کورد خۆی لەمەلاس داوە بەڵام ئێمە هەرگیز لێ ناگەڕێین وڵات پارچە پارچە

---

[٥٩] مصطفى الزين، المصدر السابق، ص ٣١٦.

[٦٠] دكتور حامد محمود عيسى، المشكلة الكردية في الشرق الاوسط، مكتبة مدبولي، القاهرة، ١٩٩٢، ص ٣٧٩-٣٨٠.

بکەن. ئەوانە هیچیان لەئێمە چنگ ناکەوێ‌و ئێمە بەهەمو تواناوە کار بۆ ئەوە دەکەین کەئەم کێشەیە لەڕەگوریشەوە هەڵکێشین))[61].

لەسێیەم ساڵڕۆژی کودەتاکەدا چەند حزب‌و گروپێکی چەپ لەتورکیا کەبەشێکی زۆریان کورد بون بەیاننامەیەکی هاوبەشیان دەرکردو تێیدا داوایان کرد خەبات لەدژی ڕژێمەکە درێژەی پێ بدرێ تا لەناو دەبرێ. لەو گروپانە: ئاڵای رزگاری، پارتی شۆڕشگێڕ (دەورمجی ساواش)، ڕێگای شۆڕش (دەورمجی یۆل)، یەکێتیی کار (ئایین برلینی)، پارتی پێشەنگی کرێکارانی کوردستان(PPKK)، پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK)، بزوتنەوەی رزگاری کوردستان (کوک)، ڕێگای پارتیزانان (پارتیزان یۆل)، تێکۆشین، پارتی کاری کۆمۆنیستی تورکیا، پارتی کۆمۆنیستی تورکیا-یەکگرتن (TKPB)، پارتی سۆسیالیستی کوردستانی تورکیاو هی تر[62].

ئەو زەبروزەنگە زۆرەی کەکودەتاکەی ساڵی ١٩٨٠ لەدژی کوردی بەکار هێنا، ئەو سەرەنجامەی لێ کەوتەوە کەبەشێکی گروپە چەپەکانی کوردو تورك هانایان بۆ کوردستانی عیراق بردو لەناوچەکانی سەر سنور بارەگایان دانا ئەویش بەسود وەرگرتن لەوەی کە لەو کاتەدا عیراق بەهۆی جەنگی عیراق-ئێرانەوە، لەو ناوچانەدا کۆنترۆڵی لەدەستدا بوو و هیچ هێزێکی سوپای عیراقی لێ نەما بوو. جگە لەوە، بەشێکی ئەو گروپانە پەیوەندییان بەیەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کردو چەند بارەگایەکیان لەو ناوچانەدا دامەزراند کە لەژێر دەسەڵاتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا بون. ئەمەش یەکەم جار بوو کەپەیوەندییەکی بەو رادەیە پتەو لەنێوان کوردی عیراق‌و کوردی تورکیا دروست ببێ کەکاریگەریی زۆری لەسەر

---

[61] دکتور حامد محمود عیسی، القضیة الکردیة في ترکیا، المصدر السابق، ص ٢٨٣.

[62] دکتور حامد محمود عیسی، المشکلة الکردیة في الشرق الاوسط، المصدر السابق، ص ٣٨٠.

زیاتر تەشەنە سەندنی هۆشیاریی نەتەوەیی هەردولا بەجیّ هێشت. ئیتر بەهۆی مەترسیی تورکیا لەم مەسەلەیە، لەبەهاری سالّی ١٩٨٣دا هێزەکانی تورکیا بۆ رامالّینی بارەگاکانی کە لەسەر سنوری عیراق-تورکیا بون، هێرشێکی بەربلاّویان کردە سەر ناوچەکانی سەر سنور بەسود وەرگرتن لەرەزامەندیی رژێمی عیراق‌و خالّەکانی رێککەوتننامە ئەمنییە مۆرکراوەکەی سالّی ١٩٧٨ی نێوان عیراق‌و تورکیا کە لیّ دەگەرِا هێزەکانی تورکیا لەکاتی پێویستدا تا قولاّییی ٣٠ کلم بێنە ناو سنوری هەرێم.

لەتشرینی یەکەمی سالّی ١٩٨٣دا پاش تێپەربونی سیّ سالّ بەسەر هاتنە سەر کاری جەنرالّەکان، یەکەم هەلّبژاردن ئەنجام درا کەبەهۆیەوە تەواوی هەیکەلی سیاسی گۆرِانی بەسەردا هات. لەو کاتەدا جەنرالّەکان دەستورێکی تازەیان داهێنا بوو و حزبی سیاسی‌و یاسای تازەیان بۆ هەلّبژاردن ئامادە کردبوو. حکومەتەکەی ئیڤرین رێی بەهیچ سیاسەتمەدارێکی دێرین نەدابو چالاکیی سیاسی بنوێنیّ. لەو هەلومەرجەدا جەنرالەکان لەو ١٧ حزبەی کەداوای مۆلّەتیان کردبوو، تەنها رێیان بە ٣ حزب دابو دابمەزریّ‌و بەشداری لەپرۆسەی هەلّبژاردندا بکاو ئەو سیّ حزبەش بریتی بون لەپارتی نەتەوەییی دیموکراسی، پارتی نیشتمانی دایك‌و پارتی گەل. هەمو سەرانی ئەو سیّ حزبە لەپاش کودەتای سالّی ١٩٨٠ دەرکەوتبون. پارتی نەتەوەییی دیموکراسی کەجەنرالی خانەنشین تورگوت سونالب سەرۆکایەتیی دەکرد، بەنوێنەری راستەقینەی فەلسەفەی کودەتای ١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠ دادەنرا. بۆیە لەماوەی پێش هەلّبژاردندا، هەمو قورسایی‌و توانای دەولّەت بۆ رەواج پەیداکردن بۆ ئەو حزبە تەرخان کرا بەلاّم لەرِۆژی هەلّبژاردندا دەنگدەرانی تورکیا دەنگیان بەو حزبە نەدا کە لەسەرەنجامی کۆتاییدا بەپلەی سێیەم هات، پاش پارتی نیشتمانی دایك کەتورگوت ئۆزال رابەرایەتیی دەکردو پاش پارتی گەل.

لـەو هەڵبژاردنـەدا پـارتی نیشـتمانی دایـك ۲۱۱ کورسـیو ٤٥٪ ی دەنگەکانیبەدەستهێنا، پـارتی گـەل ۱۱۷ کورسـیو ۳۰٪ ی دەنگـەکانو پارتی نەتەوەییی دیموکراسی ۷۱ کورسیو ۲٤٪ ی دەنگەکان[٦٣].

لەتورکیا گۆڕانکارییەکان بەشێنەیی لەگەڵ هاتنە سەر کاری تورگـوت ئۆزالدا هاتنە کایەوە. ئۆزال یەکەم سەرەك وەزیرانی تورکیا بـوو بچـێ بـۆ حەجو بەڕێکوپێکی بەشدار بێ لـەنوێژی ڕۆژی هـەینیدا. خـودی خۆیشـی بەمەزهەب نەقشبەندی بوو و بەشداریی لـەدابو نـەریتی ئـەم تەریقەتـە سـۆفییەدا دەکـرد لەوانـە سـەردانی ئارامگـای شـێخ محەمـەد بـەهادینی نەقشـبەندی لەئۆزبەکسـتان[٦٤]. ئـوزال خـاوەنی سیاسـەتێکی ئیسـلامیی میانڕەو بوو و بەو هیوایەوە بوو کەبتوانێ ئاشتبونەوەیەکی مێژویی لەنێوان کەمالیزمو ئیسلامدا لەتورکیا بەدی بێنێو هـەر لـەم ڕوانگەیـەوە کـاتێك پارتی نیشـتمانی دایکـی پێـك هێنـا، ئەندامـەکانی پـارتی سـەلامەتی ئیسلامیی قەدەغەکراوی ئەربەکانی بەئەندام لەحزبەکەی خـۆی وەرگـرت. ئەم سیاسەتەی ئۆزال چ لەسەردەمی سەرەك وەزیرانـیدا (۱۹۸۳-۱۹۸۹)و چ لەسەردەمی سەرکۆماریدا (۱۹۸۹-۱۹۹۳) هەر درێژەی کێشا[٦٥].

تورگوت ئۆزال تا کۆتاییی هەشتاکان هەر لەو بڕوایەدا بوو کـەدەکرێ بەگەشەپێدانی ئابوریی ناوچە کوردنشینەکان، چارەسەرێك بـۆ مەسـەلەی کورد بدۆزرێتەوەو لەم ڕوانگەیەوە ئومێدێکی زۆری بەپرۆژەی گاپ هـەبوو. ئۆزال لەم بارەیەوە وتویەتی ((ئێمـە لـەو بڕوایـەداین کـەپرۆژەی باشـوری ڕۆژهەڵاتی ئەناتۆلیا لەڕوی کۆمەڵایـەتیو سـودی ئابوریـیـەوە بایـەخێکی زۆری هەیـە. ئێمـە پێمـان وایـە ئـەرکی نیشـتمانیمان ئەوەیـە کەهـەمو

[٦٣] نوبار هوفسبيان (المحرر) وفيروز احمد واخرون، المصدر السابق، ص ٢٤٩-٢٥٠.
[٦٤] رضا هلال، السيف والهلال، دار الشروق، القاهرة، ١٩٩٩، ص ١٥٣.
[٦٥] دكتور حامد محمود عيسى، القضية الكردية في تركيا، المصدر السابق، ص ٣١٢.

هـەنگاوێکی پێویـسـت بنێـین بـۆ ئـەنجامدانی ئـەم پرۆژەیـە لەکـەمترین ماوەدا))[٦٦].

لەساڵی ١٩٨٤دا پارتی کرێکارانی کوردسـتان (PKK) کەعـەبدوڵڵا ئۆج ئالان سەرکردایەتیی دەکـرد خـەباتی چـەکداری راگـەیاند. لـە ١٥ی ئـابدا پێشـمەرگەکانی ئـەو حزبـە لەویلایـەتی سـیرت یەکـەم چـالاکیی پێشمەرگانەیان لەدژی سوپای تورك ئەنجام داو لێرە بەدواوە خەباتی چەکدار لەکوردستانی تورکیا دەستی پێ کرد[٦٧].

سـاڵی ١٩٨٥ واتـە یـەك سـاڵ پـاش راگـەیاندنی شۆڕشـی چـەکدار لەکوردستاندا، حکومەتی تورکیا سستمێکی جاشایەتیی بەناوی پارێزەرانی گوندەوە پێکهێنا بۆ یارمەتیدانی سوپا لەچالاکییەکانیدا دژی پێشـمەرگە. ژمارەی چەکدارەکانی ئەو سستمە ئەوەندە پەرەی پـێ درا کـە لـەکۆتاییی ساڵی ١٩٩٣دا گەیشـتە دەوروبـەری ٥٠ هـەزار کـەس. پـاش دوو سـاڵ لەدروست کردنی ئەم سسـتمە جاشـایەتییە، حکومـەتی تورکیـا لەسـاڵی ١٩٨٧دا ویلایەتـەکانی بتلیـس‌و بنگـول‌و باتمـان‌و دیاربـەکرو هـەکاری‌و ماردین‌و سیرت‌و شیرناخ‌و توونجـەلی‌و وانـی خسـتە نـاو چوارچێـوەی بـاری نائاسـاییەوەو بـۆ بـەڕێوەبردنی کاروبـاری هـەمو ئـەو ویلایەتانـە کاربەدەستێکی دەسەڵاتداری دیـاری کـردو ئـەم بـارە تـا کۆتـایی هـاتنی هەشتاکان هەر بەو جۆرە مایـەوە[٦٨]. ئیـدی لەسـاڵی ١٩٩٠دا حکومـەتی تورکیا حاکمێکی سوپاییی بۆ کوردستان دانـا کەبارەگاکـەی لەدیاربـەکر

---

[٦٦] هەمان سەرچاوە، ل ٣١٤.

[٦٧] محمد نورالدين، تركيا في الزمن المتحول قلق الهوية وصـراع الخيـارات، ريـاض الريـس للكتب والنشر، بيروت، ١٩٩٧، ص ٩٥.

[٦٨] محمد نورالدين، تركيا في الزمن المتحول قلق الهوية وصراع الخيارات، المصدر السـابق، ص ٩٦.

بوو و هەر لەو ساڵەدا پشێوییەکی زۆر سەرتاسەری ناوچە کوردنشینەکانی گرتەوەو ئەمەش هێزەکانی تورکیای هاندا بکەونە ویزەی خەڵکەوە. لەشاری شیرناخ هێزەکانی تورك کاری وەها دڕندانەیان ئەنجام دا کەبوە مایەی چــۆڵ بونی شارەکە لەدانیشتوان[69].

تا کۆتاییی هەشتاکان تورکیا سور بوو لەســەر درێــژەدان بەسیاســەتی نکوڵی کردن لەبونی کورد. بەڵام بەهاتنە سەرکاری کەسێکی لیــبرالی وەك ئوزال بۆ دەسەڵات، هەنگاوە بەرایییەکانی گۆڕانی دیدی فەرمی ســەبارەت بەکورد دەستیان پێ کرد. یەکێ لەروخسارە بنەڕەتییەکانی سیاسەتی ئوزال لەسەر ئاستی ناوەوە هەوڵدانی بوو بۆ بەمەدەنی کردنــی ژیــانی سیاســیو فیکریی تورکیاو تەماشاکردنی مەسەلەی کورد بەدیدێکی تــرو ئــاوەزێکی کراوەترو هاوچەرخانەتر. بەڵام ئوزال تەنها لەساڵانی نەوەدەکاندا توانی ئــەم بۆچونانەی خۆی پراکتیزە بکاتو هەندێ هەنگاو بنێ کە لــەئایندەدا بونــە ڕێخۆشکەر بــۆ ئەگــەری چارەســەرکردنی مەســەلەی کــورد بەشــێوەیەکی ئاشتییانە.

دیــاردەی رابــونو تەشــەنە ســەندنی بــیری کوردایــەتیو هۆشــیاریی نەتەوەییی کورد لــەتورکیا ســاڵانێکی دورو درێــژی خایــاند کــە لــەدوای جەنگی دووەمی جیهانەوە دەست پێ دەکا تا دەگاتە سەرەتای نەوەدەکان. ئەم دیاردەیە گەشەکردنو پەرەسەندنی شــێنەییی بــەخۆوە بینــیو بەچــەندەها وێســتگەی ســەختو دژواردا تێپــەڕی کــە ســەرەنجامەکەی بریتــی بــوو لەگەشانەوەی ناسنامەی نەتەوەییی کــوردو بوژانــەوەی مەســەلەی کــوردو بــەهێزبونی بــازوویو بوونــی بەبزوتنەوەیــەکی جــەماوەریی فــراوان کــە لەپرۆسەی سیاسیدا کەس ناتوانێ نکوڵی لەکاریگەرییو کارایییی بکات.

---

[69] دکتور حامد محمود عیسی، القضیة الکردیة في ترکیا، المصدر السابق، ص ٣٢١.

## تەوەری دووەم

# پرۆژەی گاپ و کاریگەریی لەسەر مەسەلەی کورد لەتورکیا

ئارام عەلی عەزیز*

ئەم لێکۆڵینەوەیە زیاترو پێش هەموو شتێك بۆ ئەوە تەرخان کراوە کەکاریگەریی پرۆژەی گاپ لەسەر مەسەلەی کورد لەتورکیا شی بکاتەوەو لەم سۆنگەیەوە ناچێتە سەر ئەو لایەنەی کەبەندە بەگرنگیی ئەم پرۆژەیەو کاریگەریی لەسەر ململانێی سیاسیی تورکیا لەگەڵ هەر یەك لەعیراق‌و سوریا کەپرۆژەکە وا دەکا تورکیا لەڕوی کۆنترۆڵ کردنی ئاوی هەردو روباری دجلەو فوراتەوە داشی بەسەریانەوە سوار بێ، بۆیە لێکۆڵینەوەکە ئەم لایەنە، سەرەڕای گرنگیی، فەرامۆش دەکاو زیاتر بایەخ بەو ئاماژە سیاسییە ناوخۆیییانە دەدا کە لەپشت دامەزراندنی پرۆژەکەوەن.

### ١-کورد: تێڕوانینێکی سیاسی-ئابوری

لەتورکیا نەتەوەی کورد لەڕوی ژمارەوە پاش نەتەوەی تورك دێ، بەڵام سەرژمێرەکانی دانیشتوان تائێستا داتاکانی ئەم پێکهاتەیان بەوردی دەرنەخستوەو تائێستا ژمارەی نەتەوەی کورد لەتورکیا پشت بەمەزەندەکاری دەبەستێ‌و مایەی مشتومڕیشە.

---

* لێکۆڵیار لەسەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان.

بەپێی مەزەندەکارییەکانی کۆمیسیۆنی کۆمەڵەی گەلان کەساڵی ١٩٢٥ بەتایبەت بۆ یەکلایی کردنەوەی چارەنوسی ویلایەتی موسڵ پێکهێنرا بوو، ژمارەی کورد لەتورکیا گەیشتۆتە ١.٥ ملیۆن[١]، لەکاتێکدا سەرژمێری ساڵی ١٩٢٧ی تورکیا کەدانیشتوانی لەسەر بنەمای زمانی دایك پۆلین کردوە، ژمارەی کوردی بە ١,١٨٤,٠٠٠ کەس، واتە دەوروبەری ٩٪ ی سەرجەمی دانیشتوان، مەزەنە کردووە[٢]. بەلاّم سەرژمێرە فەرمییەکانی تورکیا لەم روەوە جێی باوەڕ نین چونکە تورکەکان پاش سەرکوت کردنی شۆڕشەکەی ساڵی ١٩٢٥ ی شێخ سەعیدی پیران کەوتنە شێواندنی راستیە دیموگرافییەکانو زیادکردنی ژمارەی تورك لەناوچە کوردنشینەکاندا[٣].

بەلاّم ئەمڕۆ زۆربەی سەرچاوە بێلایەنەکان سەبارەت بەژمارەی کوردی تورکیا ژمارەیەك دەخەنە بەرچاو کەکەوتۆتە نێوان ١٢-١٤ ملیۆن و[٤] کورد لانی کەم لەهەشت ویلایەتدا کەبریتین لەویلایەتەکانی ئاگری، بنگول، بتلیس، دیاربەکر، هەکاری، ماردین، سیرتو وان زۆرینەی رەهای دانیشتوان پێکدێنن[٥].

---

[١] سي. جي، ادموندز، كرد وترك وعرب، ترجمة جرجيس فتح الله، مطبعة التايمس، بغداد، ١٩٧١، ص ٨.

[٢] م.أ. حسرتيان، القضايا القومية في تركيا، ترجمة سيامند سيرتي، دمشق، ص ٧١-٧٢.

[٣] الدكتور خليل علي مراد، القضية الكردية في تركيا ١٩١٩-١٩٢٥. فصل من كتاب: القضية الكردية في تركيا وتأثيرها على دول الجوار، تأليف مجموعة من الباحثين، مركز الدراسات التركية بجامعة الموصل، الموصل، ١٩٩٤، ص ٨.

[٤] روبرت اولسن، المسالة الكردية في العلاقات التركية-الايرانية، ترجمة محمد احسان رمضان، دار أراس، اربيل، ٢٠٠١، ص ١١.

[٥] م. أ. حسرتيان، المصدر السابق، ص ٥٤.

راگەیاندنی کۆماری تورکیا لەساڵی ١٩٢٣دا لەسەر دەستی مستەفا کەماڵو دەست کردن بەپرۆسەی بەرۆژئاوایی کردنی تورکیاو مۆدێرنیزەکردنی کۆمەڵەکەی بەپێی سیاسەتی ناوخۆیی‌و دەرەکی‌ی مستەفا کەماڵو جێ نشینەکانی، کاریگەری‌یەکی وەهای هەبو کەتەنها بەوە دانەکەوت کەتورکیاو تورکەکانی گرتەوەو وای کرد بکەونە نێوان رەگ‌و ریشەی رۆژهەڵاتییانەو سیاسەتی بەرۆژئاوایی کردن، بەڵکو هەروەها کاریگەریی لەسەر کوردیش بەجێ هێشت چونکە ئەم سیاسەتە لەناوچەکانی رۆژهەڵاتی تورکیا ئێجگار بەسەختی لەلایەن خێڵە کوردەکانەوە بەرهەڵستی کرا[٦] بەتایبەتی کە کەمالیستەکان شتێکی وایان نیشان نەدا کەئاماژە بێ بەئامادەبونیان بۆ سەلماندنی مافە نەتەوەیی‌یەکانی کوردو لەم بوارەدا مۆرکردنی پەیمانی لۆزان ساغی کردەوە کەتورکیای کەمالیست بەنیاز نیە مافەکانی کورد بسەلمێنێ.

یەکەم رەنگدانەوەی رەتکردنەوەی سیاسەتە تازەکەی تورکیا پاش مۆرکردنی پەیمانی لۆزان، لەساڵی ١٩٢٥دا دەرکەوت، کاتێك شۆڕشێکی بەربڵاو بەسەرکردایەتیی شێخ سەعیدی پیران لەکوردستان هەڵگیرسا. ئەگەرچی ئاین رۆڵێکی دیاری لەم شۆڕشەدا هەبوو و گەڕاندنەوەی خەلافەتی ئیسلامی دروشمێکی سەرەکیی شۆڕشەکە بوو بەڵام ناکرێ نکوڵی لەرۆڵی هەستی کوردایەتی لەهەڵگیرساندنی شۆڕشەکەدا بکرێ[٧]. پاش سەرکوت کردنی شۆڕشەکە، هێزەکانی تورك کەوتنە وێزەی دانیشتوانی بێ

[٦] جورج لنشوفسكي، الشرق الاوسط في الشؤون العالمية، الجزء الاول، ترجمة جعفر خياط، دار المتنبي، بغداد، ١٩٦٤، ص ١٧٣.

[٧] دکتۆر عەبدولرەحمان قاسملو، کوردستان‌و کورد-لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی‌و ئابوری، بنکەی پێشەوا، بەغدا، ١٩٧٣، ل ٥٩.

گوناهو لەماوەی ساڵانی ١٩٢٥-١٩٢٦دا سەدان گوند وێران کران، هەزاران خانو گڕیان تێ بەردراو سەدان هەزار ژنو منداڵو پیر کوژران[٨].

ئەگەرچی کورد لەتورکیا زۆرینەی دانیشتوانی ویلایەتەکانی ناوچەی باشوری رۆژهەڵاتی ئەناتۆلیاو بەدرێژایی سنوری تورکیا لەگەڵ هەر یەك لەسوریاو عیراقو ئێران پێکدێنێ، بەڵام ئەمە نەبوە رێگر لەبەردەم کەمالیستەکان بۆ ئەنجام دانی ئەم تەگبیرانە:

١-گوناهبارکردنی هەندێ گەل وەك کوردو عەرەبو ئەرمەن بەوەی کەبونەتە هۆی شکستی دەوڵەتی عوسمانی لەجەنگی یەکەمی جیهاندا[٩].

٢-راگواستنی کورد لەئەناتۆلیاو ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتەوە بەرەو ویلایەتەکانی ناوەڕاستو رۆژئاوای وڵاتو گرتنەبەری سیاسەتێکی توندتر بۆ لەناوبردنو تواندنەوەی کورد لەساڵی ١٩٣٠ بەولاوە[١٠]. ئەمەش لەهەلومەرجێکدا رویدا کەتێیدا تورکیا ناوچە کوردنشینەکانی بەناوچەی قەدەغەکراو راگەیاندو رێگای بەکەس نەدا هیچ جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ کورددا دابمەزرێنێ[١١].

---

[٨] جليلي جليل وأخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، دار الرازي، بيروت، ١٩٩٢، ص ١٤٩.

[٩] الدكتور عبدالجبار عبد مصطفى النعيمي، اكراد تركيا وابعاد مشروع غاب. فصل من كتاب: القضية الكردية في تركيا وتأثيرها على دول الجوار، مصدر سابق، ص ١٦٧.

[١٠] دکتۆر عەبدولرەحمان قاسملو، سەرچاوەی پێشو، ل ٦٧.

[١١] دکتۆر عەزیز شەمزینی، جولانەوەی رزگاریی نیشتمانیی کوردستان، وەرگێڕانی فەرید ئەسەسەرد، چاپی سێیەم، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، سلێمانی، ١٩٩٨، ل ٢٤٠.

توركيا بۆ بەیاسایی کردنـــی مەسـەلەی راگواسـتنی کـورد ، لەسـالّی ۱۹۳٤دا یاسایەکی تایبەتی دەرکرد کە بەهۆیەوە هــەر کەسـێك کـەزمانی زگماکی تورکی نەبێ، دەشێ لەبەر هۆکــاری سـەربازی یـان سیاسـی یـان کەلتوری یان ئەمنی، رابگوێزرێ بۆ ناوچەی تر ئەگەر وەزارەتی نـــاوخۆ وای دانا کەئەم راگواستنە بۆ بەرژەوەندیی ولاّت شتێکی پێویستە[12] .

۳-بەئەنقەسـت هێشـتنەوەی ناوچـە کوردنشـینەکان بەدواکـــەوتویی، ئەویش لەبــەر رۆشـنایی‌ی ئـەو تیۆرییــەی کەگوایـە چـەند ئـەو ناوچانـە دواکەوتوو بـــن ئـــەوەندە هەسـتی خۆجیاکردنـــەوەیان تێـدا کـەم دەبێتـەوەو زیاتریش بەناوچە پێشکەوتووە تورك نشینەکانەوە دەبەسترێنەوە. بەم پێیـــە ، زۆربەی هەرە زۆری پیشەسازییە گرنگەکان لەناوچەکانی رۆژئاوا دامـــەزران بەرادەیەك کەتەنها لەچەند ناوچەیەکی وەك ئەنقەرەو ئیزمـیرو ئیسـتانبولو هاتای دەوروبەری ٤٠٪ ی بەرهەمی پیشەسازی جێگـیر کران[13] . لـەئاکامی ئـەم سیاسـەتەدا پەیوەندییـەکانی بەرهــەم هێنـانی دەرەبەگانـە لەناوچـە کوردنشینەکاندا رەگیان داکوتاو لەم سۆنگەیەوە تێکەلّەیــەك لەکـەلتوری خێلّەکی-دەرەبەگایەتی‌و توێژێکی زەویداری دەرەبەگ خـــۆی بەسـەر ناوچـە کوردنشینەکاندا سەپاند[14] .

---

[12] نـادر ئینتیسـار، ئیتنـۆ نەتەوایـەتی‌ی کـــوردی، وەرگـــێڕانی عـــەتا قـــەرەداغی، بەڕێوەبەرایەتی‌ی خانەی وەرگێڕان، سلێمانی، ۲۰۰٤، ل ۲۲۷.

[13] د. عبدالكريم كامل، الاقتصاد التركي، فصل مـن كتـاب: تركيـا المعـاصرة، تـأليف مجموعـة مـن البـاحثين، مركـز الدراسـات التركيـة بجامعـة الموصـل، الموصـل، ۱۹۸۷، ص ۱۲۵.

[14] د. عمـاد احمـد الجواهـري، البنيـة الاجتماعيـة في تركيـا، فصـل مـن كتـاب: تركيـا المعاصرة، المصدر السابق، ص ۱٤۷.

ئیدی تا کۆتاییی سالآنی هەشتای سەدەی رابردو هیچ گۆڕانێکی جەوهەریی ئەوتۆ بەسەر هەڵوێستی فەرمیی تورکدا بەرامبەر بەکورد نەهاتو هەروەها هیچ گۆڕانێکی ئابوریی جەوهەری بەسەر پەیوەندییەکانی کارو بەرهەم هێناندا لەنێو خودی کورددا نەهات. بێگومان ئەمەش لەسەر تەواوی ناسنامەی کورد لەتورکیا رەنگی دایەوە. تا ئەو کاتە دو هێڵی پێك نەگەیشتوی هاوتەریب، کەیەکێکیان هێڵی فەرمیی تورك بوو و ئەوی دیکەیان هێڵی کورد بوو، لەئارادا بوونو هەر یەکێکیان گوزارشتی لەهەڵوێستی خۆی لەدژی لایەنەکەی تر دەکرد بەبێ ئەوەی پێشبینیی هیچ جۆرە سازشو ساتوسەوداو لێك نزیك بونەوەیەك لەنێوانیاندا بکرێ.

هێڵی فەرمیی تورك لەسەر هەڵوێستەکانی پێشوی خۆی بەردەوام بوو کەدرێژەپێدانی ئەو بۆچونە سواوە بون کەگوایە کورد لەتورکیا نیەو ئەوەی هەیە تورکی کێوییەو گوایە لەتورکیا مەسەلەیەك بەناوی مەسەلەی کوردەوە نیە. ئەم هەڵوێستەش هەم لەسەر ئاستی حزبی دەسەلآتدار بوو هەم لەسەر ئاستی فەرمیی دەوڵەتو گوزارشتی لەدرێژەپێدانی سیاسەتی تواندنەوەی کورد لەناو بۆتەی تورکدا دەکرد. لەسالآنی سیی سەدەی رابردودا رۆژنامەی ((تان)) سەبارەت بەهەوڵەکانی دەوڵەت بۆ تورکاندنی کوردی ناوچەی دەرسیم نوسیبوی ((مەسەلەی تورکاندنی خێڵە کوردەکان هێشتا لەقۆناغی سەرەتایی دایە بەتایبەتی کەدەستێوەردانی زۆر کەس تا رادەیەك مەسەلەکەی ئاڵۆز کردوە))[15].

حزبە گەورەکانی تورکیا زۆربەی هەرە زۆریان دیدی شۆڤێنیستییان بۆ مەسەلەی کورد هەبوو و لەم روەوە دەشێ ئاماژە بۆ پرۆگرامی پارتی عەدالەت بکرێ کەباس لەوە دەکا کەئەندامەکانی ((دژی ئەو بزوتنەوانە

---

[15] دکتۆر عەزیز شەمزینی، سەرچاوەی پێشو، ل ١٣٦.

دەوەستنەوە کەدەڵێن گوایە گەلی تورکیا) لەڕوی ریشەی نـژادیو کـەلتورو دینو دابو نەریتی خۆماڵییەوە جیاوازیی تێدایــە)) (خـاڵی ٩) و لەبـەر رۆشنایی‌ی نەتەوایەتیی تورك دا ئەم حزبە بانگەشە بۆ ((نەتـەوەی مـەزنی تورك)) دەکا (خاڵی ١١)[١٦].

هەر بەهەمان پێودانگ پارتی گەلی کۆمار کە لەسـەردەمێکدا یـەکێ لەگەورەترین حزبەکانی چەپی میـانڕەو بـوو، لەپرۆگرامەکـەیدا دەیگـوت ((پـارتی گـەلی کۆمـار دان بـەجیاوازیی رەگـەزی لـەنێوان هاوولاّتییـە تورکـەکاندا نـانێ‌و دژی ئـەو بزاڤانـە دەوەسـتێتەوە کەهــەوڵ دەدەن بــە مەبەستی لەق کردنــی یەکپارچـەیی‌ی نەتـەوەیی‌و یەکپارچـەیی‌ی خـاکی دەوڵەتی تورکیا، سود لەجیاوازییە رەگەزییەکانی وەرگرن))[١٧].

بەهەمان شێوە، پاش یەکەم کودەتای سوپا لەسـاڵی ١٩٦٠دا، جـەنراڵ گورسیل رابەری تازەی تورکیـا لـەلێدوانێکدا بـۆ رۆژنامەیـەکی سـویدی، سەبارەت بەجموجۆڵی کورد، وتی ((ئەگەر ئەو چیایی‌یانە بۆ خۆیـان ئـارام دانەنیشن، سوپا هیچ کەمتەرخەمی‌یەك لەلێدانی شارو گوندەکانیان ناکاو وەك ئەو کوشتارەی کە لەمەوبەر بەخۆیانو ولاّتەکەیانەوە تارومـاری کـردن، روبەڕوی کوشتارێکی تر دەبنەوە))[١٨].

دیارە زۆربەی رەهەندە سیاسییەکان ترسێکی زۆریان لەجیابونەوەی کورد لێ نیشتوەو لـەم روەوە سـلێمان دیـمیریلی سیاسـەتمەداری دێرینـی تورکیـا بەزێدەڕۆیی‌یەکی زۆرەوە وتویەتی کە ((ئەگەر کورد جیا ببنـەوە، دەوڵـەتی

---

[١٦] م. أ. حسرتيان، المصدر السابق، ص ٥١.

[١٧] م.أ. حسرتيان، المصدر السابق، ص ٥٢.

[١٨] صبرية احمد لافي، الاكـراد في تركيـا، معـهد الدراسـات الاسـيوية والافريقيـة بجامعـة المستنصرية، بغداد، ١٩٨٥، ص ١٠٩.

توركيا هەرەس دێنێ))[19]. تەنانــەت چەپـە مارکسیستـەکانیش دیدێکـی دۆستانەیان بۆ مەسەلەی کــورد نـەبووەو لـەم روەوە محەمـەد عـەلی بایـار، سەرۆکی پـارتی کرێکـارانی تورکیـا، لەسـاڵی ١٩٦٧دا لەکۆنفرەنسـێکی نێودەوڵەتیدا لەستۆکهۆڵم رایگـەیاند کـە ((مەسـەلەی کـورد لـەتورکیا نیە))و تەنها پاش ئەوەی لەکۆتاییی ساڵی ١٩٦٩دا بایار لابـراو کوردێـك بەناوی محەمەد عەلی ئەسلانەوە چـوە جێـی، حزبەکـە لـەکۆنگرەی چـواری ساڵی ١٩٧٠ دا دانی بەوەدا نا کە ((گەلی کورد لەناوچـەکانی رۆژهـەڵاتی تورکیا هەیە)) بەڵام سەرەڕای ئەم هەڵوێستە دۆستانەیە حزبەکە سـەبارەت بەمەسەلەی کورد بەو ئەنجامە نەگەیشت کەمافی چارەی خۆنوسین بۆ کورد بسەلمێنێ یاخود داوای ئۆتۆنۆی بۆ گەلی کورد بکا[20].

هێڵەکەیتر هێڵی کوردە کە بـۆ بەدەسـت هێنـانی مافـە نەتەوەیی یـە زەوتکراوەکان خەباتی کــردوەو دەکـاو خـۆی لەچـەند رێچکـەو رێوشـوێن و رەهەندێکدا دەنوێنێ، ئەویش بەجۆرە:

١-پێکهێنانی یانەی کۆمـەڵایەتی و گروپی رۆشــنبیر بـۆ بڵاوکردنـەوەی بیروباوەڕی نەتەوایەتی بەشێوەیەکی ئاشتییانە.

٢-پێکهێنانی حزبی سیاسیی نهێنی بۆ رێکخستنی هــێزو تواناکـانی گەلی کوردو بــەکارهێنانی رێوشـوێنی ئاشـتیخوازانە بـۆ چارەسـەرکردنی مەسەلەی کورد لەتورکیا.

٣-پێکهێنانی حزبی سیاسیی نــهێنی و بـاوەڕ هێنـان بـەوەی کەتاکـە رێوشوێن بۆ رزگاریی کوردستان بەکارهێنانی زەبروزەنگ و هەڵگیرسـاندنی شۆڕشە. گرنگترین و سەرەکیترین نوێنەری ئەم رەهەندەش پارتی کرێکـارانی

---

[19] صلاح سعدالله، المسألة الكردية في تركيا، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٩١، ص ٧٠.

[20] صبرية احمد لاني، المصدر السابق، ص ١١٠-١١١.

کوردستان (پەکەکە) بوو. لەم سۆنگەیەوە کەئەم حزبە زۆرترین کاریگەریی لەسەر مەیدانی سیاسیی کوردستانی تورکیا بەجێ هێشتوە، هەوڵ دەدەین چەردەیەك زانیاریی لەبارەیەوە بخەینە بەرچاو.

یەکێ لەگرنگترین رەهەندەکانی ناو بزوتنـــەوەی کوردایـــەتی، رەهـــەندی چـــەپی رادیکـــالی مارکسیســـت بـــوو[21]. لـــەکۆتایی‌ی ســـاڵی ١٩٧٨دا لەکۆبونەوەیەکدا لەگوندی فیس کەگوندێکە سەر بەقەزای لجێ لەویلایەتی دیاربەکر، پەکەکە لەسەر دەستی عەبدوڵڵا ئۆجەلان دامەزرا[22]. پاش ئەوەی هێزەکـــانی تـــورك تـــەنگیان پـــێ هـــەڵچنی، پەکەکـــە بڕیـــاری دا سەرکردایەتییەکەی بباتە سوریا.

لـە ١٩٨١دا پەکەکـە بڕیـاری دا ریزەکـانی یـەك بخاتـەوەو لـەناوخۆدا چالاکی بنوێنێ. لەئابی ١٩٨٢دا لەدیمەشق دووەم کۆنگرەی گرێداو هـەندێ لەئەندامەکانی خۆی بەشێوەی گروپی چەکدار بۆ نـاو کوردسـتان ناردەوەو لەساڵی دواتردا سەدان پێشمەرگەی لەهەرێمی بۆتان جێگـیر کـرد. ئیـدی پاش ئەوەی لـەخۆی دڵنیـا بـوو، لـە ١٥ی ئـابی ١٩٨٤ هـێزی رزگـاریی کوردستانی پێکهێناو خەباتی چەکداری راگەیاند[23].

---

[21] الدكتور حامد محمود عيسى، القضية الكردية في تركيـا، مكتبـة مدبـولي، القـاهرة، ٢٠٠١، ص ٣٠٤.

[22] Michael M. Gaufer; The Kurds and The Future of Turkey, st. 1997, P 25-26.

[23] رعد عبدالجليل مصطفى الخليل، صراع الاستيعاب والانفصال دراسـة في تجربـة حـزب العمال الكردستاني في تركيا، عن كتاب: الوحدة الوطنية ومشـكلة الاقليـات في العـالم الثالث، بغداد، ١٩٨٩، ص ١١٦-١١٧.

ئەو کاتەی پەکەکە دەستی بەخەباتی چەکدار کرد، تەنها دو سەد پێشمەرگەی هەبوو بەڵام تا گەیشتە ساڵی ١٩٩٣، بوو بەخاوەنی ١٠ تا ١٥ هەزار پێشمەرگە[٢٤]. لەمارتی ١٩٨٥دا پەکەکە رێکخراوێکی تری دروست کرد بەناوی ئەرتەشی رزگاریی گەل کە بەکردەوە بەباڵی سوپاییی حزبەکە دادەنرا[٢٥].

بەپێی هەندێ سەرچاوە، لەئاکامی شەڕو پێکدادانی کوردستانی باکوردا، تا مانگی مارتی ١٩٩٣ ژمارەی کوژراو گەیشتۆتە هەشت هەزار کەس لەتورکیا[٢٦]. ئەو جەنگەی کە پەکەکە لەدژی تورکیا هەڵیگیرساند، تەنگژەیەکی زۆری بۆ ئابوریی تورکیا پێك هێنا چونکە جەنگەکە ساڵانە هەشت ملیار دۆلار لەسەر تورکیا کەوت[٢٧].

پەکەکە لەڕەوتی هەڵسوڕانی سیاسییدا دوچاری هەڵەیەکی زۆر بوو، بەتایبەتی لەو روانگەیەوە کەئەم حزبە خۆی بەتاکە ئەلتەرناتیڤی هەمو گروپەکانی بزوتنەوەی کوردایەتی لەسەرانسەری کوردستاندا دادەناو هەندێ رێوشوێنی وای لەخەباتدا گرتە بەر کەدواتر بەهۆیەوە ناوی تیرۆریستی بەسەردا دابڕا، جگە لەوەی کەئەم حزبە پاش گیرانی سەرۆکەکەی لەساڵی ١٩٩٩داو پاش ئەوەی سەرۆکەکەی لەکاتی دادگایی کردندا ئەو خۆڕاگریو

---

[٢٤] ئەریك رولو، ئەو گیروگرفتانەی روبەڕوی تورکیا بونەتەوە، وەرگێڕانی عەلی هەورامی، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە ٢، ساڵی چوارەم، ١٩٩٥، ل ٧٥.

[٢٥] رعد عبدالجليل مصطفى الخليل، المصدر السابق، ص ١١٨.

[٢٦] رۆژنامەی (العراق) ١٩٩٣/٣/٢٠.

[٢٧] د. محەمەد نورەددین، مەسەلەی کورد ساڵانە ٨ ملیار دۆلار لەسەر تورکیا کەوتوە (چاوپێکەوتن)، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە ٢، ساڵی شەشەم، ١٩٩٨، ل ١٥٣.

جەربەزەیی‌یەی نەنواند کە لێی چاوەڕوان دەکرا، وردە وردە لەبیروباوەڕەکانی خۆی پەشیمان بۆوەو ناوی خۆی گۆڕیو دواتریش توشی تەنگژەی ناوخۆیی‌ی دژوار هات.

## ٢- پرۆژەی گاپ

کاتێك لەپرۆژەی گاپ دەکۆڵینەوە، دەبێ بایەخ بەدو دیدی سەرەکی بۆ ئەم پرۆژەیە بدەین.

یەکەمیان: دیدێکی دەرەکییەو پەیوەندیی بەکاریگەریی پرۆژەکەیە لەئاییندەدا لەسەر ئاییندەی داهاتی ئاوو کشتوکاڵو نەخشەکانی پەرەپێدان لەسوریاو عیراق پاش بەئەنجام گەیشتنی پرۆژەکە لەتورکیا کە بەدەوڵەتی سەرچاوە دەژمێردرێ. ئەمە هەمووی لەلایەکو کاریگەریی پرۆژەکە لەسەر ئاییندەی بەرهەمی کشتوکاڵو شێوەو سەرچاوەکانی بەکاربردن لەتەواوی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لەلایەکی ترەوە. دیارە ئەم مەسەلەیە کاری بەسەر بابەتی سەرەکیی ئەم توێژینەوەیە نیە بەڵکو پەیوەندیی بەگیروگرفتێکی ئیقلیمی‌یەوە هەیە کەدەکرێ لەتوێژینەوەیەکی سەربەخۆدا لێی بکۆڵرێتەوە.

دوەمیشیان، دیدێکە پەیوەندیی بەئاسەوارە سیاسیو دیموگرافی‌یەکانی ناوخۆی تورکیاوە بەشێوەیەکی گشتی هەیەو ناوچەی پرۆژەکە بەشێوەیەکی تایبەت، بەتایبەتی کاریگەریی لەسەر ئاییندەی مەسەلەی کورد. ئەمەش ئەو بابەتەیە کەئەم توێژینەوەیەی بۆ تەرخان کراوە.

ناوچە کوردنشینەکان لەزەمانی مستەفا کەمالەوە فەرامۆش کراون. لەتورکیا ((سیاسەتێك بۆ بەزۆر تورکاندنی کورد پەیڕەو کرا، کورد لەدنیای هەندەران جیا کرایەوەو ڕێ نەدرا هیچ گۆڕانێکی گرنگی کۆمەڵایەتی لەکوردستاندا روو بدا چونکە تورکیا لەو بڕوایەدا بوو کەتورکاندنی گەلێکی نەزانو بەجێماوو پاشکەوتو لەتورکاندنی گەلێکی

روناكبیرو پێشكەوتو ئاسانترە. هەر لەسەر ئەم بنچینەیە، ناوچە كوردنشینەكان پشت گوێ خران‌و بایەخ بەپەرەسەندنی ناوچەكانی ناوەندو رۆژئاوا درا))[28].

بەكارهێنانی ئابوری بۆ نەهێشتنی كوردایەتی كە لەلای ناسیۆنالیستە توندڕەوە توركیستەكان ئامرازێك بوو بۆ چارەسەركردنی مەسەلەی كورد لەدیدی توركیستی‌یەوە، زیاتر بۆ سەردەمی حوكمڕانی‌ی عیسمەت ئینونو دەگەڕێتەوە، كاتێك ئابدین ئۆزمانی پشكنەری گشتی‌ی ناوچەی یەك لەراپۆرتێكدا بۆ وەزارەتی ناوخۆ سەبارەت بەپرۆسەی تواندنەوەو توركاندنی كورد نوسیبوی ((پێویستە دەسەڵاتی ئابوری تەنها بۆ ئەو كەسانە بسەلمێنرێ كە بەیەكجارەكی وازیان لەكوردایەتی هێناوە))[29].

تا ساڵانێكی دورو درێژ توركیا دانی بەوەدا نەدەنا كەگەلێك بەناوی گەلی كوردەوە لەناوچەكانی رۆژهەڵاتدا هەیەو رای فەرمی لەو دەورو خولە دەسوڕایەوە كەمەسەلەی كورد روخسارێكی جوگرافی-ئیقلیمی‌ی هەیەو كرۆكی مەسەلەكە مافی سیاسی‌ی كورد نیە بەڵكو دواكەوتنی كۆمەڵایەتی‌یە كەگوایە ئەم مەسەلەیە بەتەرخان كردنی بەرنامەیەكی ئابوریی پوخت بۆ پێشخستنی ناوچەكە دەكرێ چارەسەر بكرێ.

ئەم بۆچونە خۆی لەخۆیدا پاشگەزبونەوەیە لەبۆچونە دێرینەكە كەوای دانابو هێشتنەوەی ناوچە كوردنشینەكان بەدواكەوتویی، كۆتایی‌ی بەمەسەلەی كورد دێنێ بەڵام دواتر دەركەوت كەچەند ناوچە

---

[28] فەرید ئەسەسەرد، گاپ‌و ستراتیجی بادانەوە بەلای رۆژهەڵاتدا، گۆڤاری سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە ٢، ساڵی یەكەم، ١٩٩٢، ل ٢٧.

[29] دكتۆر عەزیز شەمزینی، سەرچاوەی پێشو، ل ١٤٠. سەبارەت بەراپۆرتی ناوبراو، بچۆرە سەر لاپەڕە ١٣٦-١٤٤ ی كتێبی ناوبراو.

کوردنشینەکان بەدواکەوتویی بمێننەوە ئەوەندەش ناتوانن تێکهەڵکێشی تورکیای پێشکەوتوو بن،و لەئەنجامدا دابڕانێکی شارستانی لەنێوان گەلی کوردو تورکیا پەیدا دەبێ‌و ئەمەش دەبێتە مایەی سەقامگیرکردنی هەستی جیاخوازی لەنێو کورددا.

لەم چوارچێوەیەدا تورگوت ئۆزال نەرمی‌یەکی زۆری بەرامبەر بەمەسەلەی کورد نواندو هەوڵی دا رێوشوێنی تر بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد جگە لەرێوشوێنی سەرکوت کردن بگرێتە بەر. لەم روەوە ئۆزال وتویەتی ((ئێمە پێمان وایە پرۆژەی ئەناتۆلیای باشور-رۆژهەڵات لەروی کۆمەڵایەتی‌و سودی ئابورییەوە بایەخێکی زۆری هەیەو وای دەبینین کەئەرکی نیشتمانیمان ئەوەیە کەهەمو تەگبیرێکی پێویست بۆ جێبەجێ کردنی ئەم پرۆژەیە لەکورتترین ماوەدا بگرینە بەر))[30].

لێرەدا دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکرێ کە لەمەوبەریش هەندێ پرۆژە بۆ پەرەپێدانی ناوچەکانی کوردستان لەلایەن ئەنقەرەوە دانرا بون بەڵام هیچیان بەقەد پرۆژەی گاپ بایەخیان پێ نەدراوە.

ئاشکرایە کە تا ئێستا بەهۆی بایەخ نەدانی تورکیا بەناوچە کوردنشینەکان، ئابوریی ئەو ناوچانە بەچاکی تێکهەڵکێشی ئابوریی تورکیا نەبوە. لەسەرەتای ساڵانی حەفتای سەدەی رابردوودا تەنها ٤٪ ی دانیشتوانی کورد بەپیشەسازییەوە خەریك بون،و ٩٠٪ بەکشتوکاڵ، لەکاتێکدا لەناوچەکانی تری تورکیا ٧٤٪ی خەڵکی خەریکی کشتوکاڵ‌و ١٠٪ خەریکی پیشەسازی بون،و لەسەرانسەری ناوچە کوردنشینەکاندا تەنها ٦,٨٪ ی دامودەزگاکان یاسای کارکردنیان تێدا پەیرەو کراوە[31].

---

[30] الدكتور حامد محمود عيسى، المصدر السابق، ص ٣١٤.

[31] م. أ. گیسارۆڤ‌و أ. رگوشین، کوردی تورکیا، وەرگێڕانی جەلال تەقی، وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ٨٩-٩٠.

لەزۆر بۆنەدا هەمیشە وا باس کـراوە کەیـەکێ لـەهۆکانی پشـتیوانیی دانیشتوانی ناوچە کوردنشینەکان لەخەباتی چەکدار لەدژی تورکیا ئەوەیـە کەباشـوری رۆژهـەلاتی تورکیـاو ناوچـەکانی رۆژهـەلات بەشـی هـەرە پاشەکەوتوی ولاتن، لەکاتێکدا کەرۆژئاوای تورکیا ولاتێکـی پیشەسـازییە لەچاو رۆژهەلاتی تورکیا کەئاوێنەی بەرچاوی ولاتێکی دواکەوتووە[32].

تورکیا پرۆژەی گاپی بە بەشێك لـەو سیاسـەتە دادەنـا کەئامانجەکـەی نەهێشـتنی نارەزاییـیە لـەنێو کـورداو هـەر بـەم پێیـە وای دانـابو کەگیروگرفتی کورد لایـەنێکی ئـابوریی هەیە کەئەگـەر چارەسـەر کـرا، بەشێکی زۆری مەسەلەکەش لەگەڵیدا چارەسەر دەکرێ[33].

ناوچەی پرۆژەکە ٩ ویلایەت دەگرێتەوە کەئەمانەن: ئادییەمان، باتمـان، دیاربەکر، گازی عەنتاب، کیلیس، ماردین، سیرت، شانلی ئورفەو شـیرناخ. دارایی‌ی گشتی‌ی پرۆژەکە ٣٢ ملیـار دۆلارە. روبـەری پرۆژەکـەش ٧٥٣٥٨ کیلۆمەتری دوجا دەبێ، واتە ٩,٧٪ ی روبەری تورکیا دەگرێتەوە[34].

پرۆژەکە بەتێکرایی‌و بەهەمو داموو دەزگاکانییەوە، لـە ٢١ بـەنداوو ١٧ وێسـتگەی بەرهـەم هێنـانی وزەی کارەبـا پێکدێ[35]. پرۆژەکـانی ئـاودێری کەبەهۆی گاپەوە پەیدا دەبن ١,٦ ملیۆن هکتار ئاو دەدەن، سـەرباری ٢٠٠ هەزار هکتار لەئورفەو ٤٠٠ هەزار هکتار لەرۆژهـەلاتی نسـەیبین. رێـژەی

---

[32] خلیل ماگنۆس کاراویلی، تورکیا: زلهێزێکی ئیقلیمی‌ی نوێی کۆن، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە ٤، ساڵی سێیەم، ١٩٩٥، ل ٩٥،

[33] کامـەران فـەهمی، گـاپ: راپۆرتێکـی گشـتی، گۆڤـاری سـەنتەری لێکۆڵینـەوەی ستراتیجی (چاپی دووەم) ژمارە ١، ساڵی یەکەم، ١٩٩٢، ل ١٥.

[34] سایتی ئورفە WWW Urfa.Com.

[35] کامەران فەهمی، سەرچاوەی پێشو، ل ٥.

تێکڕای ئەو زەوییەی کەپرۆژەکە ئاوی دەدا دەگاتە ٢٦,٩٪ ی ئەو زەوییەی کە لەتورکیا ئاو دەدرێ[٣٦].

لەپرۆژەکەدا بەنداوی ئەتاتورك بەبڕبڕەی پشتی تەواوی پرۆژەکە دادەنرێو لەم ڕووەوە بەپێنجەم بەنداو لەجیهاندا دادەنرێ. هەروەها تونێلی ئورفە لەگرنگترین داموو دەزگاکانی بەنداوەکەیەو بەهۆیەوە ئاوی ڕوباری فورات دەگەیەنرێتە دەشتەکانی ماردینو هاران کەکەوتونەتە دەرەوەی حەوزی فوراتو لەم ڕووەوە تونێلی ئورفە لەدوو تونێلی هاوتەریب پێکدێ کەدرێژیی هەر یەکێکیان ٢٨کلم دەبێو بەمە بەدرێژترین دو تونێل لەجیهاندا دادەنرێن[٣٧].

بەڵام دەبێ ئاماژە بۆ ئەوەش بکرێ کەهەندێ لەپرۆژەکان لەوانەی کەدواتر خرانە پاڵ پرۆژەی گاپەوە، لەساڵانی حەفتاوە دەست بەئەنجامدانیان کراوە وەك بەنداوی کەبان کەساڵی ١٩٧٤ بەئەنجام گەیشتو بەنداوی ئەتاتورك کەساڵی ١٩٨٣ دەست بەکارکردن تێیدا کرا. سەبارەت بەبەنداوی ئەتاتورك، خەرجیی مەزەندەکراوی ئەم بەنداوە بە ٤,٥ ملیار دۆلار دادەنرێ. ((ئەم پرۆژەیە لێی رادەبینرێ پەرە بەکشتوکاڵ بدا لەبەشە تورکیاییەکەی میسۆپۆتامیاو ٧٢٠ هەزار هکتار زەوی ئاو بدات))[٣٨].

جگە لەو هەمو قازانجەی کەپرۆژەکە لێی دەکەوێتەوە، پرۆژەکە زیانیشی لێ کەوتۆتەوە. لەوانە ئەوەیە کەئەم پرۆژەیە بۆتە هۆی دورخستنەوەی پەنجا

---

[٣٦] جون کولارس، مشکلة الطاقة وضرورة اللجوء الى الموارد المائية، ترجمة صلاح سليم، نشرة اوراق ترکية معاصرة، العدد ٤، الموصل، ١٩٨٧، ص ٧.

[٣٧] عايدة العلي سري الدين، العرب والفرات بين ترکيا واسرائيل، دار الافاق الجديدة، بيروت، ١٩٩٧، ص ٢٩.

[٣٨] الدکتور عبدالجبار عبد مصطفى النعيمي، المصدر السابق، ١٧٣.

هەزار کەس لەگوندە بچوك‌و هەژارەکانی هەرێمی ئورفە کــەزەوی‌و زاریــان بەهۆی دروستبونی دەریاچەوە لەپانتایی‌ی ٩٤٠ کلم٢، کەوتە ژێر ئــاوەوە[٣٩].

هەروەها لەناوچەی بەنداوی کەبان ٢٥ هەزار هاوولاتیی کــوردو لەناوچــەی بــەنداوی قــەرەقایا کەســالّی ١٩٨٧ تــەواو بــوو، ١٧ هـــــەزار هـــاوولاتی راگوێزران، سەرباری ١١٧ گوند لەناوچەی شانلی-ئورفە[٤٠]. جگــە لەوانــە، بیست هــەزار کەســی تــر لەناوچــەی بــەنداوی قــەرەباباو ٥٠ هــەزاری تــر لەدەریاچەی بەنداوی ئەتاتورك ئاوارە بون[٤١].

ئەو دەریاچانەی کە لەئــەنجامی ئــەم پرۆژەیــەدا پێــك هــاتن، چــەندین ناوچەی ئاوەدانی کوردنشینیان خستە ژێر ئاوەوە وەك شارۆچکەی سامسات‌و شارۆچکەی هسکیف[٤٢].

بەلاّم سەرەرای هەمو شتیّ، دەبیّ دان بەوەدا بــنریّ کــەقازانجی پرۆژەکــە زۆر لەزیانەکانی زۆرترە.

---

[٣٩] عوني عبدالرحمن السبعاوي، ابعاد ومؤشرات مشروع غاب (بحث مقدم الى ندوة المياه والسدود في تركيا التي اقامها مركز الدراسات التركية بجامعة الموصل في ١٩٨٨/١/١٠)، ص ٣.

[٤٠] د. عماد الجواهري وصلاح سليم علي، سد اتاتورك ومستقبل العلاقات التركية-العراقية (بحث مقدم الى ندوة المياه والسدود في تركيا التي اقامها مركز الدراسات التركية بجامعة الموصل) ص ١١.

[٤١] د. نصيف جاسم المطلبي، العلاقات العراقية-السورية-التركية في ضوء المياه المشتركة وافاقها المستقبلية، نشرة اوراق تركية معاصرة، العدد ٣/٤، الموصل، ١٩٨٩، ص ٢٤.

[٤٢] کامەران فەهمی، سەرچاوەی پێشو، ل ١٤.

### ٣- گاپ لەئامرازی هەڕەشەوە بۆ ئامرازی خزمەت

تا ساڵی ١٩٩١ پەیوەندیی نێوان کوردو حکومەتی ئەنقەرە پەیوەندییەکی بەزۆری گرژو نادۆستانە بوو بەڵام لە ١٩٩١ بەدواوە هەست بەسەرەتای گۆڕانێك بەرامبەر بەکورد لەتورکیا دەکرێ. لەنیسانی ئەو ساڵەدا پەرلەمانی تورکیا دو بڕیاری زۆر گرنگی دەرکرد:

یەکەمیان بڕیاری ئازادکردنی پێکەوەنانی حزبو لابردنی هەمو کۆتو زنجیرەکانی بەردەم پێکەوەنانی حزب بوو کەجاران لێ نەدەگەڕا حزبی سیاسی لەسەر بنەمای ئاینی یان چینایەتی دابمەزرێ.

دوەمیشیان بڕیاری لابردنی قەدەغەی بەکارهێنانی زمانی کوردی بوو لە ٢٢ی نیسانی ١٩٩١دا کەبەسەرەتای کرانەوەی حکومەتی تورکیا بەرامبەر بەکوردو رێ خۆش کردن بۆ ئاسایی کردنەوەی پەیوەندیی نێوان کوردو تورکیا دادەنرێ.

هاوتا لەگەڵ ئەم دو بڕیارەدا، حکومەت هەزاران گیراوی کوردی ئازاد کرد کە لەئەنجامدا تورگوت ئۆزال ناوبانگێکی زۆری پەیدا کرد[٤٣].

هەروەها لەسەرەتای ئەم سەدەیەشدا لەسۆنگەی هەوڵی بێ وچانی تورکیا بۆ وەرگیران لەیەکێتیی ئەوروپاو ئامادەبونی بۆ پراکتیزەکردنی پێوەرەکانی کۆپنهاگن سەبارەت بەچارەسەرکردنی کێشەی کەمینەکانو لەسۆنگەی نەرمیی پارتی دادو پەرەپێدانەوە کەرەجەب تەیب ئەردوغان رابەرایەتیی دەکا، کورد لەسەر ئاستی یاسایی و کەلتوریو سیاسی دەستکەوتی زیاتری بەدەست هێناو ئومێد هەیە لەمەولاش دەستکەوتی

---

[٤٣] الدكتور حامد محمود عيسى، المشكلة الكردية في الشرق الاوسط، مكتبة مدبولي، القاهرة، ١٩٩٠، ص ٢٨٣.

زیاتر بەدەست بهێنیٚو گوزەرانێکی باشتر لەسایەی پەرەسەندنی دیموکراسیو چاکبونی باری ئابوریدا بەخۆیەوە ببینیٚ.

لەم سۆنگەیەوە، ئەستەمە تورکیا بەچاوی جاران سەیری پرۆژەی گاپ بکاو وای دابنیٚ کەپرۆژەیەکە زیاتر کوردی پیٚ تێکهەڵکێش دەکریٚ لەگەڵ تورکو دەبێتە مایەی تورکاندنی.

ئەم پرۆژەیە جاران ترسی ئەوەی لەلای کورد پەیدا کردبوو کەدەشیٚ ببێتە هۆی گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی‌ی ناوچە کوردنشینەکانو وەك ئامرازێك لەلایەن حکومەتی تورکیا بەکار بهێنریٚ بۆ نیشتەجیٚ کردنی ژمارەیەکی زۆری تورك لەناوچە کوردنشینەکاندا. بەڵام ئەو سیاسەتانەی کە لەسەرەتای ساڵانی نەوەدی سەدەی رابردووەوە لەتورکیا پیادە دەکرێن، لەگەوهەردا گوزارشت لەپەشیمانبونەوەی تورکیا لەهەوڵی تورکاندنی کورد دەکەن. بەم پێیە، ترسی کورد لەم پرۆژەیە رەویوەتەوەو ئێستا وەك پرۆژەیەك بۆ بوژاندنەوەی باری ئابوریی کوردستان تەماشا دەکریٚ.

پرۆژەکە، بەو هەمو دەزگایەی لەسەر دجلەو فورات دامەزراون، دەبێتە هۆی بوژاندنەوەی ناوچەکەو لەڕوی بەرهەم هێنانی وزەی کارەباوە دەتوانیٚ ٧٥٥٧ میگاوات وزەی کارەبا بەرهەم بێنیٚ[٤٤]. هەروەها پێشبینی دەکریٚ ئاستی داهاتی ناوچەکە بۆ پێنج بەرابەر زیاد بکات. هەر لەم روەوە هەندیٚ لەسەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن پرۆژەکە لیٚی رادەبینریٚ توانای دابین کردنی هەلی کار بۆ ٣,٥ ملیۆن کەس ئەنجام بدات[٤٥].

[٤٤] خليل ابراهيم الناصري، التطورات المعاصرة في العلاقات العربية-التركية، مطبعة الراية، بغداد، ١٩٩٠، ص ١٧٧.

[٤٥] سایتی ئورفە، سەرچاوەی پێشوو.

**کۆبەند**

مەسەلەی کورد لەتورکیا مەسەلەیەکی دێرینە. سیاسەتی تورکیا سەبارەت بەهێشتنەوەی کوردستان بەدواکەوتویی سەرەنجامی خراپی لێ کەوتوە چونکە بەو مەبەستە نەگەیشت کەتورکیا دەیویستو کورد توانی سەرەڕای هەمو زەبروزەنگو چەوسانەوەیەك خۆی ڕاگرێو ناسنامەی نەتەوەیی‌ی خۆی لەدەست نەدات.

بەم پێیە، سیاسەتی دێرینەی تورکاندن کەپاش دامرکاندنەوەی شۆڕشی ١٩٢٥ی شێخ سەعید پیادە کرا، لەسەرەتای ساڵی ١٩٩١دا کۆتایی‌ی پێ هات، ئەویش بەگۆڕانی دیدی تورکیا بۆ مەسەلەکەو ڕێدان بە بەکارهێنانی زمانی کوردی.

ئەو تیۆری‌یەش کەبۆ ماوەی زیاد لەدە ساڵ بەگەرمی لەئارادا بوو کەگوایە مەسەلەی کورد لەتورکیا لەگەوهەردا مەسەلەی دواکەوتنی گشتی‌یەو ئەگەر چارەسەری ئەو لایەنە بکرێ، مەسەلەکە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بەچارەسەر دەگات، جێی سیاسەتەکەی پێشوی گرتەوە کەبریتی بوو لەسیاسەتی بەئەنقەست هێشتنەوەی کوردستان بەدواکەوتویی.

تورکیا لەڕەوتی سیاسەتێکی نوێدا هەوڵێدا لەڕێگای پرۆژەی گاپەوە چارەسەری مەسەلەی کورد بکات، ئەوەش لەو دیدەوە کەچارەسەرێکی ئابوری بۆ مەسەلەکە بدۆزرێتەوە. بەم پێیە، تورکیا بۆ ماوەیەك بڕەوی بەو تیۆرییە دا کە لەرێی پرۆژەی گاپەوە دەتوانێ باری دیموگرافی‌ی ناوچە کوردنشینەکان بگۆڕێو سەرکەوتو بێ لەگۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی‌ی کورد لەڕێی فاکتەرە ئابورییەکانەوە.

تورکیا وای دانابو بەبوژاندنەوەی ناوچەکە لەڕوی ئابورییەوەو دەستخستنی هەلی کار بۆ بێکارانو پەرەدان بەکشتوکاڵی ناوچەکەو

فەراهەم كردنی پێداویستی‌یەكانی كردنی ناوچەكە بەناوچەی گەشت‌و گوزار، دەتوانێ سوربون لەسەر ناسنامەی نەتەوەیی‌ی كوردانە كاڵ بكاتەوەو كورد بەرەو تێكهەڵكێشی بونی نەتەوەیی ببا. بەڵام سیاسەتی پەیڕەوكراوی توركیا لەساڵی ١٩٩١ بەدواوە، چەوتیی ئەم بۆچونە دەسەلمێنێ چونكە بەدەرچونی بڕیاری نەهێشتنی قەدەغەی زمانی كوردی، دەوڵەتی توركیا بەشێوەیەكی ناڕاستەوخۆ پەشیمانبونەوەی خۆی لەهەوڵەكانی توركاندن‌و تواندنەوەی كوردو سڕینەوەی ناسنامەی كوردانە راگەیاند. دەبێ ئەوەش بگوترێ كەئێستا كوردستانی باكور بەقەد جاران دواكەوتوو نیەو وەك دوكو ئاركیل لەوتارێكی رۆژنامەی ((توركیش دەیلی نیوز))دا وتویەتی، ئەو هەژارییەی كە دە ساڵ لەمەوبەر لەنێو كورددا باو بوو، ئەمڕۆ نەماوە[٤٦] .

لەم روانگەیەوە، ئەستەمە لێرە بەدواوە، بەتایبەتی لەسەردەمی ئەو ئاڵوگۆڕە سیاسییانەی كەتوركیا پیایدا تێدەپەڕێ، گاپ بەپرۆژەیەك بۆ هەڵسوڕاندنی مەسەلەی تێكهەڵكێش كردنی نەتەوەیی‌و سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوەیی‌ی كورد بژمێردرێ. ئەمڕۆ لەسایەی ئەو ئاڵوگۆڕانەدا گاپ یەكێ لەو پرۆژە گەورە ستراتیجی‌یانە دەبێ كەكوردی توركیا دەتوانێ لەڕوی ئابورییەوە سودێكی زۆری لێ وەرگرێ‌و بەم پێیە گاپ بەئامڕازێكی گرنگی بوژاندنەوەی ئابوریی ناوچەكە دادەنرێ‌و تەنانەت بونی ناوچەی پرۆژەكە لەكوردستاندا دەشێ ببێ بەفاكتەرێكی هێز بۆ خەباتی كورد بۆ بەدەست هێنانەوەی ناسنامەی نەتەوەیی‌و شادبون بەمافە نەتەوەیی‌یەكان.

---

[٤٦] دوكو ئاركيل، اكراد تركيا واوربا، مقال مترجم عن صحيفة تركش ديلي نيوز، جريدة (الاتحاد)، ٥/١١/٢٠٠٤، ص ٦.

## پاشكۆی ژماره ١

# توركیاو رێككەوتننامەی ئەوروپا سەبارەت بەكەمینەكان

**جەنگیز چاندار**

لەماوەی چەند مانگی داهاتودا توركیا دوچاری گێروگرفتێكی تر دەبێ، ئەویش رێككەوتنامەی ئەوروپایە دەربارەی كەمینەكان. لە ٧ی تشرینی دوەمی ١٩٩٣دا ئەنجومەنی ئەوروپا بۆ یەكەم جار كۆنفرەنسێكی بالای بەستو دۆكیومنتی ڤیەننای پەسەند كرد. سەرەك وەزیران تانسۆ چیلەر ئامادەی ئەو كۆبونەوەیە بوبوو و بەناوی توركیاوە دۆكیومنتەكەی مۆر كرد. كرۆكی رێككەوتننامەی ڤیەننا پاراستنی كەمە نەتەوەكانی ئەوروپایە. گومانی تێدا نیە كەئەم مەسەلەیەش پەیوەندیی بەمەسەلەی كوردەكانی توركیاوە هەیە.

بەپێی رێكەوتننامەی ڤیەننا كۆمیتەیەكی وەزاری كەئەنجومەنی ئەوروپا پێكەوەی نابو، رێككەوتننامەی كەمینەكانی ئامادە كرد. لەمانگی كانونی دوەمیشەوە دوانزە دەولەتە ئەندامەكەی ئەنجومەنی ئەوروپا یەك لەدوای یەك مۆری دەكەن. ئنجا پاش ئەوەی پەرلەمانەكانی ئەو دەولەتانە دەیسەلمێنن، بەكردەوە كاری پێ دەكرێ.

ئنجا پاش ئەم پێشەكییە، دەپرسین: ئایا توركیا چ هەلۆیستێك دەگرێتەبەرو بۆچی ئەم مەسەلەیە گێچەلی بۆ دەنێتەوە؟

وەزیری کاروباری هەندەران سویسـال بـەم جـۆرە هەڵوێسـتی تورکیـای دەربڕیـوە: ((بـەپێی ڕێککەوتننامەکـە، هـەر دەوڵـەتێك خـۆی کەمـە نەتـەوەکانی خـۆی دیـاری دەکـا. دیـارە ئـەم جـۆرە لێڵی‌یـەش بـەقازانجی ئێمەیە)). واتە وەزیری هەندەران لـەم روانگەیـەوە بـۆ مەسـەلەکە دەچـێ کەزاراوەی کەمینە جوان پێناسە نەکراوە. ئەگەر ئەم هەڵوێستە لەگەڵ ئـەو بۆچونـە کلاسـیکی‌یەدا بگونجـێ کـە لـەتورکیا بـاوەو وای دەبینـێ کـە ((لەتورکیاو بێجگە لەئەو کەمینانەی ناویان لەپەیمانی لۆزان هاتوە، هیـچ کەمینەیەکی تر نیە))، کەدیارە ئەمەش مەبەستە، ئەوا ڕێکەوتننامەکەی ئەوروپا دەربارەی کەمینەکان هیچ خێرێکی بۆ کوردی تورکیا لێ هەڵناوەرێ چونکە پەیمانی لۆزان وای بۆ دەچێ کەبەمەست لە ((کەمینـە)) گـروپ‌و تایفە ناموسڵمانەکانی وەك ڕۆم‌و ئەرمەن‌و جولەکەیـە. پەیمانەکـە هـەندێ ماف بۆ ئەو کەمینانە دەسەلمێنێ. لەسەر ئـەم بنچینەیـەدا دەشـێ بوتـرێ کەکورد بەپێی پەیمانی لۆزان ساکارترین مافی کەلتوریشـی نیـە. کـاتێك ئەم مەسەلەیەو هەڵوێستەکەی وەزیری هەندەران (سەبارەت بەسود وەرگرتن لەنارۆشنی‌ی مەسەلەی کەمینەکان لەرێککەوتننامەکەی ئەوروپا) بەیـەك تەرازو کێشانە دەکرێن، دەردەکەوێ کەتورکیا سورە لەسەر هەڵوێستی خۆی سەبارەت بەمەسەلەی کورد (واتە هـەڵ نـەهێنانی هیـچ هـەنگاوێك لـەم بارەیەوە). بەڵام ئەگەر تورکیا بەردەوام بێ لەسەر بـرِو بیـانو هێنانـەوە بـۆ پەیمانی لۆزان‌و کردنی بەئەستێلێك لەبەردەم هەر پرنسیپێکی مافناسـی‌ی نوێی ئەوروپاو ئەمریکادا، بناغە قانونی‌یەکانی خۆی بنکۆڵ دەکاو سـەری پەیمانی لۆزانیش دەخوا، چونکە لەسایەی ئـەم بارودۆخـە نوێیـەی دنیـادا ناکرێ بۆ هەتاهەتایە باسی فلان پەیمان بکرێ. سەربار، کاتێك پشت بەمانا حەرفی‌یەکانی پەیمانی لـۆزان دەبەسـترێ، هیـچ بیانویـەك بـۆ باسـکردنی روخساری نەتەوەیی‌ی کەمینەی تورك لەتراکیای رۆژئاوای یۆنان نـامێنێ،

چونکه پەیمانەکە لــە ((کەمینــەی رۆمــی ئــەرتۆدۆکس لەئیســتانبول))و ((کەمینــەی موســڵمانی تراکیــای رۆژئــاوا)) دەدوێ. ئــەوەش نیشـــانەیە کەســاڵانێکی دورودرێــژە یۆنانــەکان بەشــێوەیەکی دیمــاگۆگی بــەوە گــرەو لەتورکیا دەبەنەوە کە لەکاتی باسکردنی کەمینەی تراکیای رۆژئاوادا هانــا دەبەنە بەر ئەوەی کە گوایە وشەی ((تورك)) لەدەقی پەیمانی لۆزاندا نیــە. ســەرەنجام، پشــت بەســتن بەپــەیمانی لــۆزان وەك ســەرچاوە یــاخود هــەوڵی سودوەرگرتن لەلایەنــە تەمومژەکــەی رێککەوتننامــەی ئــەوروپا لــەبارەی کەمینەکانەوە، دادی تورکیا ناداو گیروگرفتیشی بۆ دەنێتەوە.

بەڵام ئەگەر کوردمان بــە ((کەمینــە)) ژمــارد، بــەندەکانی پاشــکۆی سێیەمی دۆکیۆمنتی ڤیەننا کەسەرزەنشتی وازە نژادیو تایفەگەریو ئانتی سامیستییەکان دەکەن پشتی کورد دەگرن چونکە رێککەوتننامەکەی ئــەم دواییەی ئەوروپا دەربارەی کەمینەکان لەبەر رۆشنایی‌ی دۆکیۆمنتی ڤیەننا سازکراوە. بەڵام خۆ کوردەکانیش رازی نین بەکەمینەیــەکی تورکیــایی نــاو ببرێن. لەسەرێکی ترەوە، سودوەرگرتن لەتەمومژی‌ی ناساندنی کەمینــە بــۆ نەسەلماندنی ناسنامەی کورد، لەگەڵ ئــەو دابو نــەریتو قانونانــەی ئــەو جیهانەدا رێکناکەوێ کەخەریکە پێ دەنێتە ســەدەی بیســتو یەکــەوە. خــۆ ئەگەر کوردەکان بەکەمینــە نــەژمێردرێن، ئــەوا داوای ((شــەریکایەتی)) دەکــەنو واز لەناســنامەکەی خۆشــیان نــاهێنن چونکــە تەنــها دو رێــیـان لەبەردەم دایە: یا کەمینە یا شەریك. ئەگەر ئەمەش بۆ ئــەوان گــیروگرفت بێ، ئەوا بۆ تورکیا گیروگرفتێکی گەورەترە.

بەڵام کوردی تورکیا چ کەمینە بن چ شەریك، ئەوا ئەم وڵاتە (تورکیــا) پاش ئەوەی دەست بەجێبەجێ کردنی رێککەوتننامەکەی ئەوروپا دەربــارەی کەمینەکان دەکرێ، چەند کەڵەوەکێشی بکــاو چــەند کەڵلــەرەقی بنوێنــێ ئەوەندەش بەدەم ئێشو ئازارەوە دەناڵێنێ.

ئەوی راستیش بیّ، کوردەکانی تورکیا کەمینـــە نـینو گیروگرفتەکـەش لێرەدایە. سەیرییەکەی لەوەدایـە کـەکوردەکان نـە لەروانگـەی دەولّەتـەوە کەمینەن نە لەروانگەی خۆیانەوە. دەولّەت لەم بارەیەوە دو بیـانو دێنێتـەوە کەیەکێکیان، هەروەکو وتمـان، پـەیمانی لۆزانـە کەتەنـها باسـی کەمینـە ناموسلّمانەکان دەکا وەك رۆمی ئەرتۆدۆکس، ئەرمەنو جولەکـەو دوەمیـان ئەوەیە کە بەپیّی ئەو فۆرمـەی لەسـالانی ئـەم دواییـەدا دارێـژراوە کـورد ((هاوولاتیی پلە یەکنو شان بەشانی هەمو هاوولاتییەکانی تری کۆمـاری تورکیا مـافی یەکسانیان هەیە)). ئەم خالّەی دواییش رێوشوێنێکی تـازەی نکۆلّی کردنە لەناسنامەی کورد چونکە حەفتا سالێکە دەلّێن ((هەمو ئەو هاوولاتییانەی لـەم ولاتـەدا دەژیـن بـەبیّ گوێدانـە ریشـەو رەچەلـەکیان، تورکن)). ئێمەش لەم خالّەوە دەستمان پیّ کردو بەرە بەرە گەیشـتینە رادەی دان نان بەبونی کورددا بەلام بەو پێودانگەی کەگوایە کـورد ((هـاوولاتیی پلە یەکنو شان بەشانی ئەوانی دیکەدا مـافی یەکسانیان هەیە)). ئەمـەش درێژەپێدانێکی زیرەکانەیە بـە((نکۆلّـی کـردن لەناسـنامەیان)) چونکـە کاتێك کورد بەپشت بەستن بەم مـافی هاونیشـتمانییە هـەولّ دەدا زمـانی خۆی لەفێرگەو رۆژنامەو راگەیاندندا بەکار بێنیّ، پیّی دەلّێـن ((نـەخێر، نابیّ! لەم ولاتەدا زمانێکی رەسمی هەیـە کـەزمانی تورکییـەو باسـکردنی هەر زمانێکی تر جگە لەزمانی تورکـی، جیاخوازییـە، دەتوانـن لـەنێوان خۆتانداو لەناو مـالّی خۆتاندا بەزمـانی خۆتان قسە بکەن)). باشـە ئەمـە چۆن لەگەلّ ((هاوولاتیی پلە یەكو مـافی یەکسان))دا هـەلّ دەکـا؟ چـۆن لەگەلّ دۆکیۆمنتی ڤیەننا دەگونجیّ؟ هەروەك چۆن ئایدیۆلۆژیای حکومـەت کورد بەکەمینە دانانیّ، کوردیش، بەلام لەسۆنگەی جیاوە. خۆی بەکەمینـە دانانیّو لەهەمان کـاتدا پێـی وانیـە کـەمافی یەکسـانی هەیـە یـاخود

هاوولاتی‌ی پله یەکە. بێجگە لەژمارەیەکی کـەمی کـورد، زۆربـەی کـورد رازی نیە پێی بوترێ کەمینە بەڵکو دەیانەوێ وەك شەریك تەماشا بکرێن.

ئەوەش بۆخۆی بەڵگەیە کەکورد هەزار ساڵ زیاترە رۆڵەی ئـەم وڵاتـەن‌و زیاتر لەنیوەیان تێکەڵاوی تورکەکان بون. لەسۆنگەی ئەوەشـەوە کەئیسـلام هەمو خەڵکی بردۆتە سەر یـەك ئاسـت، چـەندەها حاڵـەتی ژن‌و ژنخـوازی لـەنێوان کـوردو تـورکدا رویپداوەو چـەند لاکـەی دی زیـاتر نکۆڵـی لەناسنامەکەیان بکا، ئەوانیش زیاتر بەتەنگ ئەم ناسنامەیەوە دەچن. بەڵام زۆربەیان پێیان وا نیە کەبێجگە لەشـەریکایەتی هیـچ رێگایـەکی تریـان هـەبێ. ئەمـەش شـتێکی سـەیر نیـە چونکـە کوردەکـان بەشـدارییان لەدامەزراندنی کۆماری تورکیادا کردوەو شان بەشـانی تورکـەکان‌و بـاقی موسڵمانەکانی ئەناتۆلیا بەشدارییان لەجەنگی رزگاری‌دا کـردوە. لـەکاتی هەوڵە سەرەتاییەکانیش‌دا بۆ پێکەوەنانی ئەنجومەنی نیشتمانی‌ی گـەورەی تورکیا لەراگەیاندنەکاندا دەوترا کەئەندامـەکانی ئـەو ئەنجومەنـە تەنـها لەیەك نەتەوە نابن بەڵکو لەهەمو موسڵمانانی نەتـەوە جیاجیاکـان دەبـن. دەستوری ساڵی ١٩٢١یش باسـی چـەمکی ((دەوڵـەتی دامـەزراو لەسـەر بنچینەیەکی نەتەوەیی)) ناکـا. بەهـەر حـاڵ، دەبینـین چـەمکی نەتـەوە- دەوڵەت لەنیوەی دوەمی ساڵانی بیستدا، بەو جـۆرەی کـە لەسـەدەی ١٩دا لەئـەوروپا خـۆی سـەپاند، لـەتورکیاش خـۆی دەسـەپێنێ. ئـەمڕۆش، لەئاسـتانەی سـەدەی ٢١دا، خەریکـە ئـەم چەمکـەی دەوڵـەت دادەڕزێ. سەرەنجام، کرۆکی ((مەسەلەی کورد)) بۆتە ((سەر لەبەر دروستکردنەوەی دەوڵەت)) لەتورکیا. ئەمەش بەپێی پێویست بەمانای تازەکردنەوەی هـزرو بیرکردنـەوە دێ. لـەم سەروبەندەشـدا یـا دەبـێ تورکیـا پابـەندی رێککەوتننامەی ئەوروپا بێ دەربارەی کەمینەکان‌و مافە کەلتورییـەکانی کـورد بسـەلمێنێ، یـا کەڵەوەکێشی بکـاو وتـەکانی ((یەکسـانی‌و

هاونیشتمانیێتی ی پلە یەك)) وەك دەوڵەتێکی بەبنچینە نەتەوەیی، بجوێتەوە. ئەمـەش نـابیٚو بێجگـە لـەدرێژەدان بـەپڕوکانو داهـێزرانی وڵات هیـــچ ئاکامێکی دیکەی نابیٚ.

سەرچاوە: رۆژنامەی (SABAH) (ژمارەی ١٢و ١٣/١١/١٩٩٤)

## پاشکۆی ژماره ٢

# ئایا ناسنامەی دوولایەنەو فره کەلتوری، کێشەی کورد چارەسەر دەکا؟

یاسەمین دۆبرا مانچۆ

رۆژ لەدوای رۆژ کوردان زیاترو زیاتر درك بەتایبەتمەندێتیی رەچەڵەکی خۆیان دەکەن. ئەم وشیاریيە روو لەزیادبوونەو ئەو هێرشە تیرۆریستیو ئەو تەقینەوانەی پارتی کارگەرانی کوردستان(پەکەکە) ئەنجامیان دەدات، بوون بەتەوەری سەرەکیی گفتوگۆی نێوان پسپۆڕو رۆشنبیران. سەرەڕای پارچە پارچەییی ناوخۆی کوردانو هەواداریو لایەنگریی هەمەجۆرەیان بۆ عەشیرەتو هێزە ئیقلیمییەکان، وشیاریی روو لەزیادی کورد بەرامبەر رەچەڵەکی خۆیان وای کردوە ئەکادیمییەکان لەو مەسەلەیە بکۆڵنەوە کە بە((کێشەی کورد)) ناو دەبرێت.

کتێبێکی نوێی پڕ لەزانیاری ئەم کێشە ئاڵۆزو فرە جەمسەرە تاووتوێ دەکاتو بەشێوەی کێشەیەکی ئیقلیمی، نەك ناوخۆییی یەك دەوڵەت، مامەڵەی لەگەڵدا دەکات. کتێبەکە بەناونیشانی(کێشەی کوردو تورکیا: نموونەی ململانێی ئەتنیکی لەچوارچێوەی ناوچەیەك دا))لەنووسینی کەمال کیریشچیو گارێتو وینرۆ کەهەردوکیان لەبەشی سیاسەتو پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لەزانکۆی بونمازیچی لەئیستانبول

پرۆفیسۆرن. کتێبەکە بۆ ئەو ئەکادیمی‌یانە تەرخان کراوە کەدەیانەوێ باشتر لەگۆڕانکاری‌یەکانی رابردوو و ئێستا تێ بگەن‌و چارەسەرێکی گونجاو بۆ کێشەی کورد بدۆزنەوە. چاپی تورکی‌ی ئەم کتێبە لەلایەن بنکەی بلاوکردنەوەی ((تاریخ ڤاکڤی))یەوە چاپکراو کەوتە بازاڕەوە. چاوەڕوانیش دەکرێت لەچەند رۆژی داهاتوودا چاپی ئینگلیزی‌ی کتێبەکە بکەوێتە بازاڕەوە کە لەلایەن فرانك کاسەوە لەلەندەن چاپ دەکرێت.

لێکۆڵینەوەکە پێناسەیەکی گشتی‌ی کێشەی کورد لەتورکیا دەخاتە روو. هەموو گۆڕانکاریەکان هەر لەڕۆژانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌یەوە تا ئەمڕۆ دەست نیشان دەکات. بنچینەو سەرهەڵدانی کێشەی کورد لەڕێی خستنە رووی روداوەکانی پێش‌و پاش دامەزراندنی کۆماری تورکیا، ئەو کاتەی ئەتاتورك ولایەنگرانی رووبەڕووی ئەرکێکی دوولایەنە بووبوونەوە کەبنیاتنانی نەتەوەو دەوڵەتێکی مۆدێرن بوون، تاووتوێ دەکات. گێڕانەوەی مێژوویی‌ی رووداوەکان‌و لێکدانەوەیان تا سالآنی نەوەد لەخۆ دەگرێت‌و تیشك دەخاتە سەر دوایین گۆڕانکاری، کاتێك هەندێك لەسیاسەتمەدارانی تورکیا دانیان بەبوونی کێشەی کورددا نا.

نووسەرانی کتێبەکە چوارچێوەی ئیقلیمی‌ی کێشەکە رەچاو دەکەن. تیشك دەخەنە سەر ئەو راستی‌یەی کەکێشەکە لەچوارچێوەی یەك دەوڵەت ترازاوە. هێزەکانی-پەکەکە- کە لەتورکیادا چالاکن‌و دەیانەوێت بەشێوازی توندوتیژ دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی دابمەزرێنن، توانیویانە پەناگەی هێمن بدۆزنەوە بەتایبەتی لەباکوری عیراق کەکوردی تێدا نیشتەجێ‌یە. هەر لەم کتێبەدا کاردانەوەی کۆمەڵی نێودەوڵەتی بەرامبەر گۆڕانکاری‌یەکانی تورکیا، خراپی‌ی رەوشی مافی مرۆڤ‌و کاریگەری‌یەکانی پرۆسەی پرۆڤاید کۆمفۆرت لەباکوری عیراق، تاووتوێ کراون.

نووسەرەکانی کتێبەکــە بەپێناســەکردن و ســوودوەرگرتن لــەزاراوەکانی نەتــەوە، کۆمــەڵی ئــەتنیکی، ناســیۆنالیزمی مــەدەنی، ناســیۆنالیزمی ئەتنیکی، مافی کەمینەکان و مافی چــارەی خۆنوســین مــەوداو پانتــاییی گفتوگۆکانیان فراوان دەکەن. هەندێك لەچاودێرانی سیاسی پێیــان لەســەر ئەوە داگرتوە کەدەبێت ململانێی ئەتنیکی بــەرێگا چــارەی سیاســی نــەك عەسکەری چارەسەر بکرێت. نووسەرەکان چەند ئەگەرێك تــاووتوێ دەکــەن کە لەوانەیە لەئەنجامی چارەسەرێکی سیاسیدا بێنە ئاراوە، لــەو ئەگەرانــە فــرە کــەلتوری، زیــاتر دیموکراتــیزەکردن و دورکەوتنــەوە لەشــێوە حوکمــی ناوەندی. کەنووسەرەکان لەو باوەڕەدان ئەمانــە کاریگــەرترین و گونجــاوترین چارەسەرن. هەروەها ئەگەرەکانی دەســـت نیشــان کردنــی مــافی تایبــەتی، نەخشــەی فیدراڵــی شــێوەی جۆراوجــۆری ئۆتۆنۆمــی، کۆنفیــدرالی و جیابوونــەوەش تــاووتوێ دەکــەن کەنووســەرەکان بەچارەســەری واقیعییــان دانانێن.

## ناسیۆنالیزمی مەدەنی و گەشەکردنی ناسنامە

کتێبەکە پێناسەیەکی روونی کێشەی کورد ناکات، بــەڵام نووســەرەکان وابەســتەی((کێشــەی ناســنامە))و مســۆگەرکردنی مــافی راســتەقینەی کەمینەکان و رەهەندە ئیقلیمییەکانی کێشەکەن. هەردوو پرۆفیسۆر پێیــان وایە کێشەی پێناسەکردنی کورد لەناخی کێشەی کورد دایە کەچی هەردوو نووسەر گرنگیی جۆراوجۆریی ناسنامە تاووتوێ دەکەن.

لەبەر ئەوەی تورکیا وڵاتێکــی گەورەیــەو چــەندین گروپــی ئــەتنیکی و کەمینەی تێدا دەژی، هاوبەشی کردنی کەمینەکان لەدەسەڵاتدا مەترسیی دابەشبوون دروست دەکات، بۆیە نووسەرەکان درك بەوە دەکەن چارەســەرێك کەلەوانەیە هەڕەشە لەیەکێتیی دەوڵــەتی تورکیــا بکــات(وەك ســەلماندنی

ئۆتۆنۆمیی ئیقلیمی یان فیدرالیزم)، چارەسەرێکی چاوەڕوان کراوو پەسەند نی‌یە.

نووســـەرەکان ئاماژەیـــان بـــۆ ئـــەوە کـــردوە کـــە((دیـــاردەی جیاکاری))لەتورکیادا بوونی هەیە. بەو شێوەیە کورد لـەتورکیا گروپێکـی ئەتنیکی‌یە کەدانیان پێدانانرێت وەك کەمینەیەکی ئەتنیکی. نووسـەرەکان نوسـیویانە((زۆربـەی گروپـە سیاسـی‌یەکانی کـورد داوا دەکـەن مـافی راستەقینەی کەمینەکان بۆ کوردیـش دەسـتەبەر بکرێـت، بـەو ئومێـدەی دەستکەوتی زیاتری بەدوادا بێت)). هەر لەبەر هەمان هـۆی پێشـوو(واتـە مەترسی‌ی دابەشبوون)حکومەتە تورکی‌یـەکان پێ‌یـان خـۆش نی‌یـە ئـەم مەسەلەیە تاوانە بسەلمێنن.

نووسەرەکان بانگەشە بۆ ناسیۆنالیزمێکی مەدەنی‌ی راستەقینەو گونجاو دەکەن کە بەتەواوی رێ دەدات ناسنامەی کەلتوری‌ی جیاواز هەبێ‌و گەشـە بکات. لەسایەی سیستمێکی لەو جۆرەدا مرۆڤ دەتوانێت سەر بەو گروپانـە بێت کەرەچەڵەکی دەچێتەوە سەریان‌و لەهـەمان کـاتیش دا ئینتیمـای بـۆ دەوڵەتەکە هەبێت.

نووسەران لەکتێبەکەیان دا دەڵێن زۆر گرنگە لەوە تێ بگەین کـەمرۆڤ چۆن هەست بەخۆی دەکات‌و چۆن دەتوانێت چەند ناسنامەیەك هـەڵبگرێت. بۆ نمونە کەسێك دەتوانێت لەڕووی سیاسی‌یەوە خۆی بەتورك بزانێـت بـەڵام لەڕوی کەلتوری‌یەوە خۆی کورد بێـت. لەبـەر ئـەوە گرفـت لـەوەدا نـابینن کەخۆیان بەگوێرەی ئەو دەستەواژەیە پێناسە بکـەن کـەدەڵێت((بەختـەوەرە ئەو کەسەی دەتوانێ بڵێت تورکم)).

ئێستا هەوڵێکی زۆر جددی بـۆ ئـەوە دەدەرێ کەچـەمکی تـورك بـوون سەرلەنوێ لێك بدرێتەوە، بەو شێوەیەی کە لەڕاستی‌دا تورك ئەو کەسە بـێ کەهاوڵاتی‌ی تورکیایە، بەبێ گوێدانە بـاکگراوندە ئەتنیکی‌یەکـەی، ئـەم

پێناسـەکردنە دوولایەنــە یــاخود فــرە جەمســەرییە فــرە کــەلتوری لەتورکیایەکی یەکگرتوی دیموکرات دا مسۆگەر دەکا.

ویفرۆ و کیریشچی بۆ هێورکردنەوەی تەنگژەی ئەتنیکی و زەمینە خۆش کردن بۆ گوزارشت کردن لەناسـنامەی کـورد چـەند هـەنگاوێك پێشـنیار دەکەن: لەتورکیا ژمارەیەك کورد هەن کە لەڕوی سیاســییەوە ڕێکخـراون‌و هۆشیارن‌و داوای مافی زیـاتر دەکـەن بـۆ ئـەوەی مـافی خۆیـان بپارێزن. لـەجیاتی ئـەوەی داواکارییـەکان بـەداواکاریی کەمینـەکان نـاو بــبرێن، دەسەڵاتی ناوەندی دەتوانێت زنجیرەیەك ریفۆرمی ئەوتۆ لەدەستوری تورکیـادا بکات کەڕێ بدەن زمانی کوردی لەپەخشی پرۆگرامی رادیـۆو تەلـەفزیۆن‌و لەبواری پەروەردەدا بەکار بــهێنرێ. پێویسـت ناکـات ئـەم سازشـانە هــەر بـە((مــافی کەمینــە))ئاماژەیـان بـۆ بکرێــت. پێویســت ناکــات دان بەکەمینەیەکی کورددا بنرێت هەرچەندە سەرەنجام وەك داننان دەشــکێتەوە. نووسەرەکان ئاماژە بۆ ئەوەش دەکەن کــەنکوڵی کـردن لەهــەندێك مــافی دیاری کراو دەبێتە هۆی ناڕەزایی‌و بێزاریی کەمینەکە.

## یەکەکە تەگەرەی بەردەم فرە کەلتورییە

نووسەرەکان لەو باوەڕەدان کەشان بەشــانی پرۆســەی دیموکراتــیزەکردن، دەست پێکردنی پەیڤین لەگەڵ گروپە میانڕەوەکــانی کـوردو غــەیرە کـورد، هێشتا پشت بەناسیۆنالیزمی مەدەنی دەبەستێت.

بەڵام ویفرۆ و کیریشچی ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە((تاکوو پەکەکە درێژە بەو هێرش‌و چالاکی‌یانە بدات کە لەبنکەکانی وڵاتانی دراوسێوە ئـەنجامیان دەدات، حکومەتی تورکیا پێشــنیاری فرەکــەلتوری قبــوڵ ناکـات، بۆیــە دەبێت کۆمـەڵی نێودەوڵەتی درك بەنیگەرانی‌یە ئەمنی‌یــە مەشــروعەکانی تورکیا بکات. لەبەر ئەوە سەرکەوتنی پرۆسەی دروســتکردنی کۆمــەڵێکی فرەکەلتور لەتورکیا پشت بەو پێشکەوتنە دەبەستێ کـەبۆ چارەســەرکردنی

کێشەی کورد لەسەر ئاستی ئیقلیمی بەدەست دێ‌و هەروا دەوەستێتە سەر کۆتایی هاتنی هەوڵە توندوتیژەکانی پەکەکە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ.

نووسەرەکان دووگرفت دەست نیشان دەکەن: پێکهێنانی کەشێکی ئارام‌و هێمن لەناوچەکەداو پێویستی‌ی بوونی سەرکردەیەك(لەتورکیا)بیەوێ کێشەی کورد چارەسەر بکات.

نووسەرەکان بۆ ئایندەی نزیك پێشنیار دەکەن مافی زیاتر بۆ کورد مسۆگەر بکرێ‌و ڕێبازێکی هێمنانەی هەنگاو بەهەنگاو بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەی کورددا پیادە بکرێ. هەروەها نووسەرەکان لەو باوەڕەدان کەدەکرێ بەگەڕانەوە بۆ ئەزموونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی سیستمێکی مۆدێرنی میللەت پەرە پێ بدرێت کە لەسایەی‌دا دو ناسنامەیی هان دەدرێت، بەو شێوەیەی کەمرۆڤ هەم بەرامبەر گروپە ئەتنیکی‌یەکەی‌و هەم بەرامبەر بەدەوڵەتیش وەفادار بێت. هەر کاتێك فرە کەلتوری جێگیر کرا ئەوا بەسەر ئایدیۆلۆژیای ناسیۆنالستی ئەتنیکی‌دا زاڵ دەبێت.

## کێشەی تیرۆرو ناسنامەی سەربەخۆی کورد

زۆ لەئەندامانی هێزە چەکدارەکانی تورکیاو ئەنجومەنی نەتەوەیی‌ی بالآ لەو باوەڕەدان کەکێشەی کورد بوونی نیەو گرفتەکە بریتی‌یە لەتیرۆری پەکەکە کەناچاریان دەکات بۆ چارەسەرکرنی پەنا بەرنە بەر ڕێگاچارەی عەسکەری.

لەهەمان کاتدا کەسانی سیاسی‌ی کورد کەبڕوایان بەدەوڵەتی سەربەخۆی کورد هەیە لەم مەسەلەیە نائومێد بوون چونکە کورد نەوەك نەتەوەو نەوەك کەمینەی ئەتنیکی دانی پێدا نرا. ئایا ئەم نائومێدی‌یە دەبێتە بێزاری‌و هیوابڕانێکی وا کەپەکەکە بیکات بەکارتی یاری کردنی خۆی؟

خەمی سەرەکیی لێپرسراوانی تورکیا ڕێگەگرتنە لەزیاتر بەهێزبوونی پەکەکە. سازش کردن بۆ کورد لەتورکیا، لەکاتێکدا پەکەکە بەهێزە، لەوانەیە کلیلی کردنەوەی زۆر گرێ کوێرە بێت.

لەوەش زیاتر پەکەکەو کێشەی کورد تەنها لەسنووری تورکیا قەتیس نەماون. لێپرسراوانی تورکیا لەوە نیگەرانن گەر پەکەکە لەباکوری عیراق نفوزێکی هەمیشەیی پەیدا بکات، ڕەنگە بزوتنەوەیەکی ناسیۆنالیستی سەرتاسەری لەکوردستاندا ڕەگ دابکوتێ، هەرچەندە سوریاو عیراق‌و ئێرانیش بەرهەڵستی بزاڤێکی لەو جۆرە دەکەن. نووسەرەکان دەڵێن گەر پەکەکە بەتەواوی لەو بنکانە دانەبڕێت کە لەوڵاتانی دراوسێدا دروستی کردون، کێشەی کورد بەتەواوی چارەسەر ناکرێت. بەڵام لێرەدا ئەم پرسیارە خۆی قوت دەکاتەوە: ئایا کورد دەتوانێت بەبێ ترسی هەڕەشەکردن لەیەک پارچەیی‌ی خاک‌و گەشەکردنی سیاسی‌ی تورکیاو وڵاتانی دراوسێ مافەکانی پراکتیزە بکا؟ یەکێك لەو کێشانەی لەکتێبەکەدا تاووتوێ کراوە ئەمەیە کەکورد لەتورکیا ناتوانێت بەبێ ترسی هەڕەشەکردن لەیەك پارچەیی‌و ئارامی‌ی دەوڵەت گوزارشت لەناسنامەی خۆی بکات.

دواجار ویفرۆ و کیریشچی لەو باوەڕەدان کە بە لەبەرچاوگرتنی سروشتی ڕژێمەکانی عیراق‌و ئێران‌و سوریا، تورکیا ناتوانێت دەست پێشخەری‌یەکی ئیقلیمی سەبارەت بەکێشەی کورد گەڵاڵە بکات.

## ئایا توندوتیژی، زادەی ناڕەزایی‌یە یان ناڕەزایی زادەی توندوتیژی‌یە؟

زۆر لەلێپرسراوانی تورکیا پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کەتورکیا ڕووبەڕوی گرفتی تیرۆری پەکەکە بوەتەوەو هەر کاتێك تیرۆر ئیحتیوا کرا کێشەی کوردیش بەو شێوەیە بەئاسانی چارەسەر دەکرێت. هەندێك کەس لەو باوەڕەدان کێشەی تیرۆر پەیوەستە بەو ڕاستی‌یەوە کەکورد نەیتوانیوە

گوازرشت لەناسامەی ئەتنیکی خۆی بکات. ئەوان داکۆکـی لـەو بۆچوونـە دەکەن کەئەگەر زمانی کوردی لەخوێندنگـەو پەخشـی پرۆگرامـی رادیـۆو تەلەفزیۆن دا بەکار بهێنرێت تیرۆر لەئارادا نامێنێت. هەندێکی دیکە لـەو باوەڕەدان کێشـەکە پـەیوەندیی بەڕەوشـی ئـابوری، کۆمەلایـەتیو گەشـە نەکردنی باشوری خۆرهەلاتی تورکیاوە هەیە. کەچی هێشـتا ئـەو بۆچوونـە زاڵە کەپێی وایە سازشی کـەلتوری هـەنگاوی یەکەمـە بـەرەو لەبەریـەك هەلوەشانەوەی دەوڵەت. لەهەمان کاتدا لەخۆرهەلاتو باشوری خۆرهـەلاتی تورکیا توندوتیژی بەردەوامەو دەبێتە هۆی کۆچکـردنو زیـاتر خراپکردنـی باری کۆمەلایەتی، ئابوریو رەوشی سیاسی کەسەرەنجام دەمانگێڕێتـەوە بـۆ سەر کێشەی کورد.

## پەیڤین لەگەڵ کێدا؟

بەگوێرەی راپرسییەکان رێژەیەکی زۆر کەمی کورد رازین پەکەکە لـەو وتووێژانە بەشدار بێت بەمەبەستی دۆزینەوەی رێگا چارەیـەکی ئاشتییانە بۆ کێشەی کورد. زۆربەی کورد لەو بـاوەڕەدان کـەدەکرێ لـەرێی وتووێـژی نێوان کەسانی میانڕەوی کوردو دەسەلاتی تورکیا چارەسـەرێك بـۆ کێشـەی کورد بدۆزرێتەوە.

لەبەر ئەوەی لەتورکیادا شـەرعیەت نـەدراوە بـەو حزبـە سیاسـییانەی لەسەر بنچینەی ئەتنیکیی دادەمەزرێنرێن، دەکرێ حزبێکی سیاسـی پێـك بهێنرێت بێجگە لەناوەکەی لەهەموو روویەکەوە کورد بـێ، وەك HADEP کەلێپرسراوانی دەڵێن کتومت ئەم رێسایە دەنوێنـێ. ئـەوان سـەرنجی ئـەو حاڵـە دەدەنو چارەنووسـی پارلـەمانتارەکانی DEP دەهێننـە بـەرچاویانو دەڵێن((ئاشکرایە هەر حزبێکی سیاسی، کورد بێت یان نـا، دەبێـت خـۆی لەدروست کردنی پەیوەندی لەگەڵ پەکەکە بپارێزێت)).

هەر لەم کتێبەدا کاریگەریی حزبە سیاسی‌یە هۆمۆجینە ئەتنیکی‌یەکان تاوتووێ دەکرێت‌و ئەو پرسیارە دەوروژێنرێت کەئایا ئەم حیزبانە لەململانێی ئەتنیکی‌دا سود بەخش دەبن یان نا؟ هەندێك کوردی سەر بە حزبە سیاسی‌یەکانی غەیری پەکەکە لەو باوەڕەدان پێویستە پەکەکە بەشدار بێ لەگفتوگۆکاندا، بۆ ئەوەی زەمینەیەکی دیموکرات بۆ کۆتایی هێنان بەتوندوتیژی دروست بکرێت.

لەبەر ئەوەی لێپرسراوانی تورکیا ئامادە نین ئاوڕ لەپەکەکە بدەنەوە یان دانوستانی لەگەڵدا بکەن، دروست کردنی کەشێکی هێمنی فرە کەلتوری لەدەوری ئەو ناوچانەی سنورەکانی تورکیاو عێراق‌و ئێران‌و سوریا بەیەك دەگەیەنن کارێکی ئاسان نابێت تا پەکەکە چەك دانەنێت‌و چیتر حکومەتەکانی ناوچەکە لەوە نەترسن هاووڵاتی‌یەکانیان گوزارشت لەناسنامەکانیان بکەن.

تا ئەو کاتە بەچەك وەڵامی یاخی بوونی چەکدارانە دەدرێتەوە لەکاتێکدا گرژی‌و پشێویی باشوری خۆرهەڵاتی تورکیا بەردەوام دەبێت، کوردو غەیرە کورد وەك یەك بەهەراسان کراوی دەمێننەوە.

سەرچاوە: رۆژنامەی((تورکیش دەیلی نیووز))(٨/٦/١٩٩٧)

تێبینی‌یەکانی وەرگێڕ:

*فرە کەلتووری: Multiculturalism . وەکو لەم وتارەدا بەکارهێنراوە، جۆرە هاوڵاتێتی‌یەکە کە لەڕووی دەروونی‌و قەناعەتی فیکریشەوە، پێی وایە ئەندامانی کۆمەڵێکی ئەتنیکی‌ی دیاریکراو دەتوانن لەهەمان کاتدا ببنە هەڵگری فەرهەنگی سەر بەکۆمەڵێکی ئەتنیکی‌ی دیکە، ئەمە لەبۆچوونی نووسەرانی کتێبی لەسەر نووسراودا، رێگاچارەیەکی پێشنیار کراوی کێشەی کوردە لەتورکیا.

Trans-state ئەم زاراوەیە بۆ کێشەیەکی ئەتنیکی بەکارهێنراوە کە لەنێوان چەند دەوڵەتێکی جیاوازدا هەیە، وەکو کێشەی کورد. دیارە بوونی کێشەی وا چەندین تایبەتمەندیی دیکەی دەخاتە پاڵ و ئاڵۆزتری دەکات. ئێمە پتر ئەم زاراوەیەمان بە ((کێشەیەکی ئیقلیمی، نەک ناوخۆی یەک دەوڵەت))وەرگێڕاوە.

# تەوەری یەکەم

# ڕەوشی ئیسلام و عیلمانیەت لەتورکیا

عەباس خۆشناو

تورکیا یەکێکە لەو دەوڵەتانەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کەڕێبازێکی عیلمانیی ڕۆژئاوایی گرتۆتە بەرو دینی لەدەوڵەت جیاکردۆتەوە بەڵام لەهەمان کاتدا ئەو توانایەشی نیە کەئەم دو لایەنە پێکەوە بسازێنێ. لەبەر ئەوە لەکارخستنی حکومەتە ئیسلامی‌یەکەی حیزبی ڕەفا بەڵگەیەکی ترە لەسەر بەردەوامبونی قەیرانی ناسنامە هەم لەکۆمەڵداو هەم لەدەوڵەتدا، ڕوداوێکە ئاماژە بەلەرزۆکیی چەمکە لیبرالی‌یە عیلمانی‌یەکەی تورکیا دەکاو دەری دەخا کەدامەزراوی سوپا کلیلی پەیوەندیی نێوان دامەزراوە مەدەنی‌یەکان و دینی‌یەکانی کۆمەڵی بەدەستەوەیە، ئیتر بەرەچاوکردنی ئەو تەنگژە سیاسی‌یەی کە لەکارخستنی ڕەوشی ئیسلامی سیاسیی ڕەسمیی لێ کەوتەوە، ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵدەدا لەچەمکەکانی عیلمانیەتی ئەتاتورك بکۆڵێتەوە، لەو ڕوانگەیەوە کەجەنراڵەکان میراتگری ئەو عیلمانیەتەن و دەشیەوێ ئاسەواری فرە حزبیی سالآنی پەنجا لەسەر قۆناغی((زیندوبونەوەی ئیسلام))شی بکاتەوەو تێگەیشتنێك دەربارەی ململانێی نێوان ڕەوشی ئیسلامی سیاسی(بەشێوەی حزبی ڕەفاو ئەربەکانی سەرۆکی) و نێوان پێکهاتەی عیلمانیی مەدەنی-سوپاییی تورکیا پەیدا بکات.

## بابەتی یەکەم: عیلمانیەتی ئەتاتورك

ساڵی ١٩٦٥ یەکێ لەشارەزایانی کاروباری تورکیــا، واتــە دانــك وارت روستۆ، ئاماژەی بەوە کرد کەرەنگە پێشــبینییەکەی ســاڵی ١٩٦٤ دوبــارە ببێتــەوە چونکــە دەشــێ جەنراڵــەکان دیســان بڕیــار لەســەر ئــەوە بــدەن کەکەشتیی دەوڵەت لەوە گرنگترە کەبۆ سیاسەتمەدارەکان بهێڵدرێتەوە[١].

ئەم پێشبینییە سێ جار لەسەر یەك هاتــەدی، ئــەویش لەشــێوەی دوەم کودەتای سوپا لە١٢ی مارتی ١٩٧٠ دژی سلێمان دمیرەلی سەرەك وەزیران و سێیەم کودەتــای ١٢ی نیســانی ١٩٨٠ دژی ســەرۆك فــەخری کوروتــورك و چوارەم ((کودەتای)) ١٨ی حوزەیرانــی ١٩٩٧ دژی نەجمــەددین ئەربــەکانی سەرەك وەزیران، ئەگەرچی جەنرال کەنعان ئیڤرین لەسێیەم کودەتادا وتبــوی کەئامانجی ژیانیی بریتییە لە((گێڕانــەوەی تورکیــا بــۆ دیموکراســییەکی پایەدار بۆ ئەوەی بگاتــە ســاڵی ١٩٩٠ بــەبێ ئــەوەی پێویســت بــەوە بکــا کەسوپا وەك ساڵانی ١٩٦٠و ١٩٧١و ١٩٨٠ فریای وڵات بکەوێتەوە))[٢].

ئەو کودەتایانەی کەهەندێ کەس ناویان ناوە((نیمچــە کودەتــا)) بــەوە لێــك دەچــن کەهــەمویان خوێنــاوی نــین(جگــە لــەکودەتای دژی عــەدنان مەندرێس کە لەســاڵی ١٩٦٠دا بەکوشــتنی کۆتــاییی هــات)و لەوەشــدا یەکدەگرنەوە کەپاش هەر کودەتایەك جەنراڵەکان بۆ ماوەی ســاڵێك یــا دوو یا سێ دەســەڵات دەگرنــە دەســتو دەســکاریی نــاوخۆی دەزگــای مــەدەنی دەکــەن(وەك دەســتورێکی تــازە لەبابــەتی دەســتورەکانی ١٩٦١و ١٩٨٢)

---

[1] Dank wart A. Rustow, Turkey; The modevnity of Tradition in L.PYE and s. Verba (eds),
political culture and political Development, Princeton, 1965 P-141.

[٢] أبراهيم خليل واخرون، تركيا المعاصرة، مركز الدراسات التركيــة، دار الكتــب، جامعــة الموصل، ١٩٨٧، ص١٨٩.

یاخود بەرپەرچی ئەو هەرەشانە دەدەنەوە کەرووبەرووی دەستوورو بنەماکانی دەوڵەت دەبنەوەو هەوڵیش دەدەن جۆرە ئارامی‌یەکی سیاسی بەدەست بێنن. ئنجا، دوای هەمو ئەمانە، سوپا سەر لەنوێ دەچێتەوە ئۆردوگاکانی خۆی، ئەویش لەو روانگەیەوە کەسوپا ناتوانێ جێی دەزگاکانی کۆمەڵی دیموکرات بگرێتەوە[3]. چوارەم کودەتا گوزارشتی لەتەنگژەیەکی سیاسی‌ی ناوخۆ کرد کەبریتی بوو لەململانێی نێوان دامەزراوی سوپاو هێزە عیلمانی‌یەکان‌و نێوان حکومەتە رەهەند دینی‌یەکەی نەجمەددین ئەربەکان، ململانێ‌یەك کە لەکارکەوتنی یاخود راستتر لەکارخستنی حکومەتی ئەربەکانی لێ کەوتەوە، کەدواتر حکومەتێکی تری عیلمانی بەسەرۆکایەتی‌ی مەسعود یلماز چوە جێی.

بۆ تێگەیشتنی مەرام‌و نیازەکانی چوارەم کودەتاو ناسینی لایەنە بەشدارەکانی‌و دیاریکردنی سەرەنجامەکانی لەماوەدای نزیکدا، پێویستە لەدیاردەی سڕینەوەی وازی دینی لەکۆمەڵ‌و مێژوی تورك لەماوەی زێدەتر لەسەدەیەك بکۆڵینەوە چونکە مێژوی ئەم دابڕاندنەی کۆمەڵی تورك لەدین دەچێتەوە سەر دەسپێکی ریفۆرمسازی‌و هەوڵدانی دەوڵەت بۆ لاسایی کردنەوەی ژیانی رۆژئاوایی لەسەدەی هەژدەهەمەوە. لەو قۆناغەدا خوێندنی مەدەنی(شان بەشانی کردنەوەی خوێندنگەی عەسکەری)بەرە بەرە جێی بەخوێندنی دینی لێژکردو جێی گرتەوە[4]. ئەگەرچی مێژونوسی عیلمانیەتی تورکیا نیازی بیرکس وای بۆ چوە کەساڵی ١٧١٨ بەسەرەتای پەسەندکردنی بیرۆکەی عیلمانیەت لەدەوڵەتی عوسمانی دەژمێردرێ، ئەویش کاتێك

---

[3]جوکوف وأخرون، البلدان النامية وقضاياها الملحة، ترجمة الياس شاهين، دار التقدم موسكو، ١٩٧٨، ٢٧١.

[4]Bernard, Lewis, The Emeregence of Modren Turkey, Royal institute International Affairs, U.K-USA, 1968, P-419.

سولتان ئەحمەدی سێیەم(١٧٠٣-١٧٣٠)پرۆژەی پسپۆڕێکی فەرەنسایی‌ی پەسەند کرد کەدەیویست هەندێ لەڕواڵەتەکانی پێشکەوتنی ئەورووپا بۆ ناو دامو دەزگا عوسمانی‌یەکان بگوێزێتەوە، بەلام بەبۆچونی ئێمە سولتان مەحمودی دوەم(١٨٠٨-١٩٣٩)خاوەنی گەورەترین بەرنامەی ریفۆرمسازی‌ی پێشکەوتنخوازی‌یە. ئەم سولتانە بێ لەوەی کەهەوڵی‌دا دامو دەزگاکانی سوپاو خوێندنو داوەری لەبن دەستی مەلاکان دەربێنێو بیانخاتە ژێر چاودێری‌ی راستەوخۆی دەوڵەتو شارەزایانی عیلمانی، راگەیاندنێکی واشی بلاوکردەوە کەتاڕادەیەکی زۆر بەڕاگەیاندنی مافی مرۆڤو هاووڵاتی دەشوبهێنرێ. ئەمەش بەڵگەیە لەسەرئەوەی کەئەم سولتانە ویستویەتی دین لەدەوڵەت جودا بکاتەوەو بەیەك چاو تەماشای هەمو هاوولاتیان، چ موسڵمان بن چ غەیرە موسڵمان، بکات. ئەو لەم رووەوە وتویەتی((لێرە بەدواوە دەمەوێ رونو ئاشکرا بێ کەموسڵمانەکان لەمزگەوتەکانی خۆیاندا موسڵمانن، فەلەکان لەکەنیسەکانی خۆیاندا فەلەنو جولەکەکانیش لەپەرستگاکانی خۆیاندا جولەکەن. ئیتر لەدەرەوەی ئەم شوێنانەدا هەموان بەقەدەر یەکتری مافی سیاسییان هەیەو سولتان بەچاوێکی باوکانە سەیری هەموویان دەکا))[5].

قۆناغی تەنزیمات(ریفۆرمسازی)کەدوای سولتان مەحمودی دوەمیش درێژەی کێشا، بەتایبەتی لەسەردەمی عەبدولمەجید(١٨٣٩-١٨٦١)و عەبدولعەزیز(١٨٦١-١٨٧٦)و عەبدولحەمیدی دوەم(١٨٧٦-١٩٠٩)، بەوە گەیشتە لوتکە کە لەسالانی نێوان ١٨٣٩و ١٨٥٦دا چەند مەرسومێکی ریفۆرمسازی‌ی بنچینەیی دەرچو. ئەو مەرسومانە مافی هاوولاتی‌یانی دەوڵەتی عوسمانی‌یان بەبێ گوێدانە بیروباوەڕی دینی‌و جیاوازی‌ی رەگەزیان

---

[5] Ibid.

دابین کردو هەنگاوێکی گرنگیش بون بەرەو پەیڕەوکردنی قانونی دانراو. ئەگەرچی دەستوری ساڵی ١٨٧٦دانی بەوەدا ناوە کەئیسلام دینی رەسمیی دەوڵەتە بەڵام لەهەمان کاتیش دا دانی بەیەکسانیی مەدەنیو سیاسیی هەمو عوسمانییەکاندا نا، هیچ جیاوازییەکی لەنێوانیاندا نەکردو ساغی کردەوە کەنازناوی((عوسمانی))بە هەموو هاوولاتییە عوسمانییەکان دەوترێ بەبێ گوێدانە ئاینو نەتەوەکەیو هەمو هاوولاتییەکیش مافی بەجێ هێنانی فەرمایشتەکانی ئەو دینەی هەیە کەبڕوای پێیەتی.

پەیدابونی خوێندنگەی عیلمانیو بلاوبونەوەی چاپخانەو باوسەندنی تەرجەمە دەورێکی زۆری هەبو لەپەیدابونی چینێکی نوێ کەناونرا((نوخبەی نوێ)). ئەم نوخبەیە ریزە بیریارو رۆژنامەوانو یاساناسێکی زۆری گرتەخۆ. ئەمەش لەلایەکی ترەوە بەو مانایە دێ کە((ئەم چینە تەنها لەئەفسەران پێك نەهاتبو بەڵکو چینێك لەو روناکبیرانەشی لەخۆگرتبو کە بەکەلتوری رۆژئاوایی گۆش کرا بون))[٦].

جێی سەرنجە کەئەم توێژانە بیروبۆچونی وایان هەبو کەدواتر لەهەمو کۆڕو کۆبونەوە عوسمانییەکاندا دەوترایەوە وەك((نیشتمان))، ((نەتەوایەتی))، ((سەربەخۆیی نیشتمانی))،((پاراستنی زمانی نەتەوەیی))و هیتر. یەکێ لەو بیریارانە، واتە زیا کوك ئالب، بەراشکاوی گوزارشتی لەوە کرد کەگرنگە دین لەدەوڵەت جودا بکرێتەوە. لەم روەشەوە نوسەری تورك خالدە ئەدیب لەیاداشتەکانیدا بەرونی ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە((دەوڵەتە ئەوروپاییەکان بیرۆکەی مۆدێرنیان بۆ تورکیا دەستەبەر

---

[٦] أحمد نوري النعيمي، تركيا وحلف شمال الاطلسي، المطبعة الوطنية، عمان، الاردن، ١٩٨١، ص٣٣.

کـردو گیـانێکی نوێیـان لەئـەدەبیاتی نوسـەرانی تـورك پـەیداکرد))[٧].
لەسـۆنگەی ئەمـەوە شۆڕشـی تورکیـای لاو تاڕادەیـەك بەسـەرکەوتنی ئینتلجنسـیای بـیروکراتی مۆدێـرن بەسـەر کۆشـك دادەنـرێ[٨]. تەنانـەت سیاسەتی ئیمپراتۆریەت لـەماوەی چـەند دە سـاڵێك بـەر لـەوەی بڕوخـێ، بەڕونی گوزارشت لەدەسەڵاتی پتەوی((سیاسەتی نوخبە)) دەکـاو دەرفـەت بۆ بەشداری‌یەکی کەمی جەماوەر لەسیاسەتدا پێکدێنێ(چالاکی‌ی حزبـی-سیاسـی هەڵمـەتی هـەڵبژاردن، کۆبونـەوەی جـەماوەری، بەتایبـەتی لەسەردەمی تورکیای لاودا)بەڕادەیەك کە بەرنارد لویس ئاماژە بـەوە دەکـا کە((تا ئەو کاتە دان بەوەدا دەنرا کـەحوکم لـەتورکیا مافێکـە تەنـها بـۆ نوخبەیەکی پیشەوەر سەلمێنراوە کەهەمو مافو ئـەرکی سیاسـی‌ی خۆیـان پاراستوە، لەوانە ئۆپۆزیسیۆن. لەبەرئەوە پێشـڕەوانی ریفۆرمـی شۆڕشـگێڕ لەریزی فەرمانبەرانی دەوڵەت بوونو دەرچوی خوێندنگاکان بون. شـوێنێك کەنوخبەی مەدەنی‌و عەسکەری‌ی پەروەردە دەکردو خودی سـوڵتان بایـەخی تایبەتی پێ دەداو هەر لەوێشەوە تۆوی شۆڕش دەوەشێنرا))[٩].
دەسەڵاتی نوخبەی دەوڵەت تا ساڵانی چلی سەدەی بیستەم درێژەی کێشا. لەکاتێکدا دامودەزگـا سیاسـی‌یەکانی تورکیـا(لـەماوەی نێـوان ١٩١٩-١٩٢٥دا) سەرلەبەر دروست دەکرانەوە. پێکهاتەی نوخبە لەبنـەڕەتدا وەکـو خۆی مایەوەو دەسکاری نەکرا[١٠]. لەم رووەوە روستۆ ئاماژەی بەوە کـردوە کـە ٩٣٪ی ئەفسـەرانی سـتادی گشـتی‌ی ئیمپراتۆریـەتو ٨٥٪ی کارمـەندە

[7]C.H.Dodd, Democracy and Devlopment in Turkey univ of Hill, 1970, p-43
[8]Bernard, lwis, op-cit,pp-194-195.
[9]Dankwart A. Rustow, op-cit,pp-197-199.
[10]Dankwart Rustow & Rober A. ward, political modernization in Japan and Turkey, prtinceton, univ of prtinceton, 1964, p-388.

مەدەنی‌یەکان پاش هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەدەوڵەتی تازەی تورکیا خزمەتیان کرد[11]. بەقسەی فرای، لەماوەی نێوان ١٩٢٠و ١٩٤٧دا نزیکەی نیوەی پەرلەمانتارانی پەرلەمانە تاك حزبی‌یەکان لەکارمەندە رەسمی‌یەکان بون[12]. بڕوانە خشتەی ژمارە١.

نوخبەی دەوڵەت نوێنەرەوەی ئەو رەهەندە رۆژئاوایی‌یە بوو کە لەکۆتایی‌ی سەدەی ١٨و سەرەتای سەدەی ١٩دا سەری دەرهێناو لایەنە هەرە کلاسیکی‌یەکەی نوخبەی دەوڵەتی لەخۆ وروژاند. ئەو لایەنە کلاسیکی‌یە نەك هەر لەبەرچەند فاکتەرێکی دینی نەکەوتە جموجۆڵەوە بەڵکو هەروا لەترسان چونکە زەندەقی لەوە چو بوو نەبا ریفۆرم جێی پێ لێژکاو پلەوپایەکانی لیّ بسەنێتەوە. لەبەر ئەوە لایەکی ململانێکە لەگەوهەردا لەگەڵ ئەو رەوشە ئیسلامی‌یە بوو کەخۆی بەداکۆکیکەر لەئیسلام وەك دین دەزانی‌و لەلایەکی ترەوە نەبەردێك بوو بۆ هەڵتەکاندنی بناغەکانی پرنسیپە عوسمانی‌یەکەی حوکمی سێ قۆڵی(کۆشك، سوپا، خوێندنگە دینی‌یەکان)[13].

رێژەی پەرلەمانتارەکان دەری خستوە کە کەمالیستەکان لەبەرابیداو بەهۆی پێداویستی‌یەکانی جەنگی رزگاری‌یەوە ناچار بوون ژمارەیەکی تاڕادەیەك زۆر لەگەورە پیاوان‌و ناودارانو دەسڕۆکان‌و رێبەرە ئاینی‌یە ناوچەیی‌یەکان بخەنە ناو ئەنجومەنی یاسادانانەوە(کەبۆ یەکەم جار لەساڵی ١٩٢٠دا دامەزرا). بەڵام بەدرێژایی‌ی قۆناغی ئەنجومەنە تاك حزبی‌یەکانی

---

[11] Frederic w.Frey, The Turkish political Elite, The M.I.T, Press Massachusetts institute OF Technology cambridgs, Massachusetts, 2965, USA, 1965, PP-101, 190.

[12] لاري دايموند(اعداد)، مصادر الديمقراطية، ثقافة المجموع أم دور النخبة، ترجمة سمية فلو عبود، ط١، دارالساقي بيروت، ١٩٩٤، ص١٣٢.

[13] Ferderick w. Fery, op- cit, pp-195-197.

یاسادانان، تین‌و تاوی ڕێبەرە دینی‌یەکان تا دەهات زیاتر دەپوکایەوەو ڕۆژ بەڕۆژ لاوازتر دەبو. خولەکانی داهاتو(١٩٢٣-١٩٢٧ تا ١٩٤٧)پەردە لەڕوی لاوازی‌و بنێسی‌ی ڕەوتی ئیسلامی هەڵدەماڵن(بڕوانە خشتەی ژمارە١).

هۆی پاشەکشەی تین‌و ڕەوتی ئیسلامی لەپاش دامەزراندنی کۆمار بەشێوەیەکی بنچینەیی بۆ کەلتوری سیاسی‌ی نوخبەی سیاسی‌و هەوڵە زۆرداره‌کی‌یەکانی ئەتاتورك بۆ دورخستنەوەی ئیسلام لەناوەندی دەوڵەت دەگەڕێتەوە. بەم پێودانگە کەلتوری سیاسی‌ی نوخبە لەوەوە سەرچاوەی گرتبو کەڕژێمی کۆمەڵایەتی- ئیمپراتۆری بەڕیشە ڕژێمێکی دینی‌یە سەرەنجام ڕژێمێکە لێی ڕانابینرێ بەرەو گۆڕان بچێ، لەکاتێکدا ئەخلاقیەتی گۆڕان خۆی لەخۆیدا پێداویستی‌یەکی کەلتوری‌یە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی مۆدێرن- بەناوەندێتی‌و بیروکراسی تەکنیکە کارگێڕی‌یەکەی. فرای زۆر بەجوانی ماناو مەغزای ئەم گۆڕانەی ڕۆشن کردۆتەوەو وتویەتی((سیاسەتمەدارە نیشتمانپەروەرەکان کە لەلایەن هەندێ ئەفسەرو بیروکرات‌و بەشێوەیەکی گشتی لەلایەن ڕوناکبیرانەوە بەتوندی پشتیوانی‌یان لێ دەکرێ، دەیانەوێ لەسایەی چاودێری‌یەکی ناوەندی‌ی تۆکمەداو لەو چوارچێوە سیاسی‌یەی کەگونجاو دێتە بەرچاو، درێژە بەپێشخستنی تورکیا بدەن. ئەوانە لەم هەلومەرجەی ئەمڕۆدا بەلایانەوە ئاسایی‌یە دەست لەزۆر شت هەڵگرن بۆ ئەوەی لەئاییندەدا نەتەوەیەکی بەهێزترو لەڕوی پیشەسازی‌یەوە دەسترۆیشتوتر پێکبێ))[١٤].

پێشکەوتنیش کەخەڵکانێکی زۆر بڕوایان پێ هەبو پێویستی بەوە دەکرد کەئیمپراتۆریەت شوێن پێی ئەوروپا هەڵگرێ چونکە بەو شوێن پێ

[١٤] محمد محمد وفيق، كمال أتاتورك، دار الهلال، القاهرة، ١٩٣٦، ص١١٣.

هەڵگرتنە دەوڵەتێکی بەهێزی مۆدێـرن دەهاتـە دی. لـەم روەوە ئـەتاتورك وتویەتی(    دۆسـتایەتی‌ی رۆژئـاوا شـتێکی پێویسـتە.. رۆیشـتن لەتـەك رۆژئـاوادا لەشارسـتانێتی‌و ئـافراندن‌و زانسـتەکانی‌دا دینـی ئێمەیـە. ئیسلامیش کەدینی خودایە، هەمو ئەو روخسارانەی لێ دادەمـاڵم کەدەبنـە هۆی وروژاندن‌و دوژمنایەتی‌ی رۆژئاوا))[15]. بـەم مانایـە، عیلمانیـەت وەك گواستنەوە وایە لەجیهانێکەوە بۆ جیهانێکی تر کە بەزۆر بەسەریدا سەپاوە، بەمەش سیفەتی مێژو کردی عیلمانیەت وەك رەهەندێکی شۆڕبوەوە بەناخی رۆژگارداو لەقاڵبدراو بەپێی چوارچێوە کەلتوری‌و کۆمەلآیەتی‌یەکان لـەنێو دەچێ‌و ئـەو چوارچێوانـە وەك دکتـۆر مـارتن گوزارشـتی لێ کـردوە دەوری((پالآوتە))دەگێڕن‌و لەو رێوشوێنەدا دەردەکـەون کەهـەمو گـەلێك‌و هەمو ولآتێك لەبەکارهێنانی ئەقلآنیەت‌و تەکنیك دا پەیڕەوی‌ی لێ دەکا[16].

ئـەم پالآوتانـە لـەلای ئـەتاتورکیش باویـان هـەبو. هـەر ئەویشـە کەوتویەتی((پێویستە درەختی شارستانێتی‌ی رۆژئاوا بێنینـە ولآتەکـەمان. بۆ ئەوەی ئەم درەختە بژی پێویستە ئەو ژینگەیەشی لەگەڵدا بێنین کەتێیدا ژیاوەو بۆ ئەوەی ئەم درەختە لەشوێنە تازەکـەیدا بـڕوێ پێویسـتە وردە وردە لەگەڵ ئەو ئاوو هەواو ئەو خاك‌و خۆڵەدا رایبێنین کە لەناوەڕاستنی ئاسیاوە لەگـەڵ خۆمـاندا هێنـاومـانن. هـەمو ئەمانـەش بـەمانای پچڕاندنـی یـەکجارەکی‌ی پەیوەندی‌یـەکانمان بەرۆژهەلآتـەوە دێـن- پەیوەندی‌یـەك کەلەسەڵتەنەت‌و خەلافەتەوە بەمیرات بۆمان ماوەتەوە))[17].

---

[15] د. مارتن، أتجاهات عامة ومصاف تأريخية، المجلة السنوية لعلم أجتماع الدين، العدد الثالث، ١٩٧٩، ص ص ١-١٦.

[16] محمد محمد وفيق، مصدر سابق، ١٤٧.

[17] نفس المصدر، ص١٦٩.

بەهەر حاڵ، لەتێگەیشتنی دوراییەکانی عیلمانیەتەکەی ئـەتاتورکدا جیـاوازی هـەبو. هـەندێ پێیـان وابـوو ئـەم عیلمانیەتـە((بـەفیڕۆدانی دینە))یاخود((کۆتایی هێنانـە بـەدین))لـەرەوتی هـەوڵداندا بـۆ کردنـی کۆمـەڵی دینـی بەکۆمـەڵێکی مـەدەنی-ڕۆژئـاوایی و دورکەوتنـەوەی یەکجارەکی لەبایەخدان بەدین. ئەوەش بەڵگەیە کەئەتاتورك سـاڵی ١٩٢٧ لەپـەیڤینێکی ڕۆژنامـەوانیدا بەئاشـکرا وتویـەتی کەئـەو((نازانـێ ئایـا حکومەتەکەی پەیڕەوی لەدینێك دەکا یان نایکا))[١٨].

سـەرەڕای ئەمـە، کـەمالیزم بەگومانـەوە دەیڕوانییـە شـێوەکانی بیرکردنەوەی دینی کەپێی وابو هـەرچی لەسروشـت وکۆمەڵدا ڕودەدا زادەی هێزێکی بان سروشتییە، بیرکردنەوەیەك کەبونی ئەوەی پـۆل ڕێکـۆر نـاوی ناوە((بیروبـاوەڕی ئامـادە))قبـوڵ دەکـا گوایـە هـێزێك هەیـە هـەم دنیـا هەڵدەسوڕێنێ و هەم خودی خۆیشی لەدنیاکە باڵاترە. ئەتاتورك لەوتارێکیدا لەئەنجومەنی گەورەی نیشتمانی تورك گوزارشتی لـەو بـەگومان کەوتنـەی خۆی کردو وتی((تورکیا دەسبەرداری غەیبیات بـوەو قـانون لـەو کتێبانـە ناکرێنێ کەدەڵێن گوایە لەئاسمانەوە هاتونەتە خوار))[١٩]. لـەکاتێکدا دیـن هەمو شتێکی دەگرتەوە بەو پێودانگەی کەهەرچی کۆمەڵایەتی بوە بـەپێی پێویست کاری بەسەر دینیشەوە هەیە، دیـن بـوە پەیوەندییـەکی ویژدانـی لەنێوان کەس و ئافەرێنەر((دین شتێکە لەنێوان من و خوادایە.. تا لەژیاندا بم دین و دنیا لێك جیادەکەمـەوە.. ئـا ئەمەیـە پـەیامی مـن بـۆ جیـهان و بەتایبەتی بۆ ڕۆژهەڵات))[٢٠].

---

[١٨] ضابط تركي سابق، الرجل الصنم: كمال أتاتورك، ترجمة عبدالله عبد الرحمن، ط٢، الشركة المتحدة للتوزيع، بيروت، ١٩٧٨، ص ٢٢٥.
١٩ محمد محمد وفيق، مصدر سابق، ص ١١٤.
[٢٠] الرجل الصنم، مصدر سابق، ص ١٦٦.

بەجۆرە دەردەکەوێ کەکەمالیزم ویستویەتی پەراوێزی دین تەنگەبەرتر بکا. ئەمەش رێك لەگەڵ مەنتقی لێك جوداکردنەوەی دینو دەوڵەتدا رێکدەکەوێ وەك مەرجێکی بەدی هێنانی عیلمانیەت لەسەر هەمو ئاستێکی سیاسی، یاسایی‌و کەلتوریی دەوڵەتی مۆدێرنی تورکیا.

ئەوەش دروستە کەکەمالیزم لەبەراییدا هەوڵی داوە رەوشێکی دنیایی بگرێتە بەر، لەبەرئەوە لەسەرەتادا پۆستی دینی‌و پۆستی سیاسی‌ی لێك جیا نەکردەوەو خەلیفایەتی‌و سوڵتانێتی‌ی بەیەك شت دادەنا، واش خۆی نیشاندەدا کەدژی هەوڵی لێك جیاکردنەوەیانە. لەم روەوە مستەفا کەمال لەیەکەم وتاریدا لە٢٣ی نیسانی ١٩٢٠ دا لەئەنجومەنی گەل دا وتی((بەو پێودانگەی کەپۆستی دەسەڵاتو پۆستی خەلیفایەتی یەك شتە، سوڵتانەکەمان بەسەرۆکی کۆمەڵانی خەڵکی موسڵمان دەزانین. یەکەم مەبەستی جیهادمان لێك جیاکردنەوەی پۆستی دەسەڵاتو پۆستی خەلیفایەتی نیە بەڵکو مەبەستمان ئەوە بەدوژمنان راگەیەنین کەئیرادەی گەل دژی ئەم لێك جیاکردنەوەیە))[21].

رەنگە هۆی پێداگرتن لەسەر یەکبونی پۆستی سیاسی‌و دینی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کەعیلمانیەت مانایەکی رونی نەبوەو رەنگە خودی مستەفا کەمال لێی تێ نەگەیشتبێ‌و ماناکەی لەوە رەت نەبووبێ کەبریتی‌یە((لەوەی کەمرۆڤ بین))[22] . هۆی تریش ئەوەیە کە کەمالیزم وەك تاکتیك دەیویست دامو دەزگا کۆمەڵایەتی‌یەکان بوەستنە سەرپێ‌و سەروەری‌و ئایدیۆلۆژیای عیلمانی‌و بنەمای کارکردنی خۆیان دارێژن. لەم روانگەیەوە ئەوە تێدەگەین کەبۆچی ئەتاتورك بۆ ماوەیەك داواکار بوو لەماددەکانی ٢و ٢٦ی دەستور نەکۆڵرێتەوە، بەتایبەتی کە لەماددەی

[21] نفس المصدر، ص ٣٣٢ ، ذكريات على كليج، جريدة الجمهورية، ١٩٥٢.
[22] محمد محمد وفيق، مصدر سابق، ص١٦٩.

دوەمدا هاتبو کە((ئیسلام دینی رەسمی‌ی دەوڵەتی تورکیایــە)). ئــەتاتورك لەبارەی ئەم دو مــاددەوە لــەوتارێکی ســاڵی ۱۹۲۷دا وتویــەتی((ئــەم دوو ماددەیــە لەگــەڵ کاراکتــەری دەوڵــەتی مۆدێرنــی تــورك‌و کارگێڕی‌یــە هاوچەرخەکەی کۆماردا ناگونجێن‌و ئەوسا وتمان قەیناکا با ئەم دو ماددەیــە بمێنن بەڵام پێویستە لەسەر گەل لەیەکەمین دەرفەتی گونجاودا ئەم کێمانــە پاك بکاتەوە))[۲۳]. ئەمـــەش زۆری نــەخایاند چونکــە ئــەوەندەی پــێ نــەچو کەمالیزم کەوتە وێزەی ئاین‌و تەنگی پێ هەڵچنی، بەڕادەیــەك کــەدەکرێ‌و رەوایە باسی نـــادینی‌ی دەوڵــەت بکــەین چونکــە ئــەتاتورك دەســتی کــرد بەتەنگەبەرکردنی شێوەی ژیانی دینــی‌و هەڵکــەندنی ریشــەی لەکۆمــەڵ‌و مێــژوداو دامــاڵینی یــەکجارەکی‌ی کۆمــەڵ لەئیسـلامی‌یەکان. دواتریـــش ماددەی دوەمی دەستور هەڵوەشێنرایەوەو ئیسلام وەك دینی رەسمی‌ی دەوڵەت نەمایەوەو دامودەزگا کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌یەکانی دەوڵەت رێیان پێ نــەدرا هیچ دەورێکی دینی بگێڕن، ئەویش بەسڕینەوەی واژەی تەحکامی شــەرعی لەماددەی ۲٦ی دەستور. ئــەو بڕگەیــەی مــاددەی ۳۸یــش کەتایبــەت بــوو بەسوێندخواردن لەبەردەم سەرکۆماردا، دەسکاری کــراو لــەجیاتی ســوێند بەخوا سوێند بەشەرەف جێ‌ی گرتەوە.

ناوەڕۆکی عیلمانیەتی ئــەتاتورك ســەرەتا رێچکەیــەکی ئــایدیۆلۆژی‌ی گرتە بــەر. ئــەوە نیشــانەیە کــە لەیەکــەم کۆنگــرەی رۆژی ۱٥ی تشــرینی یەکەمی ۱۹۲۷ی پارتی گەلدا، حزبەکە چــوار پرنســیپی کــردە کۆڵەکــەی رژێمــی مۆدێرنــی تورکیــا کــەبریتی بــون لــەکۆمارخوازی، میللییـــەت، گەلپەرستی‌و عیلمانیەت. لەدوەم کۆنگرەی ساڵی ۱۹۳۱یــش دو پرنســیپی تری بۆ ئیزافە کرا کەبریتی بون لەدەوڵەتپەرستی‌و شۆڕشگێڕی. بــۆ ســاڵی

---

[۲۳] أبراهيم خليل وآخرون، مصدر سابق، ص ١٦٠.

١٩٣٧يش ئەم شەش پرنسیپە خرانە نێو دەستورەوەو بونە بناغـەی رژێمـی دەوڵەت. بەجۆرە دەستور تورکیای بە((کۆمارێکی میللی، گەلی، دەوڵـەتی، عیلمانی، شۆڕشگێڕ)) ناساندو عیلمانیەتیش ئـاوا روون کرایـەوە((حـزب وەك پرنسیپێکی بنەڕەتی رازیە بەوەی کـەقانونو سیسـتمەکانی دەوڵـەت بەپێی زانستو هونەر دابنرێن. حزب لەگـەڵ بنچینـەو پێداویسـتیەکانی شارسـتانێتی مۆدێـرن دا خـۆی دەسـازێنیو پێـی وایـە دیـن شـتێکی ویژدانیەو تا لەچوارچێوەی قانون دا بێ ئەو مافـەی هەیـە کـە لەهـەمو دەسـدرێژیەك بپـارێزرێ. حـزب لـەو بڕوایەدایـە کەجیاکردنـەوەی دیـن لەکاروباری سیاسەتو دنیا هۆیەکی سـەرەکی پێشـکەوتنو سـەرفرازیو سەرکەوتنی گەلە لەهەمو بوارێکدا))[٢٤].

جگە لەمە، عیلمانیەتی ئەتاتورك روخسارێکی قـانونیو کارگێڕیشـی وەرگرتو لەوەدا دەرکەوت کەهەوڵیدا تینو تـاوی دیـن لەکۆمـەڵی تـورك خـامۆش بکـاو لـەم سـەروبەندەدا چـەندەها یاسـاو دامـەزراوی تایبـەت بەکاروباری دین بەرکەنار کرانو لەجێی ئەوان یاساو دامـەزراوی مـەدەنی دانرا. سەرەتا خەلافەت بـەپێی قـانونی ژمـارە ٤٢٩ی ٣ی مـارتی ١٩٢٤ هەڵوەشـێنرایەوە، ئـەویش پـاش ئـەوەی مسـتەفا کـەمال چـەند جـارێك رایگەیاند کەخەلافـەت گرنگـی خـۆی لەدەسـتداوە هیـچ پاسـاوێك بـۆ مانەوەی نیە. کەمالیستەکان بۆ پاکانەکردن بۆ هەڵوەشاندنەوەی خەلافـەت کتێبیـان بـەزمانی تورکـی بەناونیشـانی((خەلافـەتو دەسـەڵاتی نەتەوە))دەرکردو تێیدا برەویان بۆ((دەوڵەتی شارستانی))پەیدا کرد. دواتـر لەبری ئەو کۆمەڵە یاسایەی بە((مجەللە))ناسرا بـوونو پـەیوەندیو مافـە بنەڕەتیـە ئیسـلامیەکانی فیقـهی ئیسـلامییان پێکدەهێنـا، کۆمەڵـە

---

[٢٤] الرجـل الصنـم، مصـدر سـابق، ص ٣٥٤ عـن(رضـا روشـان يوجـر، ذكريـات حـول أتاتورك).

یاسایەکی مەدەنی‌ی رۆژئاوایی( بەتایبەتی سویسری‌و ئیتالیایی)داهێنرا، بەو بەهانەیەی کەقانونە شەرعی‌یەکان تەگەرە لەهەوڵە نوێخوازی‌یەکان‌و دانانی رژێمێکی قانونی‌و نوێ‌و یەکگرتو دەدەن. هەر لەو رۆژەشدا، واتە لە٣ی مارتی ١٩٢٤دا، قانونی ژمارە ٤٢٠ دەرچو کە بەهۆیەوە وەزارەتی ئەوقاف‌و کاروباری شەرعی هەڵوەشێنرایەوەو وەقفە دینی‌یەکانی کرانە((وەقفێکی میللی))کەحکومەت داهاتەکەی بەسەر کۆمەڵە خێرخوازەکان‌و شارەوانی‌و نەخۆشخانەکاندا دابەش کرد.

بەپێی قانونێکی تریش تەکیەو مەزارگەو هەمو تەریقەتە سۆفی‌یەکانی مەولەوی، نەقشبەندی، نورچی، تیجانی، بەکتاشی‌و دەروێشی‌و فالگرتن‌و جادویی‌و پاسەوانی‌ی گۆڕستانەکان قەدەغەکران. جگەلەمە، بەپێی قانونی ژمارە ٤٣١ی رۆژی ٣ی مارتی ١٩٢٤ خوێندنگە ئاینی‌یەکان هەڵوەشێنرایەوەو هەمو دامودەزگا زانستی‌و ئاینی‌یەکانی تورکیا بەوەزارەتی مەعاریفەوە بەسترانەوە.

بۆ تەواو دابین کردنی پێداویستی‌یەکانی عیلمانیەتیش، پاراستنی زمان‌و کەلتوری تورک لەئاسەوارەکانی زمان‌و کەلتوری بیانی، بەتایبەتی ئەو ئاسەوارەی لەرێی دینەوە دێ، کرایە بیانویەك بۆ ئەوەی بانگ بەزمانی تورکی بێ نەك بەزمانی عەرەبی، لەروانگەی ئەتاتورکەوە ئەم مەسەلەیە((مەسەلەیەکی زمانەوانی‌یە نەك دینی))[٢٥].

ئەو توندوتیژی‌یەی کە کەمالیستەکان لەسەپاندنی سیاسەتی خۆیاندا پەیڕەویان کرد کاردانەوەیەکی توندوتیژی پەیدا کرد. ئەوە بەڵگەیە کەکوردەکان لەشۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ی شێخ سەعیددا داوایان کردبو سەلیمی کوڕی سوڵتان عەبدولحەمیدی دوەم بکرێتە خەلیفەو سوڵتان بەڵام

---

[٢٥] نفس المصدر السابق، ص ٣٠٠ عن حديث لمصطفى كمال.

مستەفا کەمال کەوتە پەیجوری شۆڕشەکەو ڕێبەرەکانی هەڵواسی[٢٦]. بەرناد لویس دەگێڕێتەوە کەپاش هەڵایسانی شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ی ناوچە کوردنشینەکان، ئەتاتورك قانونی پاراستنی ئارامیی سەپاندو ئەو قلفونە هەمو لایەنە بەرهەڵستکارەکانی ناچار کرد لەبەرپەچدانەوەی ڕژێمو سیاسەتەکانی بسلەمێنەوە[٢٧]. لەیەکەمو دوەم ئەنجومەنی نیشتمانیش خەڵکانی ناڕازی هەبو. لەیەکەم ئەنجومەنی نیشتمانیدا باڵێکی ناو ئەنجومەن کەسێیەکی ئەندامانی ئەنجومەنی تێدابو(واتە ١٢٠ کەس لەسەرجەمی ٣٨٠ پەرلەمانتار) پێی وابو تەنها بەپتەوکردنی پەیوەستە دینی‌یەکان وڵات بەسەربەخۆیی دەگات. ئەم باڵە زۆربەی نوێنەرانی ئەرزرۆمی تێدابو(وەك عەلی شوکری، محەمەد عاکف وهی‌تر) بەڵام لەبەر پەراگەندەیی‌و نەبونی هیچ کارنامەیەکی رون، نفوزو دەسەڵاتی خۆی لەدوەم ئەنجومەنی نیشتمانیدا لەدەسدا. دواتر، لەدوەم ئەنجومەنی نیشتمانیدا، بەرهەڵستی‌یەکی سەخت بەسەرۆکایەتی‌ی ڕەئوف ئوربای جەعفەر، دامەرزێنەرانی پارتی تەرەقی جمهوریی ساڵی ١٩٢٤، سەری هەڵداو یەکەمین دروشمی بریتی بوو لەڕێزگرتنی حزب‌و بیروباوەڕە دینی‌یەکان‌و هەوڵدان بۆ گێڕانەوەی خەلافەت‌و بەڕێوەبردنی دەوڵەت بەپێی بنەما دینی‌یەکان.((لەسۆنگەی ئەمەوە ئەنجومەنی نوێنەران قانونی بێدەنگ کردنی دەرکردو.. ئەو حزبە سیاسی‌یە زیانبەخشەی قەدەغە کرد کەناوی لەخۆ نابو پارتی تەرەقی))[٢٨].

---

[٢٦] محمد أمين زكي بك، خلاصة تاريخ الكرد وكردستان، نقله الى العربية محمد علي عوني، مطبعة السعادة، مصر، ١٩٣٩، ص٨٣.

[27]Bernard, Lewis, op-cit, p-93 l.

[28]

Vol,30, NO-I,October, 1951,p-139.

هەر لەو ماوەیەشدا چەند گروپێکـی دینـی لـەداخی هەڵوەشـاندنەوەی خەلافەت کەوتنە جموجوڵەوەو لەم سەروبەندەدا دکتۆر سەباحەددین زەعیـم راوێژکاری ئابوریی نەجمەددین ئەربەکانی سەرەك وەزیرانـی تورکیـا باسـی لەوە کردوە کە نەمانی کتوپڕی خەلافەت، واتە نەمانی تاکە خەلیفەو تاکە هێماو تاکە رابەر، ئەو هەستەی لـەلای موسـڵمانانی تورکیـا پـەیدا کـرد کەپێویستە لەدەوری هێمایەك کۆ ببنەوە، لەبەرئەوە هەر گروپـەو لـەدەوری رابـەری دینـیـی خـۆی کۆبۆوە[29]. بـەمجۆرە نەورەسـی‌یەکان لـەدەوری بەدیعوززەمانی سەعید نەورەسی کۆبونەوە، سلێمانی‌یەکان لەدەوری ئیمـام سـلێمان حیلمـی توناخـان، نەقشـبەندی‌یەکان لـەدەوری رێبـەرە نەقشبەندی‌یەکانیانو هەر هێمایەك رێڕەوێکی بۆ داڕشتنەوەی ئیسلام دانا. بەم پێودانگە بەدیعوززەمانی سـەعید نەورەسـیو نورجـەلاری گروپەکـەی پشتیان بـەو فەلسـەفەیە بەسـت کـە لـەکتێبی((رسـائل النـور))دا رون کرابۆوە. ئەو فەلسەفەیەش فەلسەفەیەکە بۆ سەلماندنی یـەکخوازییو سـاغ کردنەوەی باوەڕو پتەوکردنی کێشمەکێشـە هزریـیـەکان بـۆ پایـەدارکردنی گەڕاندنەوەی ئیسلام. گروپی سلێمانی‌یەکانیش پێی لەسەر ئەوە داگرت کە لەڕێی زمانی عەرەبی‌یەوە دەکرێ ئیسلام بگەڕێنرێتـەوە بـۆ تورکیـا، بـەو پێودانگـەی کـەقورئان بناغـەی ئیسـلامەو دیراسـەکردنی زانسـتە ئیسلامی‌یەکان بەزمانی عەرەبی رێبازێکی پـیرۆزو پایەبـەرزە. لایـەنگرانی ئـەم گروپـە مژدەیـان بەخـەڵکی دەدا کەسـوپای سـلێمانی‌یەکان تورکیـا لەعیلمانیەتو خوانەناسی رزگار دەکا[30].

---

[29] د. محمد حرب، آليات الحركة الاسلامية في تركيا(ملف السياسة الدولية، مجلة السياسة الدولية، العدد ٢٣٠ الاهرام) القاهرة، ١٩٩٨، ص ١٢٩.

[30] د. ارنست آ. رامزور، تركيا الفتاة وثورة ١٩٠٨، ترجمة د. صالح أحمد العلي، منشورات دار مكتبة الحياة، بيروت، ١٩٦٠، ص١٣١.

## بابەتی دووەم: ژیانی فرە حزبی و بوژانەوەی ئیسلام

گەڕانەوەی دین بۆ تورکیا پاش دوەم جەنگی جیهانی- بەو جۆرەی کەپێی دەوترێ((بوژانەوەی ئیسلام))- رەنگە هاندەرێك بێ بۆ رەنگ رشتنی مەسەلەکە بەشێوەیەکی تر کەروخسارەکانی لەوەدا دەردەکەون کەدەشێ عیلمانیەت و ئاین پێکەوە هەڵ بکەن، واتە بەپێچەوانەی مەرجەکانی ئەتاتورکەوە. بەم پێودانگە فاکتەرە سەراپا دینیەکان لەدەستنیشان کردنی رواڵەتەکانی ئەم پەیوەندیەدا هاوئاهەنگ بون لەگەڵ فاکتەرە پرەگماتیکیەکان(فاکتەرە ئابوری و سیاسی و نێودەوڵەتیەکان) لەم سەروبەندەدا لێکۆڵینەوەکانی سۆسیۆلۆژیای دینەکان و سۆسیۆلۆژیا بەگشتی ئاماژە بۆ باری ئاڵۆزی دیاردەی گۆڕانی کۆمەڵی دینی دەکەن. بەم پێودانگە((لەخۆ هەڵگەڕانەوەی عیلمانیەت لەبەر وەڕسبون لەجیهانی بێ خودایی شتێکی مومکینە))[31].

هەر ئەمەشە هۆی سەردەرهێنانی بزوتنەوە دینیە تازەکان و گەشەکردنی رەوتە ویژدانیەکان لەهەمو کۆمەڵەکانداو لەتورکیا بەتایبەتی، چونکە نیگەرانی و سام لێ نیشتن و خۆ بەنامۆ زانیی مرۆڤ لەم دنیا پان و بەرینەدا، لەلایەك پەردە لەڕوی لاوازیی دامودەزگا مەدەنیەکان و شکست لەپاراستنی مرۆڤ هەڵدەماڵێ. ئەربەکان لەوەڵامدانەوەی پرسیارێکدا دەربارەی ناودەرکردن و گەشەسەندنی کەف و کوڵی پارتی رەفا وتویەتی((هۆی ئەم مەسەلەیە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەمێژە هاوڵاتیی تورك پشت گوێ خراوە))[32]. لەلایەکی ترەوە ئەم

---

[31] "بيتر برجيه، مواجهات مع الحداثة"(مترجمة) السياسة والدين، باريس، سنتوريون، ١٩٨٠، ص١٩٨.

[32] سعد عبد المجيد، الفكر في تركيا، مجلة قضايا دولية، عدد ٣٥٨، السنة السابعة، ١١نوفمبر ١٩٩٦، ص٢٥.

مەسەلەیە بەڵگەیە لەسەر دارزانـــی تــەونی کۆمـەڵایـەتی. هـەندێ کـەس ئۆباڵی دارزانی تەونی کۆمەڵایەتی دەبەنەوە سەر نەمانی بەهاکانو مردنـی دین. لەبەر ئەوە پارتی عەدالەت لەساڵانی شەستدا لـــەماددەی پێنجـەمی پەیڕەوی ناوخۆیدا دانی بەوەدا نا کە((باوەڕهێنان بەبەهاکانو دابو نەریتی سیستمی کۆمەڵایەتی)) شتێکی پێویستە[٣٣].

هۆیە پرەگماتیکی‌یەکانی گەڕانەوەی دینیش بۆ تورکیا بۆ ئەو ئازادی‌یە سیاسی‌یە دەگەڕێتەوە کە لەرژێمی سیاسی‌ی تورکیادا بــەدی دەکـرێ، ئـەو رژێمە سیاسی‌یە پاش ئەوەی دوای جەنگی دوەمی جیهان خۆی لەسیســـتمی تاك حزبی راپسکاند. سیستمێکی فرە حزبی دامەزراند، حــزبو رێکخــراوە سیاســی‌یەکان لەســایەی سیســتمی فــرە حزبــی‌دا(ئــەوەندەی مەســـەلەکە پەیوەندی‌ی بەگەڕانەوەی دینەوە هەیە)بەسەر دوو گروپـــدا دابـەش کـراون، یەکــەمیان ئــەو حــزبو رێکخــراوە سیاســـی‌یە لاوەکی‌یانـــە دەگرێتـــەوە کەمەیلێکیان بەلای ئیسلامدا هەبوە. ئەوانـــەش لەمەســەلەکانی ریشـەی ئیسلامی‌یانەی تورکیاو گێڕانەوەی خوێندنی دینـــی‌و هەڵوێســت ســەبارەت بەعیلمانیــەتو کەمکردنــەوەی سانســۆر لەســەر پـــەیڕەوە دینی‌یـــەکان، یەکدەنگو یەکڕانین. لەو حزبانە پارتی راپەڕینی نەتەوەیی کەساڵی ١٩٤٥ لەسەر دەستی چەند نەتەوەپەرستێکی دینپەروەرو دامەزرا. بەرنامــەی ئــەو حزبە بانگەشەی بۆ پان ئیسلامیزم دەکرد. دواتر لە١٩ی تـەموزی ١٩٤٦دا نەجمی کوناشو مستەفا ئۆزبەكو میناسوار پارتی پارێزگارانی ئیســلامیان دامــەزراندو لــە١٢ی ئــەیلولی هــەمان ســاڵدا ســەرکردایەتی‌ی حوکمـــی هەرەمەکی‌ی تورکیا ئەو حزبەی داخســت بــەو بیــانووەی کــەدینی کردۆتــە ئــامرازی سیاســەت. لــە٨ی تــەموزی ١٩٤٧دا جـەواد رفعـــەت ئـــەتیل

---

[33] Nuri Eren,Turkey Today and Tomorrow, USA, 1963 P-93.

خان(ناسراو بەدوژمنایەتی کردنی جولەکەو زایۆنیزم کەتیمێکی چەکداری بۆ رزگارکردنی فەلەستین لەجولەکە پێکهێنابوو و سودی لەوە وەرگرتبوو کە لەمەوبەر جەنرالێکی سوپا بوە) لەگەڵ زەکائی دیکو بەکتاکورالی پارتی پارێزگارانیان پێك هێناو لەخۆناساندنەکەیدا وتبوی حزب لەبەرنامەکەیدا پشت بەبنەما ئیسلامی‌یەکان دەبەستێ. کاربەدەستانی دەوڵەت حزبەکەیان لیٚ داخست بەر لەوەی دەست بەنواندنی چالاکی بکا. پاشان فەوزی جاقماق(دەسکەلای ئەتاتورك لەکۆنترۆڵ کردنی سوپاو کاروباری سوپا) لەساڵی ١٩٤٨دا پارتی نەتەوەی دامەزراند کەیەکێکە لەدینیترین حزبەکانی ئەو سەردەمەو چارتەرەکەی ئەوەی تێدا هاتبو کەحزب رێزی داب‌و نەریتی وڵات‌و دین دەگرێ بەڵام برواشی بەلێك جیاکردنەوەی دین‌و دەوڵەت هەیە. بەڵام لەتەموزی ١٩٥٣ حکومەت ئەم حزبەی لەکارخست گوایە دەیەوێ پاشایەتی‌و خەلافەت بگێڕێتەوەو حزبێکە دژایەتی‌ی رژێمە کۆماری‌یەکەی ئەتاتورك دەکا. پاشان ئەم حزبە بەناوی پارتی کۆماری‌ی گەلەوە سەری هەڵدایەوەو گەرای لەنێو هەمو گروپ‌و توێژەکاندا دانا. لەهەڵبژاردنی ساڵی ١٩٤٦یش بەشداری‌ی کردو پێنج کورسی‌ی لەپەرلەماندا وەك نوێنەری شاری کیرشەهر، کوانوی دەروێشە بەکتاشی‌یەکان، بەدەست هێنا. جگە لەم حزبانە گروپی ئیسلامی‌ی دیکەش چالاکی‌ی نواند وەك((پارتی پارێزگاری لەئیسلام))، ((پارتی دیموکراتی ئیسلامی))و((کۆمەڵەی رۆژهەڵاتی گەورە)). ساڵی ١٩٥٣ تۆمەتی هەوڵی تیرۆرکردنی رۆژنامەوانی بەناوبانگی تورك ئەحمەد ئەمین یلمان لەشاری مەلاتی خرایە پاڵ دو رێکخراوە ئیسلامی‌یەکەی دوایی‌یان. یلمان لەسەرانی جولەکەی دۆنمەو سەرنوسەری رۆژنامەی((وەتەن))بوو کەرۆژنامەیەك بوو بەدوژمنایەتی کردنی ئیسلام‌و دۆستایەتی کردنی زایۆنیزم ناسرا بوو. گروپی دوەمی حزبە سیاسی‌یەکانیش ئەوانەن

کەپەیڕەوییان لەکەمالیزم دەکرد بەڵام بەرامبەر بەمەسەلەی دین نەرمو نیان بون. لەحزبەکانی ئەو گروپە دو حزبە سەرەکی‌یەکەی وڵات: پارتی گەلی کۆمارو پارتی دیموکرات کە لە٧ی کانونی یەکەمی ١٩٤٦ دامەزرابوو وتاکە حزب بوو کەبەرهەڵستی‌ی حزبەکەی ئەتاتورکی دەکردو رەوشتی دینی‌ی تورکیاش شوێنێکی لەناوی بۆ خۆی پەیدا کردبوو. لەهەڵبژاردنی ساڵی ١٩٤٦دا حزبی یەکەم بردی‌یەوەو ٣٩٥ کورسی‌ی پەرلەمانی بەدەست هێنا. بەرامبەر بە ٦٦ بۆ پارتی دیموکرات. بەڵام لەهەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٠دا پارتی دیموکرات سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناو دەسەڵاتی گرتە دەستو تا ساڵی ١٩٦٠ بەردەوام بوو، کاتێك سوپا لە٢٩ی ئەیلول ١٩٦٠دا هەڵیوەشاندەوە.

سەرانی هەردو حزب سەریان لەوە دەرکردبو کەئیسلام هێزێکی کاریگەرەو هەستی دینیش لەلای خەڵکی‌دا خامۆش نەبوە بەتایبەتی لەناوچە لادێ نشینەکاندا کە کەمالیزم نەیتوانی بوو زۆر دەستی تێوەرداو تەنانەت هەندێ شاریش وەك کوانوی بەها دینی‌یەکان مابونەوە وەك قۆنیەو سیواسو هی‌تر. رۆژنامەگەری‌ی تورك مەیدانێکی گرنگ بوو بۆ هێرشکردنە سەر عیلمانیەت. لەسۆنگەی ئەمەوە دەبینین رۆژنامەکان لەساڵی ١٩٤٦وە پێ لەسەر گرنگی‌ی خوێندنی دینی‌و دەوری لەگێڕانەوەی بەها ئەخلاقیەکاندا دادەگرن. بەم پێودانگە زۆر پەرلەمانتار رایانگەیاند کە((گەلی تورك بەرپرس نیە لەکردەوەکانی ئەتاتورك‌و لێپرسراوەتی‌ی پچڕانی پەتی بنچینە ئەخلاقی‌یەکانی کۆمەڵی موسڵمانی تورك ناخاتە ئەستۆی خۆیەوە))[٣٤].

---

[٣٤] أبراهيم خليل وأخرون، مصدر سابق، ص ١٦٠.

مەسەلەی دین بوو بەیەکێ لەمەسەلە سەرەکی‌یەکانی مایەی مشتومڕو پێشبڕکێ لەنێوان هەردو حزبدا. ئیتر فرە حزبی ململانێی سیاسی‌و پێشبڕکێی نێوان حزبەکان دورایی‌یەکی سیاسی‌ی بۆ مەسەلەی دینی پەیدا کرد چونکە هەردو حزب ئەم مەسەلەیەیان وروژاندو ویستیان بۆ بەدەست هێنانی دەنگی دەنگدەران لەکاتی هەڵبژاردندا کەڵکی لێ وەرگرن بەتایبەتی کە بەقسەی میشال نۆڤێل لایەنگرانی مەسەلەی دینی ٣٠٪ی دەنگی دەنگدەرانیان پێکهێناوە[٣٥].

سیاسەتەکانی پارتی گەلی کۆمار پاش برانەوەی دوەم جەنگی جیهان هەوێنی گۆڕانێکیان سەبارەت بەمەسەلەی دین لێ بەدی دەکرێ کەبەپێی هەندێ بۆچون هۆکەی دەچێتەوە سەر هەوڵدانی حزب بۆ ئارایشت کردنی روخساری خۆی‌و پایەدارکردنی سەنگی حکومەت. لەو هەنگاوانەش کەحزبەکە لەو ماوەیەدا هەڵی هێناوە ئاوەدان کردنەوەی هەندێ مزگەوت کە لەڕوی مێژویی‌و بیناسازی‌یەوە بایەخی تایبەتی هەبوەو بڕیاری دروست کردنی پەیکەرێك بۆ سوڵتان محەمەدی دوەم کەبەڵگەیەکە لەسەر بەهەند وەرگرتنی پێشینەی ئیسلامی‌یانەی دەوڵەتی مۆدێرنی تورکیا. هەمان ساڵ بەشی یەکەمی ئەنسکلۆپیدیای ئیسلامی دەرچو کەوا باسی ئیسلامی تێدا هاتبو کەخاڵێکی وەرچەرخانە لەمێژوی دنیاداو بەپێچەوانەی بیرو ئەندێشەکانی دامەزرێنەرانی تورکیای کەمالیستەوە پێشەکی‌یەکە ئاماژەی بەوە کردبو کەتورك بۆیە بونە موسڵمان چونکە ئیسلام دینێکە لەگەڵ کیان‌و کاراکتەری نەتەوەیی‌یاندا دەگونجێ. هیچ گومانیش لەوەدا نیە کەنەدەکرا ئەو ئەنسکلۆپیدیایە لەسەردەمی ئەتاتورکدا دەرچێ.

---

[٣٥] دینا صلاح شحاته، الاسلام السياسي ومستقبل العلمانية في تركيا، مجلة السياسة الدولية، مصدر سابق، ص ١٥٤.

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو تۆمەتانەی کەپارتی دیموکرات دەیخستە پاڵی‌یەوە گوایە پارتی گەلی کۆمار((حزبێکی دژی ئیسلامە))، حزبەکە درێژەی بەپیادەکردنی چەند سیاسەتو هەڵوێستێکی دینی داو لەساڵی ۱۹٤۷دا ڕێی بەهاوولاتیانی دا بچن بۆ حەجو لەساڵی ۱۹٤۹ بەدواوە رازی بوو خوێندنی دین لەخوێندنگە سەرەتایی‌یەکاندا ئارەزوومەندانە بێ. بێ لەوە لەهەمان ساڵ دا رازی بوو کۆلیجی شەریعەت لەزانکۆی ئەنقەرە، کەئەتاتورك ساڵی ۱۹۳۳ لەزانکۆی ئیستانبولی قەدەغە کردبو، بکرێتەوە. لەمارتی ۱۹٥۰یش قانونێکی سەبارەت بەفراوانکردنی کارگێڕیی کاروباری دینی دەرکردو پێش هەڵبژاردنی ئایاری ۱۹٥۰ بەڵێنی‌دا کە لەمەودوا نزرگەو مەزارگاکان بۆ زیارەتکاران دەکاتەوەو هەمیشە وەك وەفاداری ئیسلام دەمێنێتەوە. بەڵام حزبەکە ئەم هەڵبژاردنەی دۆڕاند. پێش هەڵبژاردنیش سیاسەتی حزب گۆڕانێکی دیاری بەسەرداهات، ئەویش بەوەی کەویستی ئەندامە ئوسولی‌یەکانی خۆی لەپارتی نەتەوە دورەپەرێز راگرێ، حزبێك کەزادەی جیابونەوەی ساڵی ۱۹٤۸ بوو لەپارتی دیموکرات.

پارتی دیموکراتیش هەوڵێکی زۆری بۆ بەدەست هێنانی دەنگی گوندنشینەکان دا، لەبەر ئەوە بەڵێنێکی زۆری پێ دان. دواتریش پاش بردنەوەی هەڵبژاردن بەشێکی زۆری بەڵێنەکانی خۆی جێبەجێ کردو لەم سەروبەندەدا پەرلەمان رازی بوو ئەو مافە بۆ بانگدەر بسەلمێنێ کەبانگ بەتورکی یا بەعەرەبی بدا. زۆربەش بانگی بەزمانی عەرەبی پێ باشتر بوو* بەم پێیە ماددە ٥٢٦ی قانونی سزادان دەسکاری کرا کەرێی نەدەدا بانگدان بێجگە لەزمانی تورکی بەهیچ زمانێکی دیکە بێ[36]. پارتی گەلی کۆماریش دەنگی بەقانونی بانگدان دا.

---

* بانگدان بەزمانی عەرەبی لەساڵی(۱۹۲۸)ەوە قەدەغە کرابوو.

[36]Feroz, Ahmed, The Turkish Experiment in Democracy, 1950- 1975 west View Bolder, Colorado, 1977 p-365.

بێ لەوە لەتشرینی یەکەمی ١٩٥٠ بەولاوە خوێندنی دینیی لەخوێندنگە سەرەتاییەکاندا کردە خوێندنێکی تەوزیمیو دواتریش ئەم مەسەلەیە خوێندنگەی بالاتریشی گرتەوە. ئیتر لەسالّی ١٩٥١ەوە خوێندنگەی ئیمامو خەتیبەکانیش کرایەوەو ژمارەیان لەناوەڕاستی حەفتاکاندا گەیشتە ٦٩ خوێندنگە. پارتی دیموکرات بێجگە لەهەمو ئەمانە دەستی دایە جێبەجێ کردنی بەرنامەیەك بۆ دروستکردنی مزگەوتی نوێو ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتە کۆنەکان بەجۆرێك لەماوەی نێوان ١٩٥٠-١٩٦٠ کەماوەی فەرمانڕەواییی پارتی دیموکراتە ژمارەی مزگەوتە دروستکراوەکان گەیشتە پێنج هەزار مزگەوت.

وەك چۆن پارتی گەلی کۆمار پاساوو پاکانەی خۆی سەبارەت بەسیاسەتی بەرامبەر دین هەبو، پارتی دیموکراتیش پاساوی خۆی هەبو کەوایان لیّ کرد بایەخێکی زیاتر بەمەسەلەی دین بدا، لەوانە نۆڕینی بۆ ئیسلام وەك رێوشوێنێك بۆ سەقامگیرکردنی ئاکارو هەر لەو ماوەیەدا چەندان لێکۆڵینەوە بلاوکرانەوە کەتێیدا هەڕەشە کرایە سەر عیلمانیەتو شێوە ژیانی رۆژئاوایی کەتورکیایان گەیاندە کەوتنە ناو تەپکەی قەیرانی ئاکارو لەکەلتوری ئیسلامیان دابڕاند. پاساوی تر ئەوە بوو کەتورکیا هێشتا لەو ئاستەدا نیە کەهەموو رێوشوێنە مۆدێرنەکان بۆ ورووژاندنو یەکخستنی رای گشتی پەرە پێ بدا، ئەمەش دەرفەت بۆ بزوتنەوە دینییەکان دەرەخسێنێ خۆیان تاقی بکەنەوەو بەشداری لەیەکخستنی جەماوەردا بکەن. پاساوێکی دیکەش لەوەدا بوو هەوڵ دەدرا رەوتی چەپی کۆمۆنیست لەخشتە ببرێو لەم مەسەلەیەدا نیاز وابوو ئیسلام وەك بەربەستێك بەکاربهێنرێ. بەم پێودانگە عەدنان مەندرێس ئیسلامی وەك ئایدیۆلۆژیایەك لەدژی کۆمۆنیزم بەکارهێناو گوناهی کوفرو ئیلحادی خستە پاڵ چەپەکانەوە. بێ لەوە مەندرێس دەیویست بۆ خەفەو خامۆش

کردنــی مەینەتی‌یـەکانی زادەی تـەنگژەی ئـابوریی سـاڵی ١٩٥٨ ســـود لەئیسـلام وەرگـریٚ چونکـە لـەو سـاڵەدا ئاوسـان‌و بـیٚ بـازاڕی تـــەنگی بەکۆمەلاٚنی خەڵکی هەڵچنی بـوو((لـەتورکیا، سـالاٚنی هـەوەڵی جـەنگی سەربەخۆیی‌ی لیٚ بـترازیٚ، دیـن بـۆ ورووژاندنـی جـەماوەر بـەکار نـەهاتوە. لەراستیدا خودی پارتی دیموکـرات پـاش ئـەوەی لەناوەڕاسـتی پـەنجاکاندا دوچاری تەنگوچەڵەمەی ترسناکی ئابوری بوو، دینی هیٚنایـەوە پیٚـش))[٣٧]. جگـە لەمـە، هەڵوێسـتی پـارتی دیموکـرات پـەیوەندیی بەرەهـەندەکانی سیاسەتی دەرەوەی تورکیاوە هەبو لەناوەڕاستی پەنجاکاندا، بەتایبەتی کەلەو ماوەیەدا نزیکبونەوەیەك لەگەڵ ئیٚران‌و عیراق‌و پاکستان رویدا کەریٚی بـۆ سـەر دەرهیٚنـانی پـەیمانی بـەغدا لەسـاڵی ١٩٥٥دا خـۆش کـرد. ئـەم نزیکبونەوەیەش پیٚویسـتی بـەزەق کردنـی سـەرو سـیمای ئیسـلامی‌یانەی تورکیا دەکرد، بەتایبەتی کەمیسرو سوریا رەخنەی توندوتیژیان لەپـەیمانی بەغدا دەگـرت‌و بـەچاوی گومانـەوە دەیانڕوانی‌یـە ئیسـلامبونی تورکیـا. تورکیاش بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەو ژاوەژاوە، لەرۆژنامـەکانیدا باسـی رۆڵـی میٚژوویی‌ی تورك لەبەرگری کردن لەئیسلام‌و بەشداریی تـورك لـەئافراندنی کەلتوریٚکی ئیسلامی دەکرد.

پیٚ بەپیٚی سیاسەتە دینی‌یـە نەرمەکـەی پـارتی دیموکـرات، هـەندیٚ کردەوەش لەدژی کەمالیزم‌و پرنسـیپەکانی، بەتایبـەتی لـەدژی پرنسـیپی عیلمانیەت، ئەنجام درا. لـەم سـەروبەندەدا پـەیڕەوانی تەریقـەتی تیجـانی

[37]Heper Mertin, Islam poliby and society in Turkey Amiddle Eastern perspective; The Middle East Journal, Vol-35, No-3, Summer, 1991, p-353. See.

Economic performance of The see Turkish Republic, Middle Eastern studies, Vol-20, October 1984, No, pp-155-165.

هێرشیان کردە سەر پەیکەرەکانی ئەتاتورکو وردوخاشیان کردن، بەئاشکراش پرنسیپی عیلمانیەت درایە بەر توانج، تەنانەت هەندێ پەرلەمانتار داوای دەسکاری کردنی دەستوریان کردو ویستیان ئەو بەندە بگەڕێننەوە کەدەیگوت ئیسلام دینی دەوڵەتە (بەندێك کەساڵی ١٩٢٨ ئەتاتورك لەدەستوری سڕی‌یەوە). ئەوەش دروستە کەپارتی دیموکرات لەچەند رویەکەوە سودی لەهەستی دینی وەرگرت، نەرمی‌ی بەرامبەر بەمەسەلەی دین نواندو کۆتو قەدەغەی لەسەر کەم کردەوە، کە لەئەنجامدا پشتیوانی‌یەکی زۆری بۆ خۆی پەیدا کرد (وەك پشتیوانی‌ی ئاشکرای سەعید نەورەسی لەمەندرێس). ئەوەش بەڵگەیە کە لەتورکیا ((خودی دەوڵەت پشتیوانی‌ی لەئیسلامی جەماوەر کردوەو ئێستاش دەیکا، ئەویش بەدروستکردنی خوێندنگەی تر بۆ وەعزدەرە دینی‌یەکانو بەشداری کردن لەدروستکردنی مزگەوتی نوێ))[38]. لەمەش دورتر، خودی پارتی دیموکرات وردە وردە هێشتی لەنێو ریزەکانی‌دا باڵێکی ئیسلامی پەیدا ببێ. ئەم رەوتەش لەداواکاری‌یەکانی کۆنفرەنسی ناوچەیی‌ی مارتی ١٩٥١ی پارتی دیموکراتی قۆنیە دەرکەوت کەتێیدا داوا کرا بوو تەربوش جێی شەپقەی ئەوروپایی بگرێتەوە، حیجاب بگەڕێتەوە، واز لەپیتی لاتینی بهێنرێو بچنەوە سەر پیتی عەرەبی، پەیکەرەکان لابرێن، دەست لەیاسای مەدەنی هەڵبگیرێو شەریعەتو فرە هاوسەری بگەڕێتەوە.

لەلایەکی ترەوە پارتی دیموکرات بەبێ ئەوەی بایی یەك تۆزقاڵ دەسکاری‌ی عیلمانیەت بکا ئەم سیاسەتەی پەیڕەو کردو ئەم سیاسەتەش بەهیچ شێوەیەك هەڕەشەی لەدەسەلاتی ناوەندی‌و رێچکە عیلمانی‌یەکەی نەکرد. ((پارتی دیموکرات بەتەما نەبو نکوڵی لەبۆچونە بنەڕەتی‌یەکانی

[38] Heper, Mertin, op-cit, p-353.

عیلمانیەت بکا، لەوانە دەسەڵاتی زاناکان لەبواری خوێندنو قـانوندا، بـێ لەوەی کەکەس نەبو لاریی هەبێ لـەگرنگیی پـەرەدان بـەوەی نـاونرا بـوو عەقڵیەتی زانستییان گەشەدان بەهەندێ دامودەزگای وەك بانقو کۆمەڵـە نائیسلامییەکان کە لەپشتیوانە سەرەکییەکانی پارتی دیموکرات بون))[٣٩].

بەرامبەر بەمە، مەندرێس پێی وابو چالاکیی گروپو رەوتە دینییەکان لەو قۆناغەدا هیچ مەترسییەك بۆ سەر رژێمو عیلمانیـەت پێـك نـاهێنن. ئەمەش هانمان دەدا بچینە سەر ئەو باوەڕەی کەریفۆرمەکانی ساڵانی پەنجای پـارتی دیموکـرات لـەبواری دیـن دا زیـاتر پـەیوەندییان بەبـەرژەوەندیی سیاسیی حزبەوە هـەبوەو هیـچ بنەمایـەکی ئایدیۆلۆژییانـە نـەبوە. لـەو هۆیانەش کەحزبیان بەرەو ئەو سیاسەتە برد پێویستیی بەرپـەرچ دانـەوەی پارتی گـەلی کۆمـار، پـەیدا کردنـی بەرەیـەکی یـەکگرتو لـەدژی چەپـە کۆمۆنیستەکانو بەدەست هێنانی دەنگی دەنگـدەران[٤٠]. لەبەرئـەوە پـارتی دیموکرات لەنواندنی ئیجرائاتی توندوتۆڵدا دژی هـەر جموجۆڵێکـی دینـی کەلێی رادەبینرا هەڕەشە لەرژێمی کۆمەڵایـەتی- سیاسـیی وڵات بکـات، هیچ دو دڵییەکی نەنواند، لەوانە گورز وەشـاندن لەپـەیڕەوانی تەریقـەتی تیجـانی کەهێرشـیان کردبـوە سـەر پەیکـەرەکانی ئـەتاتورکو بادانـەوەی حکومەت دوا بەدوای ئەمە بەلای دەرکردنی چەند یاسایەك لـەم روەوە وەك یاسای پاراستنی یادی ئەتاتورك لە ٢٥ی تەموزی ١٩٥١دا کـەرێی بـەهیچ کەس نەدا هیچ رەخنەیەك لەئەتاتورك بگرێ. حکومەت بەپێی ئەم یاسـایە دەسەڵاتێکی زۆرتری بۆ بەرپەرچ دانەوەی نەیارانی ریفۆرمە عیلمانییەکانی

---

[39]C.H.Dodd, op-cit, p-77.
[40]Heper, Merbin, op-cit, p-353.

کەمالیزم بۆ سەلمێنرا[41]. کۆمارخوازەکـانیش هـەنگاوە یاسـاییو سیاسـیو داوەرییەکانی پارتی دیموکراتیان پەسەند کرد.

بێ لــەوە، حکومــەتی مــەندرێس لــە٢٨ی تــەموزی ١٩٥٢دا بڕیـاری داخستنی پارتی نیشتمانی دایکیدا چونکە بڕیارەکانی کۆنگرەی چوارەمـی ئەم حزبە بەهەڕەشە بۆ سەر ریفۆرمەکانی ئــەتاتورك ژمـێردرانو حزبەکـە ئەوەی خرایە پاڵ کەدەیەوێ ئیسلام بۆ مەبەستە سیاسییەکانی خۆی بـەکار بێنێ[42].

بەهەرحاڵ، پارتی دیموکرات لەکۆتاییی پەنجاکاندا چۆوە سەر سیاسەتی بەکارهێنانی دیـن بەمەبەسـتی سیاسـی. هـۆی ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ شکستی سیاســەتی ئـابوریو خـراپ بونـی بـاری ئـابوری لەلایـەكو بـۆ پەرەسەندنی نارەزاییی ناوخۆیی لەلایەکی ترەوە. لەئەیلولی ١٩٥٨دا حـزب نەخشەیەکی بۆ دامەزراندنی((بــەرەی نیشـتمانی))بـۆ بەرپـەرچ دانـەوەی ئۆپۆزیسیۆن پێشنیاز کردو وای پرۆپاگەندە کـرد کەبـەرە بـەمانای دیفـاع لەئیسلام دێ لەدژی پارتی گەلی کۆمارخواز کەگوایە حزبێکـە دژی ئـاین، ئەمەش نفوزی لەلادێدا پایەدارترو پەیوەندیی لەگەڵ تەریقەتــە سـۆفییە دەسترۆیشتوەکاندا پتەوتر کـرد، بەتایبـەتی لەگـەڵ نورچییـەکاندا. بـەڵام پارتی دیموکرات نەیتوانی زۆرتر لەسەر حوکم بمێنێ چونکــە لەبەرەبـەیانی رۆژی ٢٧ی ئایـاری ١٩٦٠دا کودەتـای سـوپا سـەرەنگومی کـردو یــەکێ لەهاندەرە سەرەکییەکانی کودەتاکە((کۆتایی هێنان بوو بەکارهێنانی دین بۆ مەبەسـتی سیاسـیو شەخسـی)). مەندرێسـیش بـەبیانوی پاراسـتنی عیلمانیـەت کـوژرا. ئەگـەرچی کودەتــای ١٩٦٠ بــەبیانوی پاراســتنی

---

[41] أحمد السعيد سليمان، التيـارات الدينيـة والقوميـة في تركيـا- القـاهرة، بـلا تـاريخ ص٧٧-٧٨.

[42] Feroz, Ahmed, op-cit, p-47.

عیلمانیەت هەڵگیرسا، بەڵام مەبەستی ئەفسەرانی سوپاو نوخبەی عیلمانی ئەوە نەبو بچنەوە سەر عیلمانیەتە زۆردارەکی‌یەکەی ئەتاتورك چونکە ئەفسەرانی سوپا لەو بڕوایەدا بون کە، وەك فەرۆز ئەحمەد بۆی چوە، ئیسلام پێکهێنەرێکی ژیانی‌ی کاراکتەری تورکەو هەر هەوڵێك بۆ ریشەکێش‌و بنبڕکردنی هەوڵێکی بێ سودە[43]. لەبەر ئەوە جەنراڵەکان بەو گۆرانکاری‌یانە رازی بون کە لەپەنجاکاندا بەسەر رژێمدا هاتن‌و لەدەستوری ١٩٦١ گوزارشتیان لەو رازیبونە کرد چونکە ئەو دەستورە ئازادی‌ی پەرستن‌و رێکخستن‌و بلاوکردنەوەی بیروباوەڕی سەلماند، لەئەنجامدا ئیسلامی‌یەکان ئەو هەلەیان بۆ رەخسا کە بەئازادی بانگەشە بۆ بیروباوەڕیان بکەن. ئەندامانی کۆمیتەی یەکێتی‌ی نیشتمانیش(کەپاش کودەتای ١٩٦٠ دەسەڵاتی گرتە دەست))بڕیاریان دا ئیسلام وەك ئایدیۆلۆژیای سیاسەتی دەوڵەت بۆ بەگەرم‌و گوڕ کردنی بەرنامەی ریفۆرم بەمەبەستی خزمەت کردنی بزاوتی گۆڕینی کۆمەڵایەتی، بەکاربێنن‌و وەك ئایدیۆلۆژیایەکیش بۆ گورز وەشاندن لەرادیکالیزم‌و سۆشیالیزم‌و کۆمۆنیزم سودی لێ وەرگرن‌و بیشیپارێزن((لەوەی کەببێ بەئامرازێك بەدەست بزوتنەوەی کۆنەپەرست‌و سیاسی‌یەکان)).

لەشەستەکاندا زیادبونی کۆچ لەلادێوە بۆ شارو بەردەوامبونی تەنگژە کۆمەڵایەتی‌یەکان رەوتی ئیسلامگەری‌یان تۆکمەتر کرد. لەمەوبەریش ئەوەمان رون کردەوە کەئاسەواری ریفۆرمە عیلمانی‌یەکانی ئەتاتورك لەلادێدا ئاسەوارێکی کزو خەفە بوو. بەپەرەسەندنی کۆچ خەڵکانێکی زۆری پارێزگارو دیندار رژانە سەر ناوەندو تەکانێکی زۆریان بەرەوتی ئیسلامگەری‌دا. لەم روەوە چەتین هیبەر وتویەتی((سوربونی کۆچکەرە

---

[43]Ibid, p-56.

تازەکان لەسەر ناسنامەی ئیسلامی‌یان پاش کۆچ کردن لـەلادێوە بـۆ شـار پتەوتر دەبێ چونکە ناسنامەی ئیسلامی بۆ کۆچکـەرێك کـەتازە روبـەڕوی بەهاکانی شار دەبێتەوە قەڵغانێکی مکومە))[44].

لەبەر رۆشنایی‌ی هەموو ئەمانـەدا، نەجمـەددین ئەربـەکانی ئوسـتادی زانکۆی ئیستانبول‌و ئەندامی پێشوی پـارتی عەدالـەت، لـە٢٦ی کـانونی دوەمـی ١٩٧٠دا یەکـەم رێکخـراوی سیاسـی‌ی بـەناوی پـــارتی رژێمـــی نیشتمانی‌یەوە پێکەوەنا.

## بابەتی سێیەم: ئەربـەکان: ململانـێی نێـوان دامەزراوی سوپایی- عیلمانی‌و دین

نەجمەددین ئەربەکان پسپۆر بـوو لەتـەکنیکی چەکسـازی‌و لـەزانکۆی ئیستانبوڵیش کاری کردوە. لەشاگردەکانی محەمەد زاهیر ئەفەندی‌ی شـێخی تەریقەتی نەقشبەندی‌و ئیمـامی مزگـەوتی ئیسـکەندەر پاشـای گـەڕەکی فاتیحە لەئیستانبوڵ*. ئەربەکان بەخۆی‌و چـەند پەرلـەمانتارێکی پـارتی عەدالەت- خودی خۆشی لـەو کاتـەدا پەرلـەمانتارێکی سـەربەخۆ بـوو- گروپێکی پەرلەمانی‌ی تایبەتیان پێك هێنا کەدواتر بەردی بناغەی یەکـەم حزبی ئیسلامی‌ی راستەقینەی لەتورکیا دامەزراند. لەهەڵبژاردنی ١٩٦٩دا ئەربەکان ویستی وەك نوێنەری پارتی عەدالەت خۆی بپاڵێوێ بەڵام دەمیریل سڵی لێ کـردەوەو نەیهێشـت بـەناوی پـارتی عەدالەتـەوە خـۆی بپـاڵێوێ، سەرەنجام ئەویش وەك بێلایەنێك خۆی هەڵبژاردو دەریش چو. هـەینێ لـەناو

[44] دینا صلاح شحاته، مصدر سابق، ص١٥٥.

* ئەم شێخە لەڕوی وێژەیی‌یەوە ببوە رێبەری چەند خوێندکارێکی دەوروبەری مزگـەوتی ئیسکەندەر کەمەیلیان بەلای ئیسلامگەری‌دا هەبو، دیارترینیان ئۆغۆز خـان، ئـەمیل تورك، سلێمان عارف‌و هی‌تر کەدواتر لەگەڵ ئەربـەکاندا تیمـی ئیسـلامی سیاسـی‌یان پێك هێنا.

پەرلەماندا فراکسیۆنێکی لەئیسلامی‌یەکانی پێك هێنا، ئەوانیش لەساڵی ١٩٧٠دا پارتی رژێمی نیشتمانی‌یان دامەزراند. بەپێی رۆژنامەی لایەنگری چەپی((حورییەت)) ئەم حزبە بەشێوەیەکی((ترسناك))گەشەی کرد.

ئەم حزبە لەکۆنگرەی یەکەمیدا بەپێی زمانی پرۆپاگەندەیی، پێی لەسەر داکۆکی کردن لە((تیرۆانینی دینی))و ((موقەددەساتی وێژەیی))داگرتو وای راگەیاند کە((ئیسلام بنچینەو چاوگی ژیانی سیستەمو هەمو زانستو نەزاکەتێکەو مەرجێکیشە نەك هەر بۆ رزگارکردنی تورکیا بەڵکو بۆ هەمو جیهان)). حزب ئەوەشی رون کردەوە کەتەنها خۆی نوێنەرایەتی‌ی ئیسلام دەکاو پێویستە لەسەر حزبەکانی تر لەئیسلامەوە نزیك بکەونەوە نەك ئیدیعای ئیسلامەتی‌ی بکەن. حزبەکە بۆ یەکەمین جار لەمێژوی کۆماری تورکیادا چەند خۆپیشاندانێکی قانونی‌ی سازکرد کەتێیدا بانگەشە بۆ پەیڕەوکردنی ئیسلام کرا، لەکاتێکدا سەر شەقامی تورك هیچ دروشمێکی دینی‌یان تێدا بەرز نەدەکرایەوە. ئەم رەفتارو هەڵسوکەوتانە لەگەڵ چەمکی باوی عیلمانیەتدا رێکنەدەکەوتن، بۆیە داواکاری گشتی‌ی تورك لەساڵی ١٩٧١ داوایەکی یاسایی‌ی بۆ هەڵوەشاندنەوەی حزبەکە بەرزکردەوەو وتی گوایە پارتی رژێمی نیشتمانی لەکۆنگرەی یەکەمدا رێی داوە باسی ئیسلامو شەریعەت بکرێ، ئەویش شتێکە لەگەڵ قانونی رێکخستنی حزبایەتی‌و دەستوردا ناگونجێو لەسۆنگەی ئەمەوە حزبەکە هەڵوەشێنرایەوە.

دواتر، وردە وردە قەناعەت بەوەی کەئەربەکان دەتوانێ سەرکردایەتی‌ی جوڵانەوەی ئیسلامی‌ی تورکیا بکا، تا دەهات زیاتر رەگی دادەکوتا. ئیتر لەسۆنگەی ئەمەوە ئەربەکان لەساڵی ١٩٧٣دا لەگەڵ سلێمان عارفو گروپەکەی خۆی حزبێکی تری لەبری حزبە هەڵوەشاوەکەی رژێمی نیشتمانی بەناوی پارتی سەلامەتی نیشتمانی‌یەوە دامەزراند. ئەو حزبە

لەبەرنامەکەیدا دەمو دەست ناوی ئیسلامی نەهێنا بەڵکو بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ گوزارشتی لێ کرد. ئەمەش لەراگەیاندنی کۆنفرەنسە نائاسایی‌یەکەی ٢٢ی تەموزی ١٩٧٣ی حزبەکەدا دەردەکەوێ کەتێیدا وترابوو((ئامانجی حزب رزگارکردنی تاکە کەس‌و خێزان‌و کۆمەڵە لەو تەنگژانەی بەرۆکیان گرتون‌و گەیاندنیان لەروی وێژەیی‌و ماددی‌یەوە- وەك ئەوەی لەمێژوماندا رویداوە- بەبالاترین ئاست)). بەمجۆرە حزبەکە نەك هەر بایەخی بەبلاوکردنەوەی ئیسلام دا بەڵکو واش خۆی دەرخست کەدەیەوێ لەروی بەرهەم‌و ناردنە دەرەوەی کالاو پیشەسازیشەوە خۆشگوزەرانی بۆ خەڵکی تورکیا دەستەبەر بکات. ئەمەش نوسەرێکی مارکسیستی هاندا بڵێ((جێی سەرسوڕمانە کەبەرنامەی حزبە ئیسلامی‌یەکەی سەلامەتی نیشتمانی باسی بەپیشەسازی کردنی تورکیا بکات، کەچی بەرنامەی حزبە چەپەکانی تورکیا هیچ خاڵێکی دەربارەی پیشەسازی تێدا نیە))[45].

بەم شێوەیە حزبەکە خۆی لەپێکاهەڵپژان لەگەڵ حکومەت‌و قانونی حزبایەتی‌و دادگای دەستوری رزگارکردو لەپڕۆپاگەندەکانی هەڵبژاردنی سالانی ١٩٧٣و ١٩٧٧دا بایەخی بە((موقەددەساتی وێژەیی))دا، هێرشی کردە سەر سەرمایەداران‌و پیشەسازان‌و بازرگانە گەورەکانی ناوچە دەوڵەمەندەکانی تورکیاو پشتیوانی‌ی لەپیشەکارە وردە بورژوازی‌یەکان کرد کەدواتر بونە پاڵپشتی ماددی‌و سیاسی‌و جەماوەری‌ی. ساڵی ١٩٧٣ حزبەکە لەسەدا ٨، ١١و ساڵی ١٩٧٧ لەسەدا ٦، ٨ی سەرجەمی دەنگەکانی بەدەست هێناو لەریزبەندی‌دا پاش پارتی گەلی کۆمارو عەدالەت پلەی سێیەمی بۆ خۆی مسۆگەر کرد(خشتەی ژمارە دو)[46].

---

[45] د. محمد حرب، مصدر سابق، ص ١٣٢.

[46] سەرچاوەکە وەرگیراوە لە:

بەوەش کەئەم دو حزبە نەیانتوانی زۆرینـــەی رەهـا بەدەسـت بێنــن، پـارتی سەلامەت داشی سوار بوو چونکە هەردو حزبەکە بۆ پێکهێنانی حکومـــەت پێویستیان پێ بوو.

ساڵی ١٩٧٤ حزبی سەلامەت بەشداریی لەحکومەتێکی ئیئتیلافـیدا کـرد بەسـەرۆکایەتیی پۆلـەنت ئەجـەڤیت. ئەمـەش دەرفـەتی بـــەحزبی سەلامەتدا لەناو دەزگاکانی دەوڵەتو لەژیانی گشتیدا نفوز پەیدا بکاو لەم سەروبەندەدا ژمارەیـــەکی زۆر خوێندنگـە بـۆ فـێربونی قورئـان کرایـەوەو ژمارەی خوێندنگەکانی ئیمـــامو خـەتیبانیش پـەرەی سـەندو لەناوەڕاسـتی حەفتاکاندا ژمارەیان گەیشتە ٦٩ خوێندنگە، بێجگـە لـەچوار ئامۆژگـەی ئیسلامیو یەك کۆلیجی دینی لەئەنکەرە.

توانای بەڕێوەبەرێتیی کاروباری دینیـــش گەشـەی پـێ دراو پارەیـەکی زۆرتری بۆ تەرخان کرا. بێ لەوە حزبی سەلامە بەسـەرۆکایەتیی ئەربـەکان لەسـالآنی ١٩٧٥و ١٩٧٧دا بەشـداریی لـەو ئیئتیلافـە کـرد کـــەپارتی عەدالەت رێبـــەری بـوو، بەمـەش بـوو بەبەشـێکی جیانـەکراوە لـەرژێمی سیاسیو حزبیی سالآنی حەفتا.

هەرچییەك بـێ، ئەگـەرچی پـارتی سـەلامەت توانـی دزە بکاتـە نـاو دەزگاکانی دەوڵەتو دەسەڵات بەڵام بەدرێژاییی ســالآنی حـەفتا نـەیتوانی هەمو دەنگە ئیسلامییەکان بەلای خۆیدا راکێشێ چونکە هـەندێ گروپـی ئیسلامی، وەك تەریقەتە سـۆفییە سـەرەکییەکان کـە لەدروسـت کردنــی بڕیاری سیاسیدا سەنگو قورساییی خۆیـــان هـەبو، وەك لایـەنگری حزبـە سەرەکییەکانی وەك پارتی عەدالــەت مانـەوە لەوانـە نورچییـەکان(واتـە

---

Ergun ozbudun, The Turkish party system, institutionlization, polarization and Fragmentation, Middle Eastern studies, Vol-17, April 1981, No- 2,p-229.

لایـەنگرانی گروپـی ئیتیحـادو تـەرەقی لەسـەرەتای سـەدەی بیسـتـەم داو لایەنگرانی مەندرێس لەپەنجاکانداو لایەنگرانی پارتی عەدالەتو سـلێمان دەمیرێلی سکرتێری گشتیی لەشەسـتەکانو حـەفتاکاندا) کـە لەهـەمان کاتدا دژی ئەوەش بون حزبـی دینـی هـەبێ. لـەم بارەیـەوە بـەدیعوززەمان سەعید نەورەسی لە((رسائل النور))دا وتبوی تا رێژەی دینداران لـەتورکیا نەگاتە لەسەدا ٧٠و لەسەدا ٨٠ رەوا نیە حزبی ئیسلامی هـەبی[٤٧]. میشـال توفال هۆی ئەم دیاردەیە دەباتەوە سەر ئەوەی کەلەو ماوەیەدا زۆربەی گروپە ئیسلامیی‌یەکان کاریان بۆ بەموسڵمان کردنـی هـاوولاتیو فـراوان کردنـی پـەراوێزی ئـازادیی چالاکیی‌یـە دینیی‌یـەکان دەکـردو هیـچ کامێکیـان تێڕوانینێکی گشتلاییو بەرنامەیەکی کۆمەلایەتیی رۆشنیان نەبوە[٤٨].

ئەمەش ئـەو هۆیـە رون دەکاتـەوە کـەبۆچی گروپـی نـور دژی پـارتی سەلامەتی نیشتمانی بوو تا ئەو رادەیەی کەنورچیی‌یەکان لەناوچەی ئیزمیر بەسـەرکردایەتیی فـەتحوللا خۆجـە لـەکاتی هـەلبژاردندا پڕوپاگـەندەیان لەدژی تورگوت ئوزالی پالێوراوی پـارتی سـەلامەتی نیشـتمانی کـردو لێ نەگەڕان هەلبژاردنەکە بباتەوە. پاشان کاتێك تۆرگۆت ئوزال بوە سەرکۆمار ئنجـا پشـتیوانیی‌یان لێ کـرد. واتـە تـا ئـەندامی پـارتی سـەلامەت بـوو پشتیوانیی ئەو گروپەی مسۆگەر نەکرد.

هەمان مەسەلە لەگـەڵ بەکتاشیی‌یەکاندا رویـدا کـەژمارەیان بـەپێی سەرچاوە تورکیی‌یەکان لەناوەڕاسـتی شەسـتەکاندا ١٣ ملیـۆن کـەس بـوە. حکومەتی تورك لەپەنجاکانەوە چاوپۆشیی لەجموجۆلیان دەکـردو تەنانـەت

---

[٤٧] جلال معوض، مصدر سابق، ص٨٤.

[٤٨] ميثال نوفل و د. علي بيرم أوغلو، مدخل مفهومي للازمة التركية: البنية السياسية والحركة الاسلامية، شؤون الاوسط، مركز الدراسات الاستراتيجية والبحوث والتوثيق، بيروت، عدد ٦٤، أغسطس ١٩٩٧، ص٣١.

باری قانونیی تەریقەتەکەشیانی سەلماند. جێی سەرنجە کەبەکتاشییەکان لەلایەنگرانی کەمالیزمو عیلمانیەتو هەلّوەشاندنەوەی خەلافەتو رزگارکردنی ئافرەتو نەهێشتنی دەمارگرژیی دینین هەم لەدەولّەتداو هەم لەکۆمەلّدا[٤٩].

سەرباری ئەمە، ئەریەکان لەلایەن تەواوی دامەزراوی عیلمانیی مەدەنیو عەسکەرییەوە کە لێك جوداکردنەوەیان بۆ نیە، پشتیوانی لێ نەدەکرا. ئەوەش رونە کەهەردو گروپی مەدەنیو عەسکەری لەچوارچێوەی چەندین ئامرازی دەسەلاّتدا رێکخراون. دەستورە سەرەکییەکەی کاریش بریتییە لەوەی کەرۆلّی سەرەکیی پاراستنی رژێمو دروخستنەوەی هەرەشە ناوخۆییو دەرەکییەکانو پارێزگاری کردنی میراتی کەمالیستی، بۆ سوپا سەلمێنراوە.

لەکۆلیجو ئەکادیمیا عەسکەرییەکاندا جەنرالەکان بەیەك پرنسیپی سەرەکی پەروەردە دەکرێن ئەویش ئەوەیە کەئەوان هەر پارێزەری نیشتمان نین بەلّکو پارێزەری رژێمی دیموکراتیی عیلمانیشن((لەخوێندنگا جەنگییەکاندا خوێندکارەکان فێری بیروباوەڕە عیلمانەیەکانی ئەتاتورك دەکرێنو رێنمایی دەکرێن بیانپارێزن، ئەگەر رژێم بنەما عیلمانییەکانی خۆی لەدەسداو دەولّەت بەرەو شەریعەتی ئیسلام رۆیی))[٥٠]. بەلاّم بەشێکی زۆری فەرماندەکانی سوپا، لەژیانی تایبەتی خۆیاندا هێشتا موسلّمانن و فەرزە دینییەکانیش جێبەجێ دەکەن. ئەوەش بەلّگەیە کەسەرۆکی پێشو کەنعان ئیڤرین کوڕە مەلایە، بەلاّم ئەوەی بەرهەلّستیی دەکا ئەوەیە کەزیان بەعیلمانیەت بگەیەنرێ یاخود بەواتایەکی تر هەمو ناوەڕۆکێکی سیاسی

---

[٤٩] أحمد نوري النعيمي، ظاهرة التعدد الحزبي في تركيا ١٩٤٥-١٩٨٠، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٩٠، ص١٠٠.

[٥٠] هەمان سەرچاوە هەمان لاپەڕە.

لـەدین و شـەریعەت دادەماڵـێ و لـەم روەوە لـــەوتارێكی ســـاڵی ١٩٨٢دا وتویەتی((سیاسەت لەمزگەوتدا نابێ))[٥١].

لەسۆنگەی ئەمـــەوە لـەكودەتای ١٩٦٠دا جەنرالـەكان دژی ئـەوە بـون كەپارتی دیموكرات دین بۆ مەبەستی سیاسی بـەكار بێنـێ، لەناوەڕاستی هەشتاكانیشەوە سوپا زۆر بەتوندی دژی ئـەوە كـار دەكـا كـەهیچ گـروپ و شانەی ئیسلامی تێدا پەیدا نـەبێ و لـە(١٩٨٦-١٩٨٧)ـــەوە مەســەلەی بەرپەرچ دانەوەی بەئیسلامی كردنی ســوپا ســەرنجی فـەرماندەیی‌ی ســوپا رادەكێشێ چونكە دەركـــەوتوە كەئیسـلامی‌یەكان لـەناو ســوپادا گـەرایان داناوەو شانەیان دروست كــردوە. لەشــوباتی ١٩٨٧دا كاربەدەســتانی ســوپا كەوتنە لێكۆڵینەوەیەكی گشتلایی لەئامۆژگەو ئـــەكادیمیاكانی راهێنـــانی ئەفسەراندا كەسەد ئەفســـەرێكی گرتـــەوە، ئـەویش بەتۆمـــەتی پـــەیوەندی كردنیان بەچەند گروپێكـی ئیســـلامی‌ی نهێنی‌یـــەوە كـــەكار بـــۆ جێبـــەجێ كردنی شەریعەت و روخاندنی رژێمی عیلمانی دەكەن. ئیتر لەگەڵ بەرپابونی كودەتـای ســاڵی ١٩٨٠دا پـارتی ســەلامەتی نیشــتمانی و هـەمو حزبـــە سیاسی‌یەكانی تر هەڵوەشێنرانەوەو رێ بەپێشەواكانیان نەدرا حزبـی دیكـە دامـەزرێنن. پاش دادگایی كردنی نەجمەددین ئەربەكان و ساغ بونـــەوەی بـێ تـاوانی‌ی و راگـەیاندنی ئـەوەی كـــەپارتی ســـەلامەی نیشـــتمانی هیـــچ چالاكی‌یەكی لەدژی دەوڵـــەت نـەنواندوە، گروپەكـەی ئەربـەكان حزبێكـی دیكەی لەسەر هەمان مۆدێلی پارتی سەلامەت دامەزراندو ناوی نا پـــارتی رەفا كەساڵی ١٩٨٣ راگەیەنرا.

ســالاّنی هەشـــتا(بەتایبـــەتی ســـەرەتاكانی)تاڕادەیـــەك گۆڕانێكـــی لەهەڵوێستی دامـەزراوی سوپا بەرامبەر بـــەدین بـەخۆوە دیـوەو لـەم روەوە

[٥١] د. جلال عبدالله معوض، الاسلام والتعددية في تركيا، مصدر سابق، ص٤٣.

هەندێ نەرمی بەرامبەر بەمەسەلەی دین دەبینین. لەکاتێکدا تا کۆتـایی‌ی حـەفتاکان سـوپا سـور بـو لەسـەر خـامۆش کردنـی بزاڤـی ئیسـلامی، لەهەشتاکاندا سوپا بەرامبەر بەئیسلام‌و رێکخراوەکانی جۆرە نەرمی‌یـەکی بێ پێشینەی پیشان دا. محەمەد نورەددین لەم بارەیـەوە دەڵـێ((لـەقۆناغی هەشـتاکاندا سـوپا لەهەڵسـوکەوتدا لەگـەڵ ئیسـلام دا پـەیڕەوی‌ی لەفەلسەفەیەکی تازە کرد کەپێی دەوترا((بۆچونی تورکیایی بۆ ئیسـلام)). ئەمـەش بـەو مانایـە دێ کەیـەکێ لـەهۆکانی پاشـاگەردانی‌ی سیاسـی‌و پشـێوی‌ی نـاوخۆی وڵات لەلایـەك بـۆ فەرامۆشـکردنی ئیسـلامگەری لـەرابردودا لەلایـەن کاربەدەسـتانەوەو لەلایـەکی تـرەوە بـۆ گەشـەکردنی بزوتنـەوەی کۆمۆنیسـتی‌و نەتـەوەیی‌ی تونـدڕەو دەگەڕێتـەوە. لەبەرئـەوە بۆچونێکی نەتەوەیی-تورکیایی‌ی ئیسلامی کەهەستی ئیسلامی‌ی زۆربـەی هەرە زۆری کۆمـەڵ لەبـەرچاو دەگـرێ، لێـی رادەبیـنرێ ئـارامی بـۆ وڵات دەسـتەبەر بکـات. دوا بـەدوای کودەتـای ١٩٨٠، سـوپا خـۆی پرۆسـەی بەئیسلامی کردنی جێبەجێ کردو لەم سەروبەندەدا دینی کـردە وانەیـەکی تەوزیی لەهەمو خوێندنگاکانداو رێوشوێنێکی کراوەتری بەرامبەر بەرەوتە ئیسلامی‌یەکان پیادە کرد، لەئەنجامدا رەوتی ئیسـلامی کـەخۆی لـەپارتی رەفادا دەنوانـد گەشـەکردنێکی خـێرای بـەخۆوە دیـت‌و ئـەو گەشـەکردنە بەشێوەی((باز))گوزارشتی لێ کراوە[٥٢].

زۆر هۆ لەپشت ئەم بازەوە بون. ئەوەش بەڵگەیە کەگەیشـتنی تورگـوت ئـۆزال بەدەسـەڵات لەسـاڵی ١٩٨٣داو پێشـنیارکردنی رێگەچارەیـەکی مـامنـاوەندی بـۆ پێکـەوە گونجـاندنی روی ئـەوروپایی‌ی تورکیـاو روە ئیسـلامی‌یەکەی‌و پـەیڕەوکردنی سیاسـەتێکی ئـابوری‌ی لـیبرال بـوە هـۆی

---

[٥٢] محمد نورالدين، الاسلام في تركيا أولا وأخيرا، جريدة الحياة، لندن، ١٩٩٧/١/٥.

گەشەسەندنی بەرژەوەندی‌یەکانی سەرمایەدارە تازەکان. ئــەم مەســەلەیەش کارێکی وای کرد رەوشی ئیسلامی ئازادی‌یەکی زۆرتری بۆ چالاکی نوانــدن بۆ برەخسێ. لەم رووەوە محەمەد نورەددین پێــی وایــە((ئــەو هــێزە ماددیــەی کەجولانەوە کەبەهۆی سیاسەتەکانی ئۆزالــەوە بەدەســتی هێنــا، یارمــەتی ئەوەی‌دا کە لــەروی کــەلتورو راگــەیاندن‌و خوێندنــەوە نفــوز پــەیدا بکــاو رایەڵەی دەزگا کۆمەڵایەتی‌یەکانی رێکخراوەکە کەفراوانتر بکا))[53].

پەرەسەندنی نفوزی حزبەکە لەفراوانبونی جەماوەرێتی‌ی پــارتی رەفــادا رەنگــی دایــەوەو وەك میشــال توفــال بــۆی چــوە رەفـــا توانـــی((دەنگــە ئیسلامی‌یەکان لەحزبە راستڕەوە میانڕەوەکان بسەنێتەوە))[54]. بەجۆرە، ئــەو دەنگانەی کــەرەفا لەهــەڵبژاردنی ناوچــەکان‌و پەرلــەمان دا لەهەشــتاکان بەدەستی هێناوە، رۆژ بەرۆژ رو لەزیادبون بوە.

جگە لەمە، لەتبونی حزبە راستڕەوو چەپەکان(بۆ نمونە پارتی عەدالــەت پارتی رێی راست‌و نیشتمانی دایکی لێ کەوتەوەو پارتی گەل پارتی چــەپی دیموکرات‌و پارتی گەلی کۆماری لێ کەوتەوە)بوە هۆی پەرەوازەیی‌ی دەنگــی هەڵبژێرەکان‌و ناتوانایی لەپێکەوەنانی حکومــەتی زۆرینــەو ســەرەنجام بــوە هۆی فراوانبونی دەرەتانی مانۆری سیاسی‌ی رەفا لەراکێشانی دەنگــەکانداو هەروا لەپەیمان بەستن لەگەڵ فلان‌و فیسار حزب لەکاتی هــەڵبژاردندا. بــێ لەوە لەهەشــتاکاندا نفــوزی چــەپ بەئاشــکرا پاشەکشــەی کــرد. ئەمــەش کارێکی وای کرد رەوشی ئیسلامی سیاسی لایەنگرە هەژارو بــێ نــەواکانی گروپە چەپەکان بــەلای خۆیــدا راکێشــێ، ئــەویش لــەرێی بەرزکردنــەوەی دروشمەکانی دادی کۆمەڵایەتی کەلەمەوبەر چەپەکان بەرزیان دەکردەوە.

---

[53] محمد نورالدين، الدوائر الثلاث لتركيا، دورية شؤون الاوسط(بيروت، مركز الدراســات والبحوث والتوثيق)، عدد ١١، أغسطس ١٩٩٢، ص١٨.

[54] ميشال نوفل، مصدر سابق، ص ٢٨.

یەکێ لەسیماکانی ئەو بازە ئیسلامی یەی کەتا ناوەڕاستی نەوەدەکانیش هەر بەردەوام بوو، پایەدارکردنی ناسنامەی ئیسلامی یانەی تورك و دەرخستنی جیاوازیی نێوان تورك و ڕۆژئاواو زیادبونی دیاردەی دینداری لەژیانی گشتیدا. محەمەد نورەدین لەم ڕووەوە ئاماژە بەوە دەکا کە لەساڵی ١٩٩٠دا ژمارەی خولی خوێندنەوەی قورئان گەیشتە ٥١٩٧خول، ژمارەی ئامۆژگاکانی پێگەیاندنی ئیمام و خەتیبان گەیشتە ٥٣٧٤ ئامۆژگاو ژمارەی مزگەوتەکانیش لەساڵی ١٩٩٥دا گەیشتە حەفتا هەزار مزگەوت[٥٥].

بەبەراورد لەگەڵ هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٨٤ کەپارتی رەفا تێیدا لەسەدا ٤,٧٦ی سەرجەمی دەنگی دەنگدەرانی بەدەست هێنا، هەڵبژاردنی ناوچەیی ی ساڵی ١٩٩٤و هەڵبژاردنی کانونی یەکەمی ١٩٩٥دەری دەخا کەرەوشی ئیسلامی سیاسی زۆر پەرەی سەندوە چونکە رەفا لەهەڵبژاردنی ١٩٩٤دا توانی لەسەدا ١٩,٧ی دەنگەکان بەدەست بێنێ و بەم جۆرە پاش پارتی نیشتمانی دایك و پارتی ڕێی راست پلەی سێیەمی بەدەست هێناو سەرۆکایەتی ی دو شارەوانی یە گرنگەکەی ئیستانبول و ئەنقەرشی مسۆگەر کرد. لەهەڵبژاردنی کانونی یەکەمی ١٩٩٥یش رەفا لەسەدا ٢١,٣ی سەرجەمی دەنگەکان و ١٥٨کورسی ی لەپەرلەمان بەدەست هێنا. لەکاتێکدا پارتی نیشتمانی دایك لەسەدا ١٩,٦و پارتی ڕێی راست لەسەدا ١٩,١ی دەنگەکانیان بەدەست هێنا. لەبەهاری ١٩٩٦ یش ئەربەکان ئیئتیلافێکی لەگەڵ پارتی ڕێی راست پێك هێناو بەمجۆرە بۆ یەکەم جار لەمێژوی تورکیا رابەرێکی ئیسلامی پۆستی سەرەك وەزیرانی بەدەست هێنا.

---

[٥٥] محمد نور الدین، الاسلام في ترکیا اولا وأخيرا، مصدر سابق، ص٤.

ئەگەرچی ئەربەکان لەسەرەتادا سیاسەتێکی ئیسلامیی میانڕەوی پیادە کردو لەگەڵ حزبە راستڕەوە میانڕەوەکاندا هەماهەنگیی کردو نەیویست دەسکاریی ناسنامەی دامو دەزگاکانی دەوڵەت بکا بەڵام دواتر سیاسەتی رەفا گۆڕانی بەسەردا هاتو وردە وردە بەلای ئیسلامی سیاسیدا وەرچەرخایەوەو ئەو رێنمایییانەی شکاند کەحزبە راستڕەوە میانڕەوەکان لەمێژ بوو لەسەری دەڕۆیشتن. بەم پێودانگە رەفا هەندێ هەنگاوی هەڵێنا کەنوخبە عیلمانییە توندڕەوەکەو سوپا بەسەرەتای هەڵگەڕانەوەی رەفایان لەعیلمانیەت دایە قەڵەم.

ئەو گۆڕانە بەوە هەستی پێی کرا کاتێك رەفا داوای کرد ئایا سۆفیا (کەمزگەوتێکە لەسەردەمی ئەتاتورکدا کرایە مۆزەخانە) بکرێتەوە بەمزگەوتو مزگەوتێکی تریش لەمەیدانی تەقسیمی ناوەڕاستی ئیستانبول دروست بکرێ. بێ لەوە ئەربەکان پڕۆژەی یاسایەکی سەبارەت بەئازادیی حیجاب لەزانکۆو دەزگا دەوڵەتییەکاندا پێشنیاز کرد[٥٦]. بێ لەپەرەسەندنی نفوزی ئابوریی ئەربەکانیزم لەرێی دەزگای مۆسیادەوەMUSIAD* کە لەدە هەزار کۆمپانیای هەمەجۆری ئیسلامی پێکدێو بێ لەدزەکردنی نفوزی رەفا بۆ ناو دەزگا پەروەردەیییەکان لەرێی خوێندنگە دینییەکانو بۆ ناو سوپاو پۆلیسو کارگێڕی[٥٧]. ئەمە لەسەر ئاستی ناوخۆ. لەسەر

---

[56] TH Economest Intelligen unit Elu country Report, Turkey, 2 nd quarter 1997(London Elu, 9,1997)p-10.

* مۆسیاد یەکێتیی کارناسە سەربەخۆکانی تورك کەهاوپەیمانییە لەنێوان بازرگانانو پیشەوەرانو خاوەن سەرمایە ئیسلامییەکانو سەرۆکەکەی نارۆل یەشارە کەئابوریناسێکی بەناوبانگەو لەنێو ئابوریناسانی تورکدا رێزو حورمەتی خۆی هەیە. ئەم یەکێتییە کۆنفرەنسێکی نێودەوڵەتیو پیشانگایەکی هەیە کەبازرگانانی نزیکەی پەنجا دەوڵەتی ئیسلامیی تێدا بەشدار دەبێ.

[٥٧] رضا هلال، حقيقة الانقلاب المدني في تركيا، الاهرام(١ يوليو١٩٩٧) ص ٧.

ئاستی دەرەوەی وڵات راستە رەفا گۆڕانی گەوهەری بەسەر سیاسەتی دەرەوەی توركیا بەرامبەر بەئەورووپاو ئەمریكاو ئیسرائیلو سوریاو ئێراندا نەهێنا بەڵام سەردانەكانی ساڵی ١٩٩٦ی ئەربەكان بۆ ئێرانو لیبیاو بانگەواز بڵاوكردنەوە بۆ دامەزراندنی گروپی هەشت دەوڵەتە ئیسلامی‌یەكەو راگەیاندنی ئامادەیی‌ی توركیا بۆ هاریكاری كردنی ئێران لەبواری پیشەسازی‌و كاروباری سوپاییدا لەكاتی سەردانەكەی رەفسەنجانی بۆ توركیا، سوپای لەوە وریا كردەوە كەرەنگە ئەم سیاسەتە دوفاقەیە ئاسەواری خراپی لێ بكەوێتەوەو خراپ كار بكاتە سەر رۆڵی ئیقلیمی‌ی نوێی توركیا[58].

ئیتر بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەربەكانیزم دامەزراوی عیلمانی‌و سوپایی چەند تەگبیرو سیاسەتێكی پێویستی بۆ رێ گرتن لەپوكانەوەی كۆمارە عیلمانی‌یەكە گرتەبەر. سەرەتا مەسەلەی سازكردنی كودەتایەكی ئاشكرا دژی رەفا خرایە لاوە چونكە ئەمە مەسەلەكە ئاڵۆزتر دەكا، بەتایبەتی پاش ئەوەی وەزارەتی هەندەرانی ئەمریكا لە١٧,١٣ی حوزەیرانی ١٩٧٧دا رایگەیاند كەئەو پشتیوانی لەسازكردنی كودەتا ناكاو ئەگەر كودەتاش كرا رەنگە ئابلۆقەی چەك بەسەر توركیادا بسەپێنرێ[59]. هەروا ئەوەش لەبەرچاو گیرا كەئەگەر كودەتا لەدژی رەفا بەرپا بكرێ رەنگە كودەتاكە لەسەر ئاستی ناوخۆدا كاردانەوەی خراپی هەبێ، بەتایبەتی لەو روانگەیەوە كەرەفا

---

[58]Elu, country Report Turkey, Ist quarter, 1997(London, Elu, January 31, 1997)p-14.

[59] الحياة(العدد ١٢٥٢٤، ١٤ يونيو ١٩٩٧)ص٦.
الحياة (العدد ١٢٥٢٨، ١٨ يونيو ١٩٩٧)ص٨.

وەك گەورەترین حزبی ناو پەرلەمان جەماوەرێتی یەکی زۆرو نزیکەی سێ ملیۆن ئەندامی هەبوو[٦٠].

بەرامبەر بەمە دامەزراوی سوپا لەرێی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی یەوەو بەهاوکاریی دەزگاو حزبە عیلمانی یەکان تینی بۆ ئەربەکان هێناو ئاماژەشی بەوە کرد کەئەگەر ئەربەکان سەر دانەنەوێنێ ناچار پەنا دەبرێتە بەر کودەتا.

کۆبونەوەی رۆژی ٢٨ی شوباتی ١٩٩٧ی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی گوزارشتی لەبێ ئومێدی یەکی زۆر کردو لەو کۆبونەوەیەدا ئەنجومەن بیست داوای خستە بەردەم ئەربەکانەوە لەوانە[٦١]:

١-داخستنی خوێندنگە دینی یە نارەسمی یەکانو زیادکردنی ماوەی خوێندنی تەوژیمی لەپێنج ساڵەوە بۆ هەشت، ئەمەش گورزێکی کاریگەری لەخوێندنگەکانی ئیمامو خەتیبەکانی مزگەوت دەسرەواند کەژمارەیان ٥٥٠ خوێندنگە بوو و ژمارەی خوێندکارەکانی ٥٠٠ هەزار خوێندکار بوو(دەرچوەکانیش وەنەبێ تەنها وەك ئیمامو خەتیب کار بکەن بەڵکو زۆریان لەنێو حزبە راستڕەوە میانڕەوەکاندا شوێنی خۆیان کردبوەوەو پلەو پایەی گرنگیان تێدا بەدەست هێنا بوو، هەندێکیشیان بوو بوونە وەزیر لەحکومەتەکەی ئەربەکانو ٦٧ کەسیان ئەندامی پەرلەمان بوون).

٢-دانانی سنورێك بۆ پشتیوانیی دارایی هەندەران لەرەفا، بەتایبەتی ئەوەی لەرێی رێکخراوی میللی گۆروشەوە پێی دەگەیشتن کەرێکخراوێکی چالاك بوو لەنێو کرێکارە تورکەکانی ئەڵمانیا(دواتریش سوپا داوای کرد بایکۆت بخرێتە سەر کۆمپانیا ئیسلامی یەکان چونکە پشتیوانی لەرەفا دەکەن).

---

[٦٠] الحياة(١٦ مارس ١٩٩٧). ص٨.

[61]Elu, country Report, 2 nd quarter, op-cit Pii.

٣-ڕێ نەدان بەوەرگرتنی ئەوانەی لەبەر چالاکیو پەیوەستی ئیسلامگەرایییان لەسوپا دەردەکرێن، لەدەزگاکانی دەوڵەتدا.

٤-دەرکردنی زیاد لە ١٦٠ ئەفسەری سوپا لەوانەی گومانی ئیسلامگەرایییان لیٚ دەکرێ.

٥-پابەندبونی تەواو بەماددەی ١٧٤ی دەستور کەباسی پرنسیپە بنەڕەتییەکانی کۆماری عیلمانی دەکا.

٦-هەڵوەشاندنەوەی هەر گروپێکی ئیسلامیی چەکداری نارەسمیو تۆمارکردنی هەمو چەکەکانیان[٦٢].

ئەربەکان لەم ڕووەوە یەك هەڵوێستی نەنواند چونکە لەسەرەتادا داواکانی ڕەت کردەوە بەو پێیەی کەئەنجومەنی ئەمنی قەومی بۆی نیە سیاسەتی حکومەت دارێژێو ئەوەی ئەو مافەی هەیە پەرلەمانە نەك ئەنجومەنی ئەمنی قەومی. ئەربەکان لەم ڕووەوە وتی((لێرە دەمەوێ پێ لەسەر ئەو ڕاستییە داگرم کەئەنجومەنی ئەمنی قەومی بۆی نیە داوا لەحکومەت یا لەپەرلەمان بکا فلانو فیسار کار بکا بەتایبەتی کەپەرلەمان ئەو لایەنەیە کەبڕیار لەسەر ئەو شتە دەدا کەدەبێ جێ بەجێ بکرێو حکومەت بەرپرسیارە لەدەسەڵاتی ڕاپەڕاندنو هێزەکەی لەپەرلەمانەوە سەرچاوە دەگرێ هەر پەرلەمانیشە کەبڕیاری هەڵوەشاندنەوەو هەڵنەوەشاندنەوەی دەدا نەك ئەنجومەنی ئەمنی قەومی)). بەڵام دواتر لە ٥ی مارتی ١٩٩٧دا ئەربەکان بۆ خۆ دەربازکردن لەململانێو کێشمەکێش داواکانی قبوڵ کرد.

بەڵام بێباکیی ڕەفا سوپای بێزار کردو بردی بۆ سەر ئەو بۆچونەی کەکردەوەکانی حکومەتی ڕەفا لەو ئاستە نین کە((عیلمانیەت بپارێزن)). ئەمەش لەو سیاسەتەدا دەردەکەوێ کەئەربەکان سەبارەت

---

[٦٢] أبراهيم الداقوقي، مستقبل الحكم في تركيا، مجلة قضايا دولية، العدد ٣٧٥، السنة الثامنة ١٧ مارس ١٩٩٧، ص٢٠.

بەتەنگەبەرکردنی سنوری خوێندنی دینی گرتی‌یە بەر چونکە لەوەتەی ئەربەکان رازی بوو داواکانی سوپا جێبەجێ بکا تەنها ۱۲۰ خوێندنگەی داخست، بگرە لەخۆپیشاندانەکەی رۆژی ۱۱ی مایسی ۱۹۹۷ی ئیستانبول دا کە ۳۰۰هەزار کەس لەئەندامانی حزبەکەی‌و چەند پەرلەمانتارێکی رەفا بەشدارییان تێدا کرد ئەربەکان زۆرتر رۆیی‌و وتی((نابێ خوێندنگەکانی ئیمام‌و خەتیبان دابخرێن))[٦٣]. سوپا بۆ جێبەجێ کردنی هەمو مەرام‌و نیازەکانی، زیاتر تینی بۆ ئەربەکان هێناو لەگوشار خستنە سەر رەفادا سەرکۆمارو حزبە سیاسی‌یەکانیش- بەتایبەتی عیلمانی‌یەکان- دەستیان تێکەڵاو کرد. لەم سەروبەندەدا جەنرالەکان هۆکانی راگەیاندنیان هاندا هێرش بکەنە سەر کۆمپانیا ئیسلامی‌یە گەورەکان‌و ئەوەیان بخەنە پاڵ کە((سەرمایە بۆ بزوتنەوە ئوسولی‌یەکان دەستەبەر دەکەن))[٦٤]. لە٦ی حوزەیرانیش ستادی سوپا داوای لەهەمو یەکەکانی سوپا کرد هیچ شتێك لەکۆمپانیاکانی کەلوپەلی خۆراك‌و ئەلەکتریکی سەر بە((هێزە کۆنەپەرستەکان)) نەکرن[٦٥]. لە١٧ی حوزەیرانیش دادگایەك دەستی بەسەر ١٠٠ ملیۆن دۆلاری سەرمایەی ئەم کۆمپانیایانە گرت گوایە((پشتیوانی‌ی ماددی بۆ چالاکی‌ی ئیسلامی‌یەکان دابین دەکەن))[٦٦]. سوپا بۆ هەڵوەشاندنەوەی پارتی رەفا هانای بۆ داوەری بردو لەمایسی ١٩٩٧دا داوەری گشتی داوای لەدادگای دەستوری کرد پارتی رەفا یاساغ بکا بەو تۆمەتەی کەرەفا دەبێتە مایەی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆو گۆڕینی رژێمی عیلمانی‌ی دەوڵەت‌و بۆ ساغ کردنەوەی ئەم تۆمەتانە ئەوەی کردبوە بەڵگە

[٦٣] رضا هلال، مصدر سابق، ص٧.
[٦٤] الحياة(العدد ١٢٥٢٨، ١٨ يونيو (١٩٩٧) ص٦.
[٦٥] الأهرام(القاهرة،٧ يونيو ١٩٩٧)، ص ٥.
[٦٦] الأهرام(١٨ يونيو ١٩٩٧)، ص ٤.

کەئەربەکان لەچاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ رۆژنامەیەکی میسریدا لەساڵی ١٩٩٤دا تورکیای عیلمانیو ئەتاتورکی دابوە بەر رەخنەو پلار[٦٧].

سلێمان دەمیرێلی سەرکۆماریش ئەربەکانی لەوە وریا کردەوە کەنابێ یاری بەهەستی دینیی گەلی تورکیا بکاو دینو سیاسەت تێکەڵاو بکاتو دین بکاتە پردێك بۆ گەیشتن بەمەرامەکانی خۆی. هەر لەم سەروبەندەشدا داوای لێ کرد رەنگی ئیسلامگەرایی‌ی خیتابە سیاسی‌یەکەی کەم بکاتەوە[٦٨]. دەمیرێل پاش ئەوەی ئەربەکان لە١٨ی حوزەیراندا دەستی لەکار کێشایەوە، داوای لەمەسعود یڵماز کرد حکومەتێك لەبری چیللەر پێکەوە بنێ چونکە ئەربەکانو چیللەر وا رێککەوتبوون کەچیللەر جێی بگرێتەوە. چیللەریش ئەم کارەی بەسوکایەتی کردن بەدیموکراسی دایە قەڵەمو وای لێکدایەوە کەسپاردنی ئەرکی پێکهێنانی حکومەت بەیڵماز کودەتایەکە سەرکۆمار جێ بەجێی دەکا[٦٩].

لەحیزبە سیاسی‌یەکانیش، بێجگە لەحەوت پەرلەمانتاری سەر بەپارتی((یەکێتی‌ی گەورە))(BBP)ی موحسین یازجی ئۆغلۆ کەحیزبێکی ئیسلامی‌ی ناسیۆنالیستە کەس پشتیوانی‌ی لەئەربەکان لەململانێی لەگەڵ سوپادا نەکرد. ئەم پشتیوانی‌یە بۆ ئەربەکان زۆر گرنگ بوو چونکە تا دەهات پەرلەمانتارەکان لەحکومەتەکەیو بەتایبەتی لەپارتی رێی راست(DYP)هەڵدەگەڕانەوە. لەم روەوە بڕوانە خشتەی ژمارە سێ[٧٠].

---

[67]Elu,country Report, 2 nd, op- cit, p-7.

[٦٨] الأهرام(٢٣أبريل ١٩٩٧) ص٥.

[٦٩] الأهرام(٢٢ يونيو ١٩٩٧)ص٤.

[٧٠] سەرچاوەکە وەرگیراوە لە:

-الحياة(العدد (١٢٥٣٢، ٢٢ يونيو ١٩٩٧)، ص٨.

-الأهرام(١٣ يوليو ١٩٩٧)، ص٥.

چۆنێتیی دابەشبونی کورسییەکانی پەرلەمان پێ بەپێی جیابونەوەو هەڵگەڕانەوە لەحزبەکانو بەتایبەتی لەڕێی راست بەردەوام لەگۆڕان دا بوو. ئەوەش بەڵگەیە کەژمارەی کورسییەکانی پارتی ڕێی راست لە۳۰ی حوزەیرانی ۱۹۹۷دا دابەزییە ئاستی ۱۰٤ کورسیو لە۱۲ی تەموزدا بوە ۹۸ کورسی. دەست لەکارکێشانەوەی پەرلەمانتارێکی رەفاش لە۱٥ی تەموزدا ژمارەی کورسییەکانی رەفای کردە ۱٥۳ کورسی. لە۱ی حوزەیرانیش ژمارەی کورسییەکانی پارتی نیشتمانی دایکیش پەرەی سەندو بوە ۱۳۲کورسی، بەرامبەر بە٦۷ کورسی بۆ چەپی دیموکرات، ۱۲ بۆ تورکیای دیموکرات، ٤۹ بۆ گەلی کۆمار، ۲ بۆ میللەتو ۱۷ بۆ بێلایەنەکان.

لە۲۰ی مایسی ۱۹۹۷دا حزبە عیلمانییە بەرهەڵستکارەکان لەیاداشتێکدا بۆ پەرلەمان بەگلەییەکی زۆرەوە داباریـنە سەر حکومەتی رەفا، ئەمەش ڕێی بۆ متمانە لێ سەندنەوەی خۆش کرد[71].

حزبە چەپو راستڕەوە عیلمانییەکانی ناو پەرلەمانیش هەم بەپەیڕەوکردنی هەندێ ڕێوشوێنی دیموکراتی ویستیان حکومەتەکەی ئەربەکان سەرەنگوم بکەن هەم بەڕێوشوێنی نادیموکراتی(وەك پشتیوانی کردن لەسوپا). لەڕێوشێنە پەرلەمانییە دیموکراتییەکان، هەوڵدانی پەرلەمانتارانی ئەو حزبانە بەدرێژاییی دەست بەکاربوونی حکومەتەکە بۆ سەندنەوەی متمانە لەحکومەتەکەی ئەربەکان. لەم بوارەشدا شەش جار یاداشتیان بەرزکردەوەو داوای سەرنگوم کردنی حکومەتەکەیان کرد[72].

زۆربەی تۆمەتەکان لەو دەورو خولە دەسوڕانەوە کەحکومەتو سەرۆکەکەی

---

-محمود السيد الدغيم، الصراع مع أربكان على المسرح السياسي التركي، الحياة(العدد ۲٥٤٦، ٦يوليو، ۱۹۹۷)، ص۱۸

الأهرام(۱٦ يوليو ۱۹۹۷)ص٤.

[71] الحياة(۳۱مايو، ۱۹۹۷)ص۱.

[72] فهمي هويدي" الحكومة الخفية في تركيا" الأهرام(۲۰ مايو ۱۹۹۷)ص ۱۸.

توركیایان بەسەر عیلمانیو ئیسلامی دابەش کردوە. بنەما عیلمانییەکانی دەوڵـەتیان رمـاندوەو لەریفۆرمـە رۆژئاواییـیـە مۆدێرنـەکانی پەشـــیمان بونەتەوە.

ئەو حزبانە چەند جارێك هەوڵیاندا حکومەتێك بەبێ بەشداربونی رەفــا پێکەوە بنێن(وەك هەوڵەکـەی پۆلـەند ئیجڤیـدی سـەرۆکی پـارتی چـەپی دیموکرات لە٢٩ی نیسانی ١٩٩٧دا بــۆ دامــەزراندنی حکومــەتێکی نـوێ لەگەڵ حزبەکانی ترو بەتایبەتی لەگەڵ مەسعود یلمازدا)[٧٣].

رێوشوێنە نادیموکراتییەکانیش بریتی بون لەهاندانی سوپا بۆ ملکــەچ کردنی ئەربەکانو ناچارکردنی بۆ جێبەجێ کردنی خواستەکانی دامەزراوی سوپا بەرادەیەك کەئەو حزبانە بەیاننامەکەی رۆژی ٢٨ی شوباتی ١٩٩٧یان بەسەرکەوتنی دیموکراسی دایە قەڵەم[٧٤]. حزبەکان لەمەش دورتـر رۆیشـتنو بۆلەند ئیجڤید لە٢٥ی نیساندا داوای لەکارخستنی حکومەتی ئەربــەکانو هاتنە سەر کاری ئەنجومـەنی ئاسایشـــی نەتــەوەییی کرد[٧٥]. دەردی جـەنرال فەیزی تورکیری واتەنی جـــۆش سـەندنی سیاسـەتەکانو پـەرە ئەسـتاندنی هەرەشەو گورەشەکانو زیادبونی گرژی خەریك بوو وڵات بەرەو راپــەرینێکی جـەماوەری بـەریێو قازانجـە ســـەرەکییەکانی کۆمـــاری تورکیـــا بخاتـــە مـەترسییەوە. ئیـتر بـەبیانوی رزگـارکردنی وڵات لەپاشـاگەردانی، گوشـار خرایە سەر ئەربەکان تا دەست لەکار بکشێتەوە، ئەویش لە١٨ی حوزەیرانـی ١٩٩٧دا دەستی لەکار کێشایەوە.

---

[٧٣] الحياة(٢٠ أبريل١٩٩٧)، ص ص ٦،١.

[٧٤] فهمي هويدي، قضية العلمانية في تركيا، الأهرام(١١ مارس ١٩٩٧)، ص١١

[٧٥] رضا هلال، "التانجو الاخير لاربكان" الأهرام(٣٠ أبريل ١٩٩٧)، ص٤.

چەندین گوشارو فشاری نێودەوڵەتی‌و ئیقلیمـــی‌ی بـەهێز هەیـە کەســازش کردن لەگەڵیاندا پێویستی بەهەوڵ‌و تەقەللای هەمو لایەك هەیە.

هەر چی چاودێریی گۆڕەپانی دیموکراتی‌ی تورکیا بکا دەم‌و دەســت درك بەوە دەکا کەئەم گۆڕەپانە بڕێکی باش سەرکەوتنی بەدەست هێناوەو گەشەی بەخۆوە دیوەو ئەمەش بۆتە هۆی لەخۆ گرتنـی یـەکێ لەگرفتـە گـەورەکان بـــەمانا کـــەلتوری‌و سیاســـییەکەی لـــەچوارچێوەی داب‌و نەریتـــەکانی دیموکراسی‌و فرە حزبایەتی‌دا.

کەس گومانی لەوە نیە کـە گۆڕەپـانی دیموکراتـی‌ی تورکیـا چـەندەها کەموکوڕی‌ی تێکەوتوەو ئێستاش لەو جۆرە کەموکوڕی‌یـــەی تێدایـە بـەڵام کەس نکۆڵی لەوە ناکا کەلایەنەکانی سـەر گۆڕەپـانی سیاسـی لـەتوانایان دایە کەچارەسەری ئەو کەموکوڕی‌یانــە بکـەن‌و بەشـێکی زۆریشـی بکـەن بەهۆکارێك بۆ بـــەهێزکردنی پانتـایی‌ی دیموکراسـی. ئەمـەش بـەخۆڕایی‌و بەهەوەنتە نایەتە دی بەڵکو پاش ئەوە دێتە دی کەلایەنەکانی هاوکێشـەکە یاخود لایەنـەکانی ململانێکـە بـاش لەیـەکتری بگـەن چونکـە بەشـێکی هۆکانی شکستی دیموکراسی ناچێتەوە سەر چەند هۆکـارێکی دەرەکـی وەك هـەندێ وای لێ تێگەیشـتون بـەڵکو بەشـێکی زۆری هـۆی ئـەم شکســتە دەگەڕێتەوە بـۆ دیـدی تـەمومژی لاکـانی هاوکێشـەکە. مـن وا تێدەگـەم پرۆسەی راست کردنەوەی رێچکەی دیموکراسی بەڕاست کردنەوەی دیدی هەر لایەك بۆ ئەوەی تر دەست پێ دەکاو ئیتر لێرە بەدواوە دەبــێ پرۆســەیەك بـۆ بەخۆداچونەوەو رەخنەگرتن لەهەنگاوەکانی پێشوی هەر لایەك بەجیا، بێتـە ئاراوە، ئەویش لەهەوڵدانێکدا بۆ دەستنیشان کردنـــی شـوێنەکانی هەڵـەو شوێنەکانی راستی.

# پێرست